ناوی کتێب : مرۆڤ وژیان

نوسینی : کاروان سلێمان کاکەمەد

بابەت : لێکۆڵینەوە

بەرگ : یەکەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٦٧٣)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە.

## هێماکورتکراوەکان

چ : چاپ

م : میلاد

ك : کۆچی

و : وەرگێڕان

# پێشەکی

سەرەتا سوپاسی خوای پەروەردگاردەکەم کەدەرفەتیدام بۆنوسینی ئەم پەرتووکە ئامانج لەنوسینی ئەم پەرتووکە پێشکەشکردنی زانیاری ژیانە بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی زانیارییەکان٠باسەکەم (دە) بەشی لەخۆوەگرتووە لەهەمووبوارەکان ، بەبەکارهێنانی سە دان سەرچاوەی جۆراوجۆری ئاینی وئابوری وکۆمەلآیەتی وفەلسە فی و٠٠٠هتد٠هەروەهاچەندین نامەی ماستەرودکتۆرا ، لەکۆتاییدا هەر کەموکورٍ ییەکم هەبێ یاخود هەڵەیەکم کردبێ هیوادارم لێم ببورن ، چونکە نوسین لەسەرهەربابەتێك بێ کەمو کورِی نابێ ، وە زۆرسوپاسی کارمەندانی کتێبخانەی گشتی هەولێردەکەم ، کەزۆریارمە تییاندام بۆبەدە دەستهێنانی سەرچاوە٠

کاروان سلێمان کاکەمەد

## بەشی یەکەم

### ژیان چییە ؟

ئەگەربپرسین ژیان چییە؟پێویستەوەلامی ڕاست بدەینەوە،هەموو مرۆڤێك پێویستە بزانێت ژیان چییە؟ بۆچی دەژیت؟بۆچی هەوڵدەدات بۆی؟ئێمەی مرۆڤ کێین وچین وبۆچی دەژین؟بۆچی هاتووینە تە ئەم ژ یانە ؟

ژیان:بریتییەلەوساتەوەختەی،کەمرۆڤ تێیداهەناسەدەدات وژیان دەباتە سەر۰ژیان ڕۆژەلەدوای شەو، شەوە لەدوای ڕۆژهەناسەیەلەدوای هەناسە،ساغی ونەخۆشییە،هەژاری ودەوڵەمەندییە،گریان وپێکەنینە،بەختە وەری وبەدبەختییە،دڵخۆشی ودلگرانییە ، نەخۆشکە وتن وچاکبوونەوەیە،۰۰۰ هتد۰

### جۆری ژیان :

ئەم چەمکەلەبنەڕەتداهەمووبوارەکانی ژیان دەگرێتەوە ، کەلەمانای ژیان نزیك دەبێتەوە ئەوچەمکەش هەمووزاناوفەیلە سوفەکان لەسەر دەمێکی زۆرکۆنەوە بەدوایداوێڵن ، (جەوهەرغەمگین)ی شاعیردەڵێ :

خۆشی دەڕۆیشت بەدوای کاروان

کاروانی جەرگەی تێکۆشان

تێکۆشانی خۆشی ژیان

واتا ئەومرۆڤەی کەلەگەڕاندایە بەدوای ڕزگاربوون لەدەست خەمباری وهێنانەدی ژیانێکی بەختەوەر ، ئەم وشانەی (جەوهەرغەمگین)دەمانباتە ناوقولایی فەلسەفەی ژیانی مرۆڤ ، ئەوەشمان دێنێتەوەیاد چۆن مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێی گەڕان وهەوڵدان بناغەی ژیانی خۆی بچەسپێنێ ، هەروەك شێخ نوری شێخ سالح (١٨٩٦ — ١٩٥٨) دەڵێ :

لەناوشەپۆڵی خەما سەرنگوون وبێئارام

بەکێوی سەختی ژیانا بەپێ بەچنگە ڕنێ

"مناحم بێگشیت" ، دەڵێ : ((من دەجەنگم کەواتە هەم))۰ هەریەکەبەجۆرێك لەژیان تێدەگات وبەپێی باری سەرنجی خۆی بۆی دەچێت ، ژیان ڕێگایەکی پڕکەندوکۆسپ ودێوودرەنجە ، دەبێ بۆبڕینی زۆردڵ قایم بی ونابێ مرۆڤ بۆبڕینی ئەم ڕێگایە سڵ بکاتەوە ، واتا ژیان بریتییە لەتێکۆشان بۆبڕینی ڕێگایەکی پڕئاڵۆزوتەم ومژبۆ گەیشتن بەکامەرانی ومەبەست۰یەکێ لەماناسەرەکییەکانی جۆری ژیان بەختەوەرییە ، بۆئەوەی مرۆڤ بەختەوەر بێت لەسەری پێو یستە بەدوای خۆشی دا بگەڕێت۰ ئایابەختەوەری چییە ؟

ناصری سوبحانی دەڵێ : (بەختەوەری بریتییە لەدووشت : خەفەتت نەبێ ، ترست نەبێ ، ئەگەرئینسان نەخەفەتی هەبوو ، نەترس ئە وەئینسانێکی بەختەوەرە ، نەبوونی ئەوە دەبێتەبەدبەختی)٠لەتو ێژینەوەیەکدا کەقوتابی ماستەر (تواناعوسمان محمدامین) لەبە شی کۆمەڵناسی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین لەساڵی(٢٠١٧)بە ناونیشانی (ڕۆڵی بەهاکۆمەلأیەتییەکان لەڕێکخستنی کۆمە لگا)ئەنجا می داوە لەبارەی تێڕوانین بۆژیان ، ڕێژەی( ٥, ٥٨٪ ) ی نموونەی تو ێژینەوەکە ئاسوودەبوون لەژیان تاکەئامانجی ئەوانە ، ڕێژەی( ١, ٨٪) تەنها لەگەڵ ڕۆژگاردا دەڕۆن ودەژین وهیچی تر،ڕێژەی( ٣ ,١٣٪ ) جگەلەئاسوودەبوون هەوڵی بەدەستهێنانی پلەوپۆستیش دەدەن ، بەلأم زۆرینەی ئەندامانی نموونەی توێژینەوەکە ئاسوودەبوون لەژیان تاکە ئامانجی ئەوانە٠

ئایاپارەڕۆڵی هەیەلەبەختەوەری؟

تاڕاددەیەك بەڵێ ، زۆرجارپارەدەوری سەرەکی هەبووەلەچارەسەرکردنی گیروگرفتەکان وچارەسەری زۆرکێشەی کردووە ، بەلأم ئەگەرپارەهەبوومانای وانییەهیچ گیروگرفتێکت نابێ ، بەڵکوتەبایی ولێك حالیبوون وگونجان لەگەڵ یەکتری زۆرلەبواری پارەدەوری زیاترەلەهەندێ کاتدابەلأم ئەگەرپارەنەبێت خێزان توشی کێشەدەبێت،وەزۆرکێشەهەیەبەپارەکۆتاییپێدێ، بەلأم پارەش هەمووشتێك نییەپارەتەنیاوەسیلەی ژیانە٠هەروەهائەگەرپیاونەتوانێت هەڵسێت بەدابینکردنی هاوسەرومنداڵەکانی کێشەی زۆرلەنێوخێزاندادروستدەبێت ، چونکەپیاوناتوانێت زۆربەی پێداویستییەکانی ماڵ ومنداڵی دابین بکات بۆیەبەردەوام شەڕوناخۆشی سەرهەڵدەدات بەتایبەتی هەندێ لەژنان پێداویستییان زۆرەولەتوانای هاوسەرەکانیان زیاترە ژنیش ڕەچاوی باری ئابوری هاوسەرەکەی ناکات ، لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە چەندین حالەتی جیابوونەوەلەئەنجامی دەستکورتی ڕوویانداوە٠ئاشکرایەخوێندن پێویستی بەجێگەوڕێگەیەکی گونجاوولەبارهەیەبۆسەعیکردن ئەوخێزانانەی کرێچین لەبەرئەوەی لەشوێنێکەوەبۆشوێنێکی تردەگوازنەوە زۆرجارلەگەڵ شوێنگۆڕین پێویستدەکات منداڵ لەقوتابخانەیەکەوە بۆقوتابخانەیەکی تربگوازێتەوە ئەم حالەتەش فشارێکی دەروونی لای قوتابی دروستدەکات کەدەبێت لەگەڵ قوتابخانەی نوێ وهاوڕێی نوێداخۆی بگونجێنێت ، هەروەهازۆربەی جارمنداڵ شوێنێك یان ژورێکی دەستناکەوێت تاکوبەهێمنی بخوێنێت ئەمەش زۆرجاردەبێت بەگارەگارلەنێوان ئەندامانی خێزاندابەتایبەتی کاتێك قوتابی دوازدەی ئامادەیی بێت یان تاقیکردنەوەی هەبێت کەبێگومان پێویستییان بەژووری تایبەت هەیەبۆخوێندن لەوانەیەخێزانەکەش دووژووریان هەبێت ، هەروەهازۆربەی ئەوخانوانەی بچوکن منداڵ دەچێتەکۆلأن لەماڵەوەگیرنابن ئەمەکاریگەرییەکی زۆری لەسەرمنداڵ هەیەلەوانەیەببێتەهۆی ئەوەی لەسەعیکردن دووربکەوێتەوتەمبەڵ ببێت ونەتوانێت لەخوێندنەکەی سەرکەوتوببێت ، بەلأم زۆرمنداڵیش هەیەلەگەڵ ئەوواقیعەسەختەی هەیانەسووڕن لەسەرتەواوکردنی خوێندنوبەدەستهێنانی نمرەی بەرزیش٠هەروەهائەولاوانەی کاتێك ژیانی هاوسەری پێکدەهێنن ودەچنەخانووی کرێوە ژیانێکی ناخۆش

بەسەرنابەن بەتایبەتی کاتێك کەداهاتی کەم بێ ؟ هەروەهائایاگرانی وخەرجییەزۆرەکانی هاوسەرگیری هۆکارێك نییەبۆدواکەوتنی پرۆسەی هاوسەرگیری ونابێتەهۆی ئەوەی گەنج لەموعانات بژی ؟ هەروەهاهەژاریش زۆرجارنامۆبوونی کۆمەلأیەتی لێدەکەوێتەوە، لەم بارەیەوەپێشەواعەلی (خوای لێ رازیبێ)دەلێ : ((دەولەمەندلەدەرەوەی ولأتیش بژی ئەواوەکوئەوەوایەلەنیشتیمانەکەی خۆی دابێت ، بەلأم فەقیرئەگەرلەنێوکۆمەلگەکەی خۆشی دابژی ئەواهەست بەغەریبی دەکات لەوکۆمەلگایە))٠

ئایائیمان کاریگەری لەسەربەختەوەری هەیە ؟

توێژینەوەکان سەلماندوویانەکەئیمان کاریگەری قولی خۆی هەیەلەئارامی ودلنیایی دەرووندا ، کەسی باوەرداربرِوای هەیەبەقەزاوقەدەرهەرنارەحەتییەك کەتوشی مرۆڤ دەبێت دەبێتەهۆی سرِینەوەی تاوانەکانی یاخودپلەی لەژیانی رِۆژی دوایی بەرزدەکاتەوە٠ئەگەرسەیرێکی ولأتانی جیهان بکەین لەرِووی دلخۆشی تاکەکانیان لەرِووی مادییەوەلەئاستێکی خۆشگوزەرانی بەرزدەژین هیچ ترسی هەژاری یان بێکارییان نییە دەولەت بۆتەزامنی هەرتاکێك بەلأم رِێژەی خۆکوشتن لەئاستێکی بەرزدایە٠

مرۆڤ وهیوا :

هیوابریتییەلەوەی تاك ئارەزوودەکات وهەولْ وکۆششی بۆدەکات تاپێی بگات٠بۆنموونە هەموودایك وباوکێك بەهیوای ئەوەن تاخۆیان لەژیان ماون کورِوکچەکانیان ببینن مالی خۆیان هەبێ ودابمەزرێن٠بازرگانێك هیوای قازانجی هەیە،نەخۆشێك بەهیوای چاکبوونەوەیە٠بوونی هەرمرۆڤێك لەژیاندا بەندە بەوهیوایانەی لەناخی داهەیە ، هەمووهیوایەکیش هەولْ وماندووبوونی دەوێ تابگاتە ئەنجام٠ (دیل کارنجی)،دەلێت: (بێچارەترین مرۆڤ لەسەرزەوی،ئەومرۆڤەیە کەهیوایەك لەناخی دابیناناکات ، چونکەئامانجەکان لەهیواکانەوەرِە گەدادەکوتێت )٠ئومێدوبەهیوابوون بۆژیانی مرۆڤ بەئەندازەی بالْ بۆبالندەگرینگی هەیە٠

عەبدولأی کورِی مەسعود ، دەلێ : (جارێکیان پێخەمبەر(دروودی خو ای لەسەربێ) خەتێکی چوارگۆشەی کێشا ، لەناوخەتەچوارگۆشەکەدا خەتێکی تری درێژی کێشا تا دەرەوە ، ئینجالەدیوی ناوەوەچەندخە تێکی وردەلەی لەتەنیشت خەتەکەی ناوچوارگۆشەکەوەکێشا ، ئەوجا فەرمووی : ئەمەوێنەی مرۆڤ وئاکام وهیوایەتی ، ئەم خەتەی کەواله ناوخەتەچوارگۆشەکەوخەتەوردەکانی لەسەرە ، ئەمەیان وێنەی ئادە میزادە ئائەم خەتەچوارگۆشەشیان وێنەی ئاکامەکەیەتی ، ئەو ەتاله هەرچوارلاوە ئابلوقە دراوە ئەم خەتەشیان کەدەرچووە دەرەوە هیوا یەکەیەتی ، ئەم خەتەوردیلانەش دەردوبەلأومەینەتن ، گریمان لە هەندێ لەم دەردوئازارانەش قوتاری بوو ، لەهەندێکی تریان قوتار ی نابێ ، سەرەنجام پێش ئەوەی بگا بەئاواتی خۆی یەکێ لەم دەردوبەلأ یانە وەك ماردەیگەزن)ئیمامی بوخاری وترمزی رِیوایەتیان کردووە٠

ئایاتەمەن درێژدەبێت ؟

دکتۆر (ڤیبەر) ، لەسالی (١٩٠٢) لەگۆڤارێکی پزیشکی بەرِیتانی وتار ێکی بلأوکردەوە تیایدا رِوانگەی خۆی لەبارەی ژیانێکی درێژخستەرِو و وتی : (لەخواردن مامناوەندی بە ، رِۆژانە وەرزش بکە، زۆرزووبخە وە ،

ڕۆژانەخۆت بشۆ،گرینگی بەتەندروستیتبدە ، لەخواردنەوە کهولییەکان خۆت بەدووربگرە٠)هەروەهاپزیشك (ئۆڵدفێڵد) ، دەڵێ :(ئەگەردەتەوێت تەمەن درێژبیت وژیانێکی پڕلەشادومانی بژیت : پێویستە گۆشت نەخۆیت ، سەوزەومیوەزۆربخۆیت ، کەم ئاوات بیت ،چاولەپیاوچاکان بکەیت ، شت نەگریتەدڵ ، دڵسۆزبیت بۆکەسانی تروتادەتوانی بۆیان چاك بیت٠) تەمەن درێژی ئاواتی هەموومرۆڤێکە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ( ئادەمیزاد پیردە بێت کەچی دووشت تێیدا هەرگەنجە : پەرۆشی بۆماڵ وسامان ، پەرۆشی تەمەن درێژی)٠

تەمەنی هەندێك بەنموونە :

حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێ بێ) : (٩٥٠) ساڵ ( نوح لەنەوەی ئیدریسە ، ئیدریس لەنەوەی شیت کوڕی ئادەمە )٠ ارفخشد کوڕی سام کوڕی نوح (٤٦٥) ساڵ٠ شالخ کوڕی ارفخشد (٤٣٠)ساڵ٠ عابرکوڕی شالخ (٣٤٠)ساڵ٠ فالخ کوڕی عابر(٢٣٠)ساڵ٠ رعدکوڕی فالخ (٢٠٠) ساڵ ساروخ کوڕی رعد (٢٣٠) ساڵ٠ ناحورکوڕی ساروخ (١٤٦) ساڵ٠ تارخ (ئازەر) کوڕی ناحور(٢٦٠)ساڵ٠ ئیبراهیم (علیه السلام) کوڕی ئازەر (١٩٥)ساڵ٠ ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم (علیه السلام) (١٨٥)ساڵ٠ ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم (علیه السلام) (١٣٧)ساڵ٠ یەعقوب کوڕی ئیسحاق (علیه السلام) (١٤٠)ساڵ ژیاوە٠(بڕوانە:مروج الذهب)بەلاّم لەڕۆژگاری پێخەمبەرمان (درودی خوای لەسەربێ) ڕێژەی تەمەن کەم بووە ، چونکە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (لەئێستاوە تاسەری سەدساڵ ئەوچینەی کەئێستا هەیە هیچ کەسێکی نامینێ ) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە٠ ئادەمیزاد لاشەشی گۆڕاوەو بچووك بۆتەوە ، شوێنەواری هەندێك مرۆڤ دۆزراوەتەوەکەپەیکەری ئێسکیان (٣)سێ مەتربووە ، لەسە حیحی بوخاری داهاتووە کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ( ئادەم کاتێك دروستکرا درێژییەکەی شەستباڵ بوو ، تائێستاشی لەگەڵدابێت درێژی مرۆڤ لەکورتی دایە)٠ هەروەها لەئەنجامی دۆزینەوەی پاشماوەی بەبەردبووی گیانداری سەردەمەجیاوازەکان دەرکەوتووە کەزیندەوەرەکان گەورەتربوون (کاتێك گیاندارێك دەمرێت بەشەگۆشتەکەی زوو لەناودوچێت ، بەلاّم ئێسکەکانی بۆماوەیەکی زۆردەمێننەوە دەبن بەبەرد) ، (جەواهیرلەعل نەهرۆ) لەکتێبەکەی دا : (وانەکانی باوکێك بۆ کچەکەی) دەڵێ : (لەمۆزەخانەی لەندەن چەندگیاندارێکی گەورەمان بینی ، کە درێژی یەکێکیان (١٠ بۆ ١٢) مەتردەبوو ، هەروەها بۆق و کیسەڵێکی کۆنیشمان بینی کەلەمرۆڤ گەورەتربوون ، تەنانەت گیاندا رەکانی سەردەمی کۆن زۆرلەگیاندارەکانی ئێستاگەورەتربوون ، ئەمە ش لەوێنەی خشۆك و گیاندارەبەبەردبووە کان دەردەکەوێت) وە تە مەنی مرۆڤ لەچاوگەلێ لەگیانلەبەران زۆرکەمە بەنموونە:کەرکەدەن:(٧٠٠)ساڵ٠ نەهەنگ : (١٠٠٠)ساڵ٠ قەلەڕەشکە : (١٥٠)ساڵ٠ بەلاّم ئەو پەڕی تەمەنی مرۆڤ گەیشتبێتێ کەتۆمارکرابێ لەیەکێتی سۆڤیە تی پێشوو(ڕوسیا) (١٥٠) ساڵ بوو ، وەتێکڕای تەمەنی ئافرەت نزیکەی( ٧- ١٢ )ساڵ لەپیاوزیاترە٠(بڕوانە : مەسعودعەبدولخالق ، ئافرەت لە ڕوانگەی عەلمانی وئاینییەوە)٠بۆنموونە : لەئەسیوپیا(حەبەشە) تێکڕای تەمەنی ئافرەت (٥٣)ساڵەوپیاو(٥٠) ساڵە ، لەئیسپانیا

ئافرەت (٨٦)ساڵ وپیاو(٧٢)ساڵە ، لەفینلەندا ئافرە ت (٨٦ ) ساڵ وپیاو(٧٢)ساڵە ، لەدانیمارك ئافرەت (٧٨)ساڵ وپیاو (٧٢) ساڵە ، لەقەتەڕ ئافرەت (٧٤ ) ساڵ وپیاو (٦٩ ) ساڵە ، لەکەنەدا ئافرە ت (٨١ ) ساڵ وپیاو (٧٤) ساڵە ، لەنەرویج ئافرەت (٨١) ساڵ وپیاو (٧٤) ساڵە ، لەتونس ئافرەت (٧٥) ساڵ وپیاو (٧١) ساڵە٠ژنان بەبەراوردلەگەڵ پیاوان تەمەنیان درێژترە ، ئەوەش پەیوەندی بەکارکرنی ماڵەوەهەیە٠لێکۆڵەر"ئەلبرت" لەئاژانسیتەندروستیبەرشەلۆنەلێکۆڵینەوەیەکیلەساڵانی(١٩٨٣)بۆ(٢٠٠٦)ئەنجامداوەتیایدائاشکرایکردووەژنان زیاتردەچنەناوتەمەنەوە ، ئەمەش بەهۆی ئەوئیش وکارانەیەکەژنان ڕۆژانەلەماڵ ودەرەوەی ماڵ ئەنجامی دەدەن٠هەیانەهۆکاری تە مەن درێژی گەڕاندۆتەوە بۆخواردن ، وەرزشکردن ٠٠٠ هتد ، هەشیا نە گەڕاندوویەتییەوە بۆ(ئیمان) خواش زاناترە ، وە وتراوە هۆکاری تەمەن درێژی لای ژاپۆنییەکان بەهۆی سیستەمی خۆراکیانە ، ئەوا نەی هۆکاری تەمەن درێژییان گەڕاندۆتەوە بۆ مە سەلەی ئیمان ، بەڵگەیان ئەوئایەتەیە : (اولم نعمركم مايتذكرفيه من تذكروجاء كم النذيرفذوقوافماللظلمين من نصير)٠

واتا : (ئایا ئەوەندە تەمەننمان پێنە بەخشین ئەوەی بیەوێت بیربکاتە وە تیایدا ؟ بێدارکەرەوە شتان بۆنەهات ؟ دەبچێژن سزای سەختی د ۆزەخ ، چونکە ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نییە ) فاطر: ٣٧

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (لايرد القدرالا الدعاءولايزيدفي‌العمرالاالبر) واتا : (هیچ شتێك ڕەتی قەزاوقەدەرنا کاتەوە دوعا نەبێ ، وەهیچ شتێك تەمەن درێژناکات چاکەکردن نە بێت) وە(ئەنەس) (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ : (خزمەتی پێخەمبەرم کرد(درودی خوای لەسەربێ) هەشت ساڵ ، پێمی فەرموو : ئەی ئە نەس دەست نوێژەکەت باش بشۆ تەمەنت زیاددەبێت وەبەهەرکەس گەیشتی لەئوممەتەکەم سەلامی لێبکە چاکەوخێرەکانت زۆردەبێت ، وەهەرکاتێ چویتەناوماڵی خۆتەوەسەلام بکەلەخانەوادەوخێزانت خێری ماڵەکەت زیاددەبێت) تەبەڕانی ڕیوایەتی کردووە٠

(ئەبودەرداء) ، دەڵێ : (باسی تەمەن درێژبوونمان دەکردلەخزمەت پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ، ئەویش فەرمووی : کەس لەوا دەی خۆی دواناکەوێت ، وەتەمەن درێژبوون ئەوەیە وەچەی چاك وپاك بدات بەیەکێ لەبەندەکانی ، ئەوانیش بۆی بپاڕێنەوە ، پاداشتی ئەوەی بۆبچێتەقەبرەکەی) ٠

جائایاتەمەنی کەم دەگۆڕێت بەتەمەنێکی زۆر؟

شەوی قەدرهەرچەندە لەخۆی دا یەك شەوە، بەڵام خێری لە هەزار مانگ زیاترە واتاهەشتاوئەوەندەساڵە،هەروەهاپێخەمبەر(درودی خوا ی لەسەربێ) فەرموویەتی :(ئەوکەسەی سوڕەتی (زەلزەلە) دەخوینێ پاداشتی نیوەی قورئانی بۆهەیە، ئەوەش کەسوڕەتی (قل ياايهاالكافر ون) دەخوێنێت پاداشتی چوا ریەکی قورئانی بۆدەنوسرێت ئەمەش فراوانبوونی کاتە ، هەروەهافەرموویەتی :(یەك نوێژلەمزگەوتی من بەرامبەرهەزارنوێژەلەشوێنێکی تربکرێت)ئەمەش ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لەگێڕانەوەیەکی تردا یەك نوێژلەمزگەوتی کەعبە بەرامبەرسەدهەزارنوێژە ) هەروەهافەرموویەتی:(یەك نوێژلە (بيت المقدس) بەرامبەرپێنج سەدنوێژە) هەروەهافەرموویەتی : (یەك نو ێژلەمزگەوتی

قوبابەرامبەریەك عومرەیە) ترمذی ڕیوایەتی کردوو ە (مزگەوتی قوبا کەوتۆتەخوارووی خۆرئاوای مەدینە ، یەکەم مزگە وت بووەلەمەدینە بنیات نراوە) ، جاهەروەکوچۆن چاکەتەمەن درێژ دەکاتەوە،تاوانیش تەمەن کورت دەکاتەوە، خەڵکی لەبارەی زیادوکەم کردنی تەمەن ناکۆك و جودان دەستەیەك پێیان وا یەکەمبوونەوەی تەمەنی تاوا نکاروااتانەمانی پیت وبەرەکەت لەتەمەنیدا ، بەلاْم دە ستەکەی تردەڵێن بەڕاستی تەمەن کەم دەکات ، هەروەکوچۆن ڕزق کەم دەکات هەروەهادەڵێن ئەمە پێچەوانەی دیاریکردنی تە مەن و ئەجەل نییە ، چونکەخوای گەورە تەندروستی وهەژاری ودەوڵەمە ندی، هەمووئەمانەی پەیوەست کردووە بەهۆکارە کانەوە تاوانیش هۆکاری کورتکردنەوەی تەمەنە ، هەروەها تەمەن درێژیش بەزۆری مانگ وساڵەوەنییە جاکەسی واهەیە سەدساڵ لەم دنیایە ژیاوە، بەلاْم تەمەنی ڕاستی خۆی لە ساڵێك تێپەڕناکات ، چونکەهەمووژیانی خۆ ی بەخواردن وخواردنەوە بەسەربردووەوهیچ کردەوەیەکی بەکەڵکی تیانەکردووە هەروەکوچۆن هەیەسەروەت وسامانی زۆرە بەلاْم ساما نی ڕاستی خۆی لەچەندديناریێك تێپەڕناکات کەلەپێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەبەخشیبێتی٠ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەر موویەتی :(چاکترین کەس لەئێوەئەوکەسەیەکەتەمەنی درێژبیت وکارەکانیشی چاك بێت ، خراپترین کەسیش لەئێوەئەوکەسەیەکەتە مەنی درێژبێت وکارەکانیشی خراپ بێت)٠هەروەهاپێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : (هەرگەنجێ ڕێزی لەپیرێ گرت پەروە ردگارلاوێکی بۆپەیدادەکات تالەسەردەمی پیری داڕێزی بگرێ) ، ئەمە شیان بەبەڵگەی تەمەن درێژبوون لێکداوەتەوە کەدەگاتە تەمەنی پیر ی تاپاداشتی کردەوەکەی بدرێتێ ، چونکەئەوەی نەگاتە تەمەنی پیر ی دەبێ زووبمرێ٠

لەبارەی سەراسەری زەمان لەسەرەتا تاکۆتا یی خەڵك لەوبارەیەوە بەجیاوازی قسەیان کردووە، (ئیبن عەبباس) لەگێڕانەوەیەکداکە (سەعیدکوڕی جوبەیر) لە (ئیبن عەبباس) ی گێڕاوەتەوە وتویەتی: (حەوت هەزارساڵە)، (وەهەب کوڕی مونەببە ە)وتویەتی: (درێژایی زەمان شەش هەزارساڵە)(بڕوانە : تەواوی مێژوو، بەرگی یەکەم)(یوم عندربك کاالف سنة مماتعدون)الحج : ٤٧

ئەندازە گیری مانەوەی تەنیا بەحیسابی ئەوڕۆژانەی کە خودای تەعالا ئاسمان وزەوی دروستکردووە واتا شەش ڕۆژ ، هەرڕۆژەوهەزا رساڵە ، تەبەریش لەم بارەیەوە حەدیسێکی لە (ئیبن عەبباس) گێڕاوەتەوە :(دنیاهەینی یەکە لەڕۆژەکانی هەینی قیامەت)بەم پێیە ماوەی دنیا واتا حەوت ڕۆژ، هەرڕۆژەوهەزارساڵە ، واتاحەوت هەزار ساڵ وەلە (وەهەب کوڕی مونەببەه)ەوە ڕیوایەت کراوە کەماوەی دنیا بەرلەئیسلام (٥٦٠٠)پێنج هەزاروشەش سەد ساڵە٠ (عەبدوڵای کوڕی عەبباس) ، وتویەتی : (کان بین ادم ونوح عشرة قرون کلهم علی شریعة من الحق) واتا : (لەنێوان ئادەم ونوح (١٠)دە سەدەبووە ، خەڵکی ئەودەسەدەیەهەموویان لەسەرشەریعەتی یەکخوا پەرستی بوون)٠خەیام لەبارەی تەمەن درێژبوون دەڵێ :

ڕۆژی وتەمەنت پتربکەی ناتوانی

بۆزۆروکەمیش پەرۆش وسەرگەردانی

واتا : تەمەن زیادناکات وناتوانیت زیادی بکەی،کەچی بۆوەدەستهێنانی زۆری مولك وسامانیش بەپەرۆشی٠

**ئایادرەختەکان زیندوون ؟**

درەختەکان زیندوون ، چونکەگەشەدەکەن وئاودەخۆنەوەوهەناسەدە دەن ولەناودەچن٠جیاوازی نێوان درەخت وئاژەڵێك ئەوەیە ، ئاژەڵ د ەجو لێتەوە ، بەلأم درەخت توانای جوولەی نییە٠ (جەواهیرلەعل نە هرۆ) ، لەکتێبەکەی دا :(وانەکانی باوکێك بۆکچەکەی) دەڵێ : ( لەبا خچەی گوڵ وگیای لەندەن ژمارەیەك گیاهەیە ، کەبەگیاڕاوچییەکان ناسراون ئەم جۆرە گیایە کاتێك مێشێك لەسەرگەلأکانی دادەنیشێ ، ئەوا مێشەکە ڕاودەکات ودەیخوات)٠گژوگیاودرەخت کەگیانیان تێدایەیانی ئەوەی کەگیاگەشەبکات وزۆربێت وزیادبێت٠زانستی نوێ سەلماندوویەتی کەواڕووەکیش هەستی هەیەئاوازومۆسیقاکاری تێدەکات ئاودێری وخزمەت کردن گەشی دەکاتەوە٠

**سوودەکانی دارودرەخت :**

**١ – جوانی :**

ئەگەربێت وشەقامەکان هەمووبەدرەخت بڕازێنرێتەوە ، وێنەیەکی‌جوان وەردەگرێ٠

**٢ – فێنکی :**

دارودرەخت دەبێتەهۆی فێنکی وپلەی گەرمانزم دەکاتەوە ودەبێتەپەرژین بۆهەوای گەرم یان ڕەشەبا٠

**٣ – ئابووری :**

جگەلەوەی کەهیچ درەختێك بێسوودنییە ، بەلأم ئەودرەختانەی بەردارن دیارەکەسوودیان زیاترە٠

**٤ – تەندروستی :**

دارودرەخت وەکوکارگەیەك وایە بۆدروستکردنی ئۆکسجین ، کەهیچ گیانلەبەرێك بێ ئۆکسجین ناژی٠زۆربەی ئەودەرمانانەی بۆچارەسەرکردنی گەلێك نەخۆشی بەکاردێن لەگەلأولق وپۆپی ئەودرەختانە دروست دەکرێن٠

**خەون :**

خەون: بریتییەلەودیتنەی کەمرۆڤی نوستوودەیبینێت٠ محەمەدمەلاسالح شارەزووری لەکتێبەکەی دا : (فرۆیدلەتەرازووی‌ژیریدا)،دەڵێ:(خەوبریتییەلەڕەنگدانەوەی‌ژیانی‌ڕۆژانەی‌ڕابردوو وئێستاوداهاتوو)لەزمانی عەرەبی دا دووپەیڤ هەن بۆخەون بەکاردێن ، ئەوانیش : (روءیا)و(حلم)٠مرۆڤ لەوکاتەی ژیانی خۆی دەستپێکردووە خەون دەبینێت بە تایبەتی مەلیك و پاشاکان هەندێك کەسیان لای خۆیان ئامادە دەکردتاخەونیان بۆتەعبیربکات٠

(محمدکوڕی سیرین)لەبەناوبانگ ترین زانایانی زانستی خەون دەژمێردرێت ، خەڵکیش تاوەکوئەم سەردەمە کتێبەکەی دەخو ێننەوەولەسەری دەڕۆن، (ئیبن سیرین)لەسەردەمی (تابعین)ژیا وەوهاوچەرخی حەسەنی بەسڕی بووەولەساڵی(١١٠ ك)کۆچی دوایی کردووەوگۆڕەکەی لە (بەسڕا )یە٠

لەئاینی ئیسلامداخەونەکان کراون بەسێ بەشەوە:

١ – خەون لەلایەن خواوە

٢ – خەون لەلایەن شەیتانەوە

٣- خەون لەگەڵ ئاخاوتنی دەروون دا

خەونی بێسەروبەریش کەزۆرترین خەونەکانی مرۆڤ بەبرسی بوون یان شەوزۆربخوات یان درەنگی شەوبخوات ئەم جۆرە خەونانە دەبینر ێت ، هەندێ خەونیش یادخستنەوەی ڕابردووە ، یان مژدەیەکی پا شەڕۆژە ، ئەم جۆرە خەونانە کەمن جارجارمرۆڤ لەژیاندادەیبینێت ، جگەلەوەش خەون نیعمەتێکەزۆرکەس بەهۆی خەونەوە تۆبەی کردووە وەچەندەهاکەس لەڕێگای خەونەوە سەروەت وسامان وگە نجینەیان دۆزیوەتەوە٠ لەکتێبی(الروح)ی ئیبن قەییم ی جەوزی(١) داهاتووە:( جارێك دەرچووین بۆگەشت ئێمە سێ کەس بووین ، یەکێك لەئێمە خەوت شتێکمان بینی وەك ڕوناکی وچراوابوولەلوتی هاتەدەرەوەوچوەناوئەشکەوتێك، جاڕوناکی یەکە گەڕایەوەوچۆوە ناولوتی ئینجالەخەوهەڵساودەم وچاوی سڕیەوە، وتی :(خەونێکی سەیرم دیت لەوئەشکەوتەدا ، ئەوهاوئەوهام دیت) ، جاچووینە ناو ئەشکەوتەکەوهەندێك سامان وپاشماوەمان دۆزییەوە،هەروەهایەکێکی ترلەخەودا هاتنەلای وپێیان وت هەڵسە بڕۆئەوشوێنەلە ماڵەکە هە ڵکەنە پارەوپولی باوکت دەدۆزیتەوە کەواباوکی پارەوپولەکەی شارد بوەوەجالەخەوهەڵساوشوێنەکەی هەڵکەند(١٠٠٠٠)دەهەزاردرهەم و زێڕێکی زۆری دۆزییەوە ئەمەش موسوڵمان بوونی ئەوی بەدواداهات ، هەروەها بەشێك لەخەون هەواڵی دواڕۆژدەدەن بۆنمونە: سەرۆکی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا(ئەبڕاهام لنکوڵەن)چەندهەفتەیەك بەرلەکوشتنی لەخەوی دادەبینێت کەوابەژوورەکانی (کۆشکی سپی) دادەگەڕێت دەنگی گریان دێتە گوێی کەدەگاتە ژووری لای ڕاست چاوی بەدارە تەرمێك دەکەوێت هەندێ کەس لەسەری دەگرین لەسەربازێك دەپرسێت کەچی ڕووی داوە؟ وەڵامی دەداتەوە کەوا سەرۆك کوژراوە ئەم خەونە هاتەدی وئەبڕاهام لنکوڵەن کوژرا٠ (ابراهام لنکولن (١٨٠٩ – ١٨٦٥) ئەم پیاوە مرۆڤ پەروەرە بەهەموو ئەمریکادا گەڕا بۆبلاّوکردنەوەی بیرەکەی ، ئەویش لەناوبردنی جیاوازی لەنێوان ڕەگەزەکانی مرۆڤ وسەربەستکردنی ڕەشپێستەکانی ئەمریکا ، لەسەرئەم بیرەچاکەی کەبووە سەرۆکی ئەمریکا دانیشتوا نی ویلایەتەکانی خوارووهەرایەکی زۆرگەورەیان نایەوە بۆمانەوەی ڤولەکانیان (کوەیلە) ، لنکۆلن بە شەڕهەراکەی کوژاندەوە ، بەلاّم لەپاش چەندڕۆژێك ئەم پیاوە مرۆڤ پەروەرە بەدەستی دوژمنە ناپاکەکانی کوژرا)٠ هەروەها(ب ڕاندلی)خەونێکی بەتاوانێکەوەبینی پاش دووهەفتە هاتەدی،گوتی: ((لەخەودا بینیم لەپاشەوەی پاسێك دا نیشتبووم ئافرەتێك لەپاسەکەدابەزی

وخێراپیاوێك كەوتە دوای وچەقۆیەكی لەسینگی دا هەمان ڕووداوم بەڕاستەقینەیی دی ئافرە تێك لەپاسێك دابەزی وپیاوێك چەقۆیەكی لێدا٠

(ف ئوكلی)لە(لەندەن) باسی ڕوداوێك دەكات بەسەرخۆی هاتووە لەخەونی دابینی دڵی تەنگەوغەریبی باوكی دەكات ودەیەوێ سەردانی بكات كاتێ خەبەری بۆوە خێراچووەماڵەوەولەوێ پێیان گوت باوكت نەخۆشەوبردویانەبۆنەخۆشخانە پاش دووڕۆژباوكی مرد٠

(مسز س پلایمۆث) ، دەڵێ : (زۆرلەمێردەكەم پاڕامەوەبۆئەوەی لەكاتی جەنگ دابەپاپۆڕنەگەڕێتەوەوپێشی نەگوت كەلەخەون دا بینیویەتی پاپۆڕەكەژێرئاوكەوتووە ، بەلأم مێردەكەی سووڕبووله سەرقسەی خۆی وپاپۆڕەكە كەوتە ڕێ وژێرئاوكەوت وخنكا)٠

توێژەرێكی ئەمریكی(ڕاین)دەڵێت:( كاتێك قوتابی بووم لەزانكۆدا لە یەكێك لەمامۆستاكان گوێبیستی خەونێكی سەیربووم (ژنێكی دراو سێی مامۆستاشەوێ لەخەونی دادەبینێت كەبراكەی بە(خۆكوشتن) دەمرێت ، بۆیەبەشلەژاوی لەخەوداڕادەبوورێ مێردەكەی لەخەودا بێداردەكاتەوەوپێداگری دەكات هاوسەرەكەی گالیسكەیەك ئامادەبكات تاكوبچن بۆماڵی براكەی،مێردەكەی هەڵدەستێ ودەچێ لەدەرگای دراوسێ یەكیان دەدات وداوای گالیسكەیان لێ دەكات وگالیسكەكە پەیدادەكات خۆی وژنەكە دەچنە ماڵی برای ژنەكە دەبینن بەڕاستی براكەی خۆی كوشتووە) هەروەها توێژەرێكی كەنەدی بەناوی (فردر یك گرانت) توانی ماددەی ئەنسۆلین بدۆزێتەوە ، گرانت دەڵێ : (شە وێكیان كۆوتارێكم ئامادەدەكردلەسەرنەخۆشی( شەكرە ) ، ئینجادوای ئەوەی ماندووبووم خەوبەسەرمدا زاڵ بووكاتژمێردووی ئەوشەوە لەخەوداڕابووم وگڵۆپەكەم هەڵكردووسێ دەستەواژەم لەدەفتەرەكەم تۆماركرد ، دواترئەودەستەواژانە بوونەكلیلی دۆزینەوەی دەرمانی (ئەنسۆلین)وگیانی ملیۆنەهامرۆڤی لەمردن ڕزگاركرد٠

(ئیلیاس هووی)داهێنەری مەكینەی بەرگ دروون ، دوای ئەوەی هەموو پارچەكانی مەكینەكەی دروستكرد ، نەیدەزانی دەرزییەكەی چۆن دروست بكات ؟ هەرچەندەبیری لێدەكردەوە بێسوودبوو٠٠جارێكیان لەخەویالەئەفریقیا خێڵێكی پیاوخۆربەدیل دەیگرن ، ئەویشتكالەسەرۆكی خێڵەكەدەكا ، كەنەیخۆن دەڵێ : من مەكینەی واتان بۆدروست دەكەم بەمەرجێك نەمخۆن٠سەرۆكی خێڵەكەش دەڵێ : باشەبەلأم ئەگەرتا ٢٤سەعاتی تردروستی نەكەی دەتخۆین ٠٠٠ ئیلیاس هوی لەكاتێكدابیردەكاتەوە ، لەپڕ ڕمی پیاوخۆرەكان سەرنجی ڕادەكێشێ كەسەیردەكات ئەم ڕمانە كونێك لەسەرەكانیاندایە٠كەئەمەدەبینێ گورج بەبیریادێت كەدەرزی مەكینەی بەرگ دروون بەم جۆر دروست بكات ، لەخۆشیان دەقیژێنێ ، دەڵێ : ((دۆزیمەوە ، دۆزیمەوە)) ، بەم جۆرە لەخەوخەبەری دەبێتەوە ٠٠ئەم داهێنەرە دەرزی مەكینەی بەرگ دروونی دروست كرد٠

(سیڵ)باس لەوحالەتەی خەون دەکات کەمرۆڤ هەندێ جاربەهۆیەوە هەست دەکات بەوەی کارە ساتێك بە سەرخۆشەویستێکی دادێت لەجێگەیەکی دوورەوە،لەلێکدانەوەکەی دادەڵێت :(لەوانەیە مێشکی ئەوکەسەی خەوەکەی دیووە،ئەوکەسەی کارەساتەکەی لێ ڕوودەدات پێکەوەگونجابن بەوەش دەتوانێت ئەوشەپۆلاً نەوەرگرێت کەلەو مێشکە دوورەوەڕەوانەدەکرێن، وەکوچۆن ئامێری (ڕادیۆ)کاتێ لەگەڵ درێژی شەپۆڵەکانی ئێستگەکەی داگونجاشەپۆڵەکان وەردەگرێت ، هە روەکوچۆن ئەودایکەی کوڕێکی بۆسەفەردەڕوات ولێی دووردەکەوێتەوەهەمیشە پێیەوەسەرقاڵەوهزریبەشەووبەڕۆژبەکوڕەکەیەوە پەیوە ستەبەڕای(سینلێ)ئەمەش یانی دەزگای هەستی شەشەمی دایکەکەو بەبەردەوامی بەرەوڕووی ڕاوەستاوە ، بۆیە لەوکاتەدا دەگو نجێت توانایەکی تایبەتی هەبێت بۆوەرگرتنی ئەوشەپۆلآنەی لە مێشکی کوڕەکەوەدەردەچن٠

سودەکانی خەون :

١ - بەڵگەیەلەسەربوونی عەزابی ناوگۆڕ، پێخەمبەر(درودی خوا ی لەسەربێ) ، لەبارەی هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە(فان لە معیشة ضنکا) ، فەرمووی:(عەزابی کافرلەناوگۆڕدا نەوەدونۆ ئەژدیهای لێ ڕاست دێن دەزانی ئەژدیهاچییە؟نەوەدونۆماری دووسەرن ئەوکافرەدەگەزن ودەڵێن تائەوەدەمەی ڕۆژی حەشر دێ ئەوسزایە بەردەوامە) ، هەروەك چۆن کەسێك خەوتووە لەخەون دادەبینێ مارپێوەی دەدائەوەی لەتەنیشتییەوەدا نیشتووە نایبینێ ، ئەم ئەژدیهایانە مردووەکە دەیبینێ هەروەك چۆ ن خەوتوولەخەودادەیبینێ٠هەروەهابەڵگەیەلەسەرخۆشی ژیانی بەرزەخیش ، بۆنموونە : کەسێك خەوێکی زۆرخۆش دەبینێ ، حەزناکات بەخەبەرهاتووە٠

٢ - زۆرکەس لەڕێگەی خەونەوە تۆبەیان کردووە٠

پاش بینینی خەون ئەگەرمرۆڤ خەونێکی خۆشی باشی بینی سوپا سی خوابکات وەئەگەرخەونێکی ناخۆشی بینی دەبێ ئەم شتانە جێ بەجێ بکات :

١ – پەنابەخوابگرێ لەشەیتانی ڕەجم کراو٠

٢ – سێ جارتف لای چەپ بکات٠

٣ – خەونەکەی بۆکەس نەگێڕێتەوە،چونکە وتوویانە ئەگەربۆکەسی باس نەکردتاکوبۆی تەعبیربکات تەئسیری نابێت بەلأم ئەگەربۆیان تەعبیرکردبەجێ دێت٠(ع ت)لەبارەی خەونەوەدەڵێ:(خەون ژیانێکی ترە)٠

ڕوح :

مەسەلەی ڕۆح (گیان) هەرلەکۆنەوەمایەی پرسیارکردن بووە٠مرۆڤ لەلەش وگیان پێکدێ ، لەش یان جەستەدیارەوئاشکرایەهەموومان دەزانین چییە ، بەلأم گیان بزوێنەری جەستەیەوچییەولەکوێدایەنازانین٠

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)ئوممەتەکەی فێرکردووە کاتێك سەردانی گۆڕستان دەکەن سەلام لەئەهلی گۆڕستان بکەن وبڵێن: (سلام علیکم اهل الدیار الخ)دیارەسەلامکردن بۆکەسێکە بوونی هەبێت وگوێی لێ بێت، هەروەهاپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ )فەرموویەتی:(مردووئەوکاتەی لەگۆڕەکەی دادەنرێت لەکاتێکدا ئەو گوێی لەدەنگی نەعلەکانەکەبەجێی دەهێڵن)٠

(عەکرەمە)و(موجاهید)دەڵێن:(ئەگەرئادەمیزادێك نووست دەبێتە هۆکارێك بۆئەوەی روحەکە بڕوات ولەبنەڕەتداروحەکەلەجەستە دایە جادەگاتە هەرشوێنێك ئەوبیەوێت ، کاتێك دەگەڕێتەوە بۆجە ستەکەئادەمیزادەکەبە ئاگادێتەوە،هەروەك بەوجێگایەی تیشکی ڕۆژوایەکەوالەزەوی دەدات ولەبنەڕەتیشدا پەیوەستە بەڕۆژەوە) هەروەهاوتراوەکەوارۆح لەکونەلوتی مرۆڤ درێژدەبیتەوەولەبنچینە شدا لەجەستەدایە وپەتی ڕوح هەیە جائەگەرڕوحەکەبە تەواوی هاتەدەرەوەئەوادەمرێت هەروەك کاتێك کەڕووناکی چرائەگەرلە نێوان ئەووفتیلەکەجیاببێتەوە ئایانابینیت کەوامەڵبەندی ئاگرەکە لەفتیلەکەدایە وەڕووناکی وتیشکەکەی ماڵەوە پڕدەکات؟بەمشێوەیە ڕوح یش لەکونەلوتی مرۆڤ درێژدەبیتەوەلەخەوەکەی داتاوەکودەچێتە ئاسمان ولەوڵاتان دەسوڕێتەوەودەگات بەڕوحی مردووەکان٠ وتراوە روح لە(ڕیح)ەوە هاتووە واتا : (با) ، چونکە (با) دەڕوات ، ڕوحیش گەشت وگەڕانی خۆی دەکات٠

مرۆڤ چوارجیهانی هەیە :

جیهانی یەکەم لەناوسکی دایکی دایە٠

جیهانی دووەم لەدنیادایە٠

جیهانی سێیەم جیهانی بەرزەخە ، واتاژیانی ناوگۆڕ٠

جیهانی چوارەم بەهەشت یان دۆزەخە٠

هەروەهاپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:(ڕوحی ئیماندارگەش ودرەوشاوەیە ، ڕوحی کافریش ڕەش وتارمایی یە) ، هەروەها پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(کاتێ ڕوحی ئادەمیزادێکی ئیمانداردەکێشرێ بەختەوەران وئەهلی ڕەحمەت لەلای خودای گەورە دێنە پێشوازییەوە ، هەروەك چۆن کەسێ کەمزگێنی هێنەرە پێشوازی لێ دەکرێ ، دەڵێن : دەرفەت بدەن ئەمەبراتانە کەتازەهاتووە باوچانێ دەربکات ، چونکە لەناو تەنگانەیەکی هەرەدژواردابووە ، پاشان پرسیاری لێ دەکەن ئاخۆفلاڵنە کەس شوی کرد؟ کاتێ سەبارەت بەپیاوێك کەپێش خۆی مردووە پرسیاری لێ دەکەن ، دەڵێ پێش من مردووە ، ئەوان دەڵێن : ئێمە هی خودابووین وبۆلای خودادەگەڕێینەوە ، بۆدۆزەخیان بردووە) تەبەڕانی ڕیوایەتی کردووە٠

مردن :

مردن بریتییەلەدەرچوونی ڕوح لەجەستە٠مردن وئاوابوونی تەمەن شتێکی حەتمییە وهەمووکەسێك دەبێ بمرێ کەس ناتوانێ لێی دەربازبێ ، وەمردن دادوەرانەسەردانی هەمووکەسێك دەکات وتایبەت

نییەبەهەژارودەوڵەمەندوئاین ونەتەوەیەك هەمووگیانلەبەرێك هاوبەشەلەم دیاردەیە٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:(الكیس من دان نفسه وعمل لمابعدالموت)٠واتا:(مرۆڤی ژیرئەوكەسەیەكەنەفسی خۆی موحاسەبەدەكات وكار بۆدوای مردنی وجیهانەكەی تردەكات)٠ژیان ڕۆیشتنێكەبۆمردن ، لەپیاوچاكێك پرسیاركرا:- ژیانت چۆن دابینكردووە ؟ وتی : لەسەرچوارپایە :-

١ – زانیم كەڕزقی من كەسێكی ترنایخوات ، ئیترئارام بووم٠

٢ – زانیم كەخوای گەورە دەمبینێت ، ئیتربەشەرم وبەئەدەب بووم٠

٣ – زانیم كاری من كەسێكی ترئەنجامی نادات ، ئیترهەوڵم دا٠

٤ – زانیم كەكۆتای كاری من مردنە ، ئیترخۆمم بۆئامادەكرد٠

قورئانی پیرۆزمردنی بەناخۆش لە سەرمرۆڤ داناوە (فاصابتكم مصیبة الموت)المائدە:١٠٦ لەحەدیس دا هاتووە(اذامات العبد قامت قیامته)واتا:(هەركەمرۆڤ مرد یەكسەرڕۆژی دوایی وجیهانەكەی تری دەست پێدەكات)٠هەندێ كەس باسی مەرگ لەلایان پێیان ناخۆشە ، بەڵام بیركردنەوەلەمەرگ دەبێتەهۆی دووركەوتنەوەلە دنیاپەرستی وزیادبوونی تەقوا ، لەبەرئەوەیە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(زوروامو تاكم وسلموا علیهم فاءن لكم فیها عبرة)٠

واتا :(سەردانی مردوانتان بكەن وسەلامیان لێ بكەن ، چونكە ئامۆژگاری وپەندی تێدایەبۆتان) وەمرۆڤ ئەگەرڕوداوێكیش نەیكوژێ پیری دەیكوژێ ، وەك چۆن میوەكەكاتی گەیشتنی هات ئەگەرلێشی نەكەیتەوە لەخۆیەوە دەكەوێتەخوارەوە٠ وەكەس نازانێ لەكوێ دەمرێ : (وماتدری نفس بأی أرض تموت) لقمان : ٣٤ بۆنموونە : كابرایەك خەڵكی هەولێرە لەحەج دەمرێ ، ئەمریكییە لەعیراق دەمرێ ، یەك نقومی ئاودەبێت٠

شاعیردەڵێ :

ئەی ئادەمیزادبیرتەكەلەدایك بوویت ؟

خەڵكی پێدەكەنین وتۆدەگریایت

دە وا بژی كەتۆمردیت

ئەوان بگرین وتۆلەپێكەنین دابیت

زاناوشاعیری ئێرانی خەیام (١٠٤٨ – ١١٣١م) دەڵێ :

پەندێكی مناڵەكەت بدەمامەی پیر

بابازی بەخاك وگڵ نەكاژیری بەبیر

بێژەنگ لەدەس دەرێنەبەس دابێژێ

كەللەی سەری پادشاومیرووەزیر

واتامرۆڤ لەخۆڵەودەبێتەوەخۆڵ ، هۆمامەی دنیادیدەگوێ بگرە برۆئامۆژگاری منداڵەکەی خۆت بکە ئەومناڵە تێی ناگە تۆتەمەنێکت ڕابواردووە شتێکی زیاتری لێ دەزانی ، بڵێ ئەم گڵەی ئێستاتۆلەهێلەگی دەدەی ڕۆژگارێك جەستەی پاشاومیرووەزیران بووە وامەکە٠هەروەهادەڵێ :

بۆگۆزەکڕین دەچوومەلای گۆزەکەرێك

سەدگۆزەبەمن پێکەنی هەریەك لەبەرێك

ئێمەی وەکوخۆت ئەبەی سبەینێ خۆشت

وەك ئێمەدەبی بەگۆزەلای بێ خەبەرێك

واتا : چۆن دڵم بەوژیانەخۆش بێت ئەوەتاچووبووم گۆزەیەك بکڕم لەپرسەدان گۆزەلێم هاتنەجواب وگوتیان : ئێمەش هەرمرۆڤ بوین وەکوتۆ ، تۆش کەمردی پاش ماوەیەك ئاوات بەسەردێ٠هەروەهادەڵێ :

ژیانت چییەتاچوك وشلی شاگردی

وەستای کەگەیشتی ، پاشی پیری ، مردی

واتا : ژیان هیچ نییە ، هەتابچوکی شاگردی کەگەورەش بووی پیربووی لەزەتی لێناکەی وپاشان دەمری٠هەروەهادەڵێ :

وەبزانەجیهان بەئارەزووی تۆدەگەڕێ

ئەم چەرخ وخولەی هەمووی بەفوی تۆدەگەڕێ

وەبزانەکەسەدساڵ ژیای ، پاشان چی ؟

مەرگێکەلەسەرڕێگەلەدووی تۆدەگەڕێ

واتا : وادانێ کەئەم جیهانەبەئارەزووی تۆدەسوڕێتەوە ، وابزانەکەسەدساڵ ژیای ، بەڵام پاشان مەرگ لەدوامان دەگەڕێ وڕۆژێك دەماندۆزێتەوە٠هەروەهادەڵێ :

لەم خانەدوودەرگانەکەپێت تێناوە

هاتووی بەپەلەودەچییەدەرێ لەولاوە

واتا : لەم خانووە دوودەرگایە کەتێی هاتووی ژیانە ، دەرگایەکیان هاتن ولەدایکبوونتە ، دەرگاکەی تریان چوونەدەرەوەومردنە٠

باباتاهیری هەمەدانی دەڵێ :

وای ئان ڕۆژێ کەدەرگۆڕم کەرەن تەنگ

وەرێژن بەرسەرم خاك وخەس وسەنگ

نەپایی ئان کەئەزماران گوریزم

نەدەست ئان کەباموران کونەم جەنگ

واتا : ئەورۆژەی کەدەمخەنەناوگۆڕی تەنگەوە ، خاك وخۆڵ وبەردم بەسەردادەکەن ، نەئەوپێیەم هەیەکەلەبەرماران ڕابکەم ، نەئەودەستەشم هەیەکەلەگەڵ مێرووەکان بجەنگم

هەروەهادەڵێ :

دونیاخوان بی ومەردووم میهمان بی

ئیمروزلالەبی ، فەرداخەزان بی

واتا : جیهان خوانەومرۆڤ میوانە ، ئەمرۆگولاڵەیەوسبەی خەزانە٠هەروەهادەڵێ :

بەگۆڕستان گوزەرکەردم کەم وبیش

بدیدەم حالی دەوڵەتمەندودەرویش

نەدەروێشێ بەخاکی بێ کفن ماند

نەدەوڵەتمەند بردئەزیەك کفن بیش

واتا : کەم وزۆربەگۆڕستان گوزەرم کرد ، حالی دەوڵەمەندوهەژارم لەوێ بینی ، نەهەژارێ بەبێ کفن لەوێ مایەوە ، نەدەوڵەمەندلەکفنێ زیاتری برد٠(باباتاهیری هەمەدانی دەڵێن لە٩٩٩م لەدایکبووە ، لەساڵی ١٠٥٨م توغرول بەگی سەلجوقی سەری لێداوە لەوساڵەدازیندووبووە ، بەڵام نازانرێ کەی وەفاتی کردووە٠ناوەڕۆکی شیعرەکانی بەزۆری ئاینی وسۆفیانەیە ، بەزاری لوری شیعری هۆنیوەتەوە٠لەدێرەشیعرێکدادەردەکەوێ کەباباتاهیرلەکە٠

مودەروێشم لەکم ، ئیعجازدیرم

مودۆسێ چوخۆشین هاورازدیرم

عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوای لێ ڕازیبێ) دەڵێ : (خەڵکی لەگەشتدان دنیاش شوێنی پێداتێپەڕبوونە ، سکی دایك سەرەتای گەشتەکەیەورۆژی دواییش ئامانجەکەیە)٠

نالی دەڵێ :

صابونی کەففی پێیەکەفی زاری چاپلوس

خاصیەتی ڕەققی هەیەنەرمی زوبانی لوس

ئەی دڵ!خەراجی حاصلی زوڵماتی بەحروبەڕ

میراتی ئیعتیارەلەفورزەندەی فەیلەقوفوس

بونیانی کیبروسەرکەشییەتاقی کیسرەوی

دانانی زوڵم وڕوڕەشییەتەختی ئابنوس

بنواڕەئەوەلت وچوونی ئاخرت

هاتی چ ڕووت وقوت وهەڵاتی چ لوس وپوس

نالی لێرەدابریق وباقی دنیاوەکوقسەی کابرایەکی زمان لوس پیشا ندەداکەچۆن بەزمانی لوس وقسەی بریقەدارمرۆڤ لەخشتەدەبات ئاواش دنیامرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنێ٠هەروەهانالی ئەوەئەوەدەخاتەڕووکەئەم دنیایەوەفای بۆکەس نییەوبۆکەس نامێنێتەوە ، بەلگەش ئەسکەندەری فلیپ پاشایەکەڕۆژهەلأت وڕۆژئاوای گرت ومردیش یاخودتاقی کیسراکەنیشانەی زوڵم وستەم بووتەختەکەشی لەئەبەنووس بووکەچی دوولەت بوونەماولەناوچوو ، ئینجانالی داوالەمرۆڤ دەکات کەبەخۆی دابێتەوەولەوەڕامێنێ کەچۆن هاتۆتەئەم دنیایەوە ، بێگومان مرۆڤ کەلەدایك دەبێ بەڕووت وقوتی لەدایك دەبێ کەمردیش دەیخەنەناوگۆڕوهیچ لەگەڵ خۆی نابات وجارێکی تربەڕووت وقوتی دەگەڕێتەوە٠

نالی دەڵێ :

هەرچەندەکەعومری خضروجامی جەمت بوو

چونکەئەمەلت زۆرە ، چ عومرێکی کەمت بوو

ئەی جامیعی دنیاوقیامەت بەخەیالأت

ئەوڕۆژەکەمردی نوئەوت بوونەئەمت بوو

بێزارەلەتۆئێستە ، هەماغوشی عەدووتە

دونیاکەدوێنێ حەرەمی موحتەرەمت بوو

ئەمڕۆنەدەست بوو ، نەدەمت بوو ، نەدەمت بوو!

عومرت نەفسێکی کەهەمووعالەمی دنیا

بمرەلەغەمیداکەهەمووصەرفی غەمت بوو

لێرەدانالی باسی دووشت دەکات : تەمەن درێژی وهیواوخولیای زۆر٠تەمەندرێژی لای نالی ئەوەنییەکەوەکوخدری زیندە ، بەڵکوگرینگ بەدەستهێنانی هیواوئاواتە ، نالی ڕوودەکاتەدنیاخوازان ئەم دنیایەی لەکیس دەچێ دنیاکەی تریشی لەکیس دەچێ چو نکەهیچی بۆئەودنیائامادەنەکردووە٠نالی وادەڕوانێتەئەم دنیایەکەوێستگەیەك بێ بۆبەدەستهێنانی ئەودنیا ، بۆئەوەی لەهەردوودنیاسەربەرزبێ ، نالی لێرەدائەم تەمەنەدرێژەی وەك یەك هەناسەپیشاندە داکەهەمووی هەرلەغەم بەسەربردووە٠

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)دەفەرمووێ:(کن فی الدنیاکانك غریب اوعابرالسبیل)٠واتا : (لەدنیاداوەك کەسێکی غەریب یان وەك ڕێبواروگەشتیارێك بژی)٠(مهاتماغاندی)لەکتێبەکەیدا (بۆچی ترس لەمەرگ وشیوەن وزاری)دەڵێ:((لەجیهانداوەکوڕێبوارێك بن یاخودوەکوکەسێك کەبەڕێگەیەکداتێدەپەڕێت،خۆتان لەمردووەکان بژمێرن))من ئەوڕستەیەبەخشل وزێڕی هەمووخشڵ وزێڕەکان دەزانم٠لەوەئاگادارین کەمەرگ لەهەمووساتێکداله(کەمین)دایەمەرگ بەخششێکەکەدروستکەروبەدیهێنەری ژیان بەهەمووئەوانەی کەدەژین چ ئەوانەی کەمرۆڤن وچ ئەوانەی کەمرۆڤ نین بەخشیویەتی ، ئەوجیاوازییەی کەهەیەلەکات وچۆنییەتی مردن دایە))٠کاتێك مرۆڤ لەمەرگ نزیك دەبێتەوە لەکاتی تەنگانەوکارەساتدامرۆڤ سەیری ئاسمان دەکات

ولەخودا(جل جلاله)دەپارێتەوەکەڕزگاری بکات ، کاتێك لەناوکەشتییەکدادەبن یەکێکیان لەگەڵ دەبێت کەباوەڕی بەئاین نییەبینیان وەکوئەوان دەستی بۆئاسمان بەرزکردۆتەوەداوای نەجاتبوون لەخوای گەورەدەکات٠

شاعیرێك دەڵێ : مردن دەرگایەکەهەمووکەس دەبێ پێیدابڕوات٠بەلاّم گرینگ ئەوەیەبزانین چ ماڵێك چاوەڕێمان دەکات بەهەشت یان جەهەننەم ؟ مردن ئەوبڕیارەیەکەخوای گەورەداویەتی وکەس نییەشمولی نەکات وبتوانێ خۆی لێ دەربازبکات٠هەموومرۆڤەکان لەدووشتدایەکسانن ؛یەکەم لەدایکبوون ، دووەم مردن٠مرۆڤ لەسەری نوسراوەبمرێت جانەخۆش دەکەوێت یان پیردەبێ یان بەڕووداوێك دەمرێ٠ئیمامی غەزالی دەڵێ : مرۆڤەکان سەبارەت بەمەرگ سێ دەستەن :-

یەکەم : هەندێ کەس لەخۆشییەکانی دنیادان لەمەرگ ڕادەکەن،چونکەمەرگ بەپچڕێنەری خۆشییەکانی دنیادەزانن٠

دووەم : ئەمانەلەمەرگ ڕادەکەن،چونکەبیرلەکردەوەکانیان دەکەنەوە٠

سێیەم : ئەمانەپێشوازی لەمەرگ دەکەن ، چونکەبەدیداری مەعشوق وخۆشەویستی دەزانن٠

## ئایا خضرزیندووە ؟

لەبارەی ناوی( خضر)وتراوەناوی خۆی (بلیابنملکا)یەوناسناوی (خضر)ە ، لەبارەی ناسناوەکەی وتراوە هەرکاتێك لەسەرزەوی دادەنیشت گیای سەوزی لێدەڕواودەبووە پارچەیەك سەوزایی ، (خضر) واتا (سەوز) یاخود(سەوزایی) ، هەروەهاوتراوە جل وبەرگەکەی سەوزبووە ، هەروەها خوای گەورە ناوی ئەم بەندەیەی لەقورئاندا باس نەکردووە٠ وتراوەکەسێکی (وەلی) بووە ، هەروەهاوتراوە لەفریشتەکان بووە٠ ئەگەرئینسان بێت دەمرێت ، وەئەگەرفریشتەبێت ئەوەشتێکی ئاساییە کەدرو ستکراوێکی غەیبی کاتێك خۆی نیشانی ئینسان دەدات ، لە شێوەی مرۆڤ داخۆی نیشان دەدات ، کاتێك جوبرەئیلی فریشتە هاتە لای "مەریەم" وەکوبەشەرێکی تەواوخۆی خستەبەرچاوی (فتمثل لهابشراسویا)مریم : ١٧ ، وەپێغەمبەر(درودی خوایلەسەربێ) دووجارفریشتەی لەسەرشێوەی خۆی بینیوە ، جگەلەم دووجارە لەسەرشێوەی پیاوێك دەیبینی ، وەلەسەرشێوەی پیاوێکی دەشتەکی دەهاتە خزمەت پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) کەواتە هاوەڵانیش فریشتەیان بینیوە ، بەلاّم لەسەر شێوەی خۆی نا ، بەڵکولەسەرشێوەی پیاوێك٠هەندێکیش دەڵێن (نبی)بووە ، لەبەرئایەتی(ومافعلتە عن امری)الکهف : ٨٢ ، سەبارەت بەم مەسەلەیە بیروبۆچوونی جیاوازهەیە ، سۆفییەکان پێیان وایە زیندووە ، لەناومان دایە ، واتاتەمەنی درێژدەبێت٠ "خضر" کەشتییەکەی کونکرد ، حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێ) ، پێی فەرموو : ئایا کەشتییەکەت کون تێکرد یۆئەوەی سەرنشینەکان لەدەریادا نقوم بکەی ؟ (بڕوانە : ئایەتی (٧١) ی سوڕەتی کهف)"خضر" ، دەیزانی

پاشایەکی زۆرداری داگیرکەرهەیە هەمووکەشتییەکی چاك بۆخۆی دەبات ، بۆیە کونی تێکر دوبەپینەکردن چاکی کردەوە بۆئەوەی هەرکاتێك پاشاکە کە شتییەکەی بەپینەکراوی بینی نەیبات٠
(واماالجدارفکان لغلامین یتیمین في المدینة وکان تحته کنزلهما وکان ابوهماصالحا ) الکهف : ٨٢ ، دیوارێك لەناو شارەکە خەریکبوودەڕووخا ، چاککردنەوەی دیوارەکە لەلایەن (خضر) خوای گەورە ئاگاداری کردبووەوە بەبوونی گەنجینە یەك لەژێریدا ، ئەگەردیوارەکە بڕوخابا خەڵکی شارەکە بیانزا نیبایە دەستیان بەسەردادەگرت ، گەنجینەکەهی دوومنداڵی بێباوك بوو لەشارەکەدا کەبچووکبوون ، ئەگەردەرکەوتبایە ئەمانە بێ دەسەڵات بوون کەدەری بهێنن وبیانپارێزن لەناوخە ڵکی شارەکەدا لەبەرئەوەدیوارەکەی چاککر دەوە تائەوکاتەی گەورەدەبن کەباوکەچاکەکارەکەیان گەنجینەکەی لەژێردیوارەکە دا شاردبووەوە٠چیرۆکی منداڵەکە : ئەم منداڵەلەسەردەستی خضردەکوژرێ وەحەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێبێ) ناڕەزایی دەربڕی چونکەوای زانی ناحەقییە(أقتلت نفسازکیةبغیرنفس لقدجئت شیئانکرا)الکهف واتا : (ئەوەبۆچی کەسێکی بێگوناهت کوشت بێئەوەی تاوانێکی وای کردبێ(شایستەی کوشتن بێ)بەڕاستی کارێکی ناپەسندوناڕەوات ئەنجامدا) بەڵام دوای ئەمەخضرپێی وت : کەخوای گەورەبەزانینی غەیب دەربارەی ئەم منداڵە دەیزانی کاتێك گەورەدەبێ دەبێتەستەمکارێکی بەهێزودایك وباوکی ئازاردەدات ، وەلەبەرئەوەی دایك وباوکی کەسانێکی باشن خوای گەورەویستی بیانپارێزێت (وأماالغلام فکان أبواه مؤمنین وخشیناأن یرهقهماطغیاناوکفرا) الکهف(فأردناأن یبدلهماربهماخیرامنه زکاة وأقرب رحما) واتا : (منداڵەکە کەکوشتم دایك وباوکێکی ئیمانداری هەبووترساین لەوەی کەبەسەرکەشی وبێ دینی هیلاك وماندوویان بکات ، بەوکارەویستمان کەپەروەردگاریان لەجیاتی ئەوپاکتروچاکتریان پێببەخشێ وبەمنداڵێکی خاوەن بەزەیی ومیهرەبان بەهرەوەریان بکات و(منداڵەکەش بەهەشتی بێ))٠

**نیشانەکانی ڕۆژی دوایی وکۆتایی هاتنی دنیا :**

**یەکەم : نیشانەبچووکەکان**

**ڕوودانی فیتنەلەمەشریق :**

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ڕووی کردەڕۆژهەڵات وفەرمووی : ئاگاداربن فیتنە لەوێوەیە ، دووجارئەمەی دووبارەکردەوە٠ (شەرق بریتییە لە عیراق وئێران وئەفغانستان وپاکستان وهیندستان وصین وبەشێکیش لەڕووسیا)٠ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(قیامەت نایەت تاوەکوکات لێك نزیك دەبێتەوە ، ساڵ وەکومانگی لێ دێت ، مانگ وەکوهەینی لێ دێت ، هەینیش وەکوڕۆژی لێ دێت ، ڕۆژیش وەکو کاتژمێری لێ دێت ، کاتژمێریش وەکوئەوەی لێ دێت ، کەگەڵایەك بسووتێنی ، کەچەند بەخێرایی دەسووتێ)٠

هەروەهازۆربوونی کوشتن وزۆربوونی بوومەلەرزەوبلاْوبوونەوەی زیناوبلاْوبوونەوەی ڕیباوحەلالکردنی مۆسیقاوخواردنەوەی مەی وڕازاندنەوەی مزگەوتەکان و هتد٠

نیشانەگەورەکان :

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (دنیا کۆتایی نایەت ، تا (١٠)دە نیشانەی قیامەت ڕوونەدات : دووکەلْ ، دەججال ، ئاژەلْێك لەگەلْ خەلْکی قسەدەکات،هەلْهاتنی خۆرلەخۆرئاوا ، دا بە زینی پێخەمبەرعیسا(سەلامی خوای لیْ بێ) ، هاتنی یەئجوج ومەئجوج ، سێ ڕۆچوون بەناخی زەوی داڕوودەدات ، یەکێکیان لەڕۆژ هەلاْت ، یەکێکی ترلەڕۆژئاوا ، ئەوی تریان لەجەزیرەی عەرەب ، هەروەهادەرکەوتنی ئاگرێك لەیەمەن ، کەخەلْکی بەرەومەحشەر دەبات)پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : (دەجال دەردەچێت ودێت لەجولەکەکانی (ئەسفەهان) ، کەحەفتا هەزارجو ولەکەشوێنی دەکەوێت)٠

موحەممەدی مەهدی :

مەهدی ناسناوە واتا : هیدایەت دراو ، ناوی محەممەدە ، ناوی وەك ناوی پێخەمبەرە ، ناوی باوکیشی وەك ناوی باوکی پێخەمبەرە٠ لەنەوەی (ئیمامی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی) یە٠ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(المهدی من اهل البیت ، یصلعه الله في لیلة) (مسنداحمد ، وسنن ابن ماجه)

واتا :(مەهدی لە ئێمەیە لە ئال وبەیتە ، لەشەوێکداخوای گەورە چاکی دەکات ، گونجاوی دەکات بۆخەلافەت وبەڕێوەبردنی) (لەشە وێکدا خوا(جل جلاله)چاکی دەکات ، هەندێك دەلْێن : مانای ئەوەیە خوای گەورە دەیگونجێنیْ لەهەلْسوکەوت وزانست ودادپەروەر ، بەلاْم"ئیبن کەسیر"دەلْیْ : واتا خوای گەورەتەوبەی لیْ قبول دەکات ومۆفەقی دەکات لەدوای ئەوەی پێشتروانەبووە) ، هەروەها پێخەمبە ر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : (مەهدی لەوەچەی منە ولەنەوەومندالْی فاتیمەیە) (سنن ابوداود ، وسنن ابن ماجە)

دەججال پێی دەوتریْ : مەسیحی دەججال ، چونکەیەکێك لەچاوەکا نی مەسح بۆتەوەوڕەش بۆتەوە ، بەلاْم حەزرەتی عیسا پێی دەوتریْ مەسیح ، چونکە دەستی بەچاوی کۆردادەهێنا چاك دەبۆوە بەئیزنی خوا(جل جلاله) ، دەستی بەسەرنەخۆشێکدا داهێناباچاك دەبۆوە بەئیزنی خوا(جل جلاله)٠ لەفەرموودەیەکدا ئەم نیشانانەهاتوون بۆناسینەوەی دەججال : (پیاوە ، گەنجە، پیاوێکی ڕەنگ سوورە ، کورتەبالاْیە ، ڕانی پێیەکانی لەیەك نزیکن وپاژنەی پێی لێك دوورە ، قژلوول وزۆرە ، ناوچەوانی پانە ، چوارشانەیە ، چاوی ڕاستی سڕاوەتەوەوهاتۆتەدەرەوەبۆپێشەوە ، لەبەینی هەردووچاوی نوسراوە : کافر، جایان (ك ف ر)پیتەکان لێك پچڕاون ، یاخود بیْ پچڕانی پیتەکان) ، هاتنی دەججال فیتنەوتاقیکردنەوەیەکی زۆرگەورەیە ، دەججال پێخەمبەر(عیسا) (سەلامی خوای لیْ بێ) دەیکوژیْ لەحەدیسێکداهاتووە عیسای کوڕی مەریەم(سەلامی خوای لیْ بێ) دەججال لەدەرگای( لود) دەکوژێت٠(دەرگای لود ، شارێکەلە "فەلەستین" نزیکەلەقودس)٠

دابەزینی حەزرەتی عیسا(سەلامی خوای لیْ بێ) :

لەسەحیحی مسلیم دا هاتووە ، کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(کاتێك خوا(جل جلالە)پێخەمبەرعیسا(سەلامی خوای لێ بێ)دەنێرێتە خوارەوە ، ئەوالەمزگەوتی منارەسپییەکەدائەبەزێت لەرۆژهەلأتی دیمەشق ، پۆشاکێکی زەردی لەبەردایەکاتێك دائەبەزێت ، هەروەهالەنێوان دووبالی مەلائیکەت دایە کاتێك دەیهێننەخوارەوە ، کە سەربلەقێنێت ئەوائاولەناوچاوی ئەشکێ ، هەروەکولوئلوئومەرجا ن وایە ، وەهیچ کافرێك نییەکەبۆنی عیسای بۆبچێت (سەلامی خوای لێ بێ)ئیللائەمرێت ، وەبۆنەکەش بەئەندازەی بینینی چاودەڕوات تاوەکولەدەرگای(لود)(لەسوریا)بەدەججال دەگات ودەیکوژێت٠لەحە دیس داهاتووە ، حەزرەتی عیسا(سەلامی خوای لێ بێ) : پیاوێکی چوارشانەیە ، بالأی نەدرێژە نەکورتە ، کەسێکی پێست سووروسپییە ، لاشەی بەهێزە ، سینگی پانە ، قژی خاوە هەروەکوتازەلەگەرماوهاتبێتەدەرەوە ، وەقژی پڕە تانزیك هەردووشا نی درێژە) بەشێك لەڕیوایەتەکان دەڵێن: حەزرەتی عیسا(سەلامی خوای لێ بێ) چل ساڵ دەمێنێتەوە ، بەشێکی تریش دەڵێن : حەوت ساڵ دەمێنێتەوە ، بەلأم حەزرەتی عیسا(سەلامی خوای لێ بێ) وتراوەکاتێك بەرزکرایەوە بۆئاسمان تەمەنی (٣٣)ساڵ بووە ، هەرلەتەمە نی (٣٣)سی وسێ سالی دادەبەزێتە سەرزەوی ، حەوت ساڵ حوکم دە کات وتەمەنی دەبێتە(٤٠)چل ساڵ ودەمرێت ، ئەم حەوت ساڵەپڕەلە خێروخۆشی وبەرەکەت ، دڵەکان ساف دەبن کەس ڕقی لەکەس نا بێتەوە ومنداڵ یاری لەگەڵ ماردەکات ومارەکەپێیوەنادات وەدوای مردنی دنیاهیچ خۆشییەکی تێدانامێنێت وجەهل لەناوخەڵکی بلأودەبێتەوەودنیابەرەوکۆتایی دەچێ٠

**هاتنی یەئجوج ومەئجوج :**

بەشێك لەزانایان دەڵێن : یەئجوج ومەئجوج دەگەڕێنەوەبۆ(یافث)ی کوڕی حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێ بێ) شێوەیان لەمەغۆلەکان دەکات ، چاویان بچووکە ولووتیان بچووك وکورتە ، ناوچەوانیان پانە ، واتالەسەرشێوەورەنگی مەغۆل٠ "ذولقرنين" پاشایەکی چاك بووە ، بەبەستێکی دروستکرد لەبەردەم "یەئجوج" و"مەئجوج" ، تاوەکوببێتەرێگرلەنێوان ئەوان ودراوسێکانیان ، کەپەنایان بۆبرد بوو ، بۆیەپێی دەوترێ( ذولقرنين) ، وتراوەچونکە تاجێکی دەکردە سەری دووشاخی هەبوو، هەندێکیش دەڵێن لەبەرئەوەی ڕۆژهەلأت ورۆژئاواگەڕاوە٠ وەشوێنی ئەم بەربەستی دروستی کردبوو بەشێوەیە کی دیاریکراوکەس نازانێت لەکوێیە ؟ تەنهائەوەنەبێ ئەم بەربەستە لەنێوان دووچیایە ، هەروەکولە سورەتی (کهف) ئاماژەی پێکراوە ٠ (دووئەسکەندەرهەیە یەکێکیان زولقەرنەینە ، بەلأم ئەسکەندەری مەقدۆنی ئەرستۆماوستای بوو کەشاری ئەسکەندەرییەی لەمیصر دروستکردووە ، لەتەمەنی منداڵی دا ئەرستۆماوستای بووە ، کاتێ بووبەپادشا ئەرستۆی کردووە بەوەزیری خۆی ئەرستۆش قوتابی ئەفلاتوون بوو ، واتا زولقەرنەین ئەسکەندەری مەقدۆنی نییە ، ئەسکەندەری زەمانی ئەرستۆلەدوای ئەسکەندەری زولقەرنەین هاتۆتە دنیاوە٠)

بەچی لەناودەچن ؟

لەفەرموودەیەکداهاتووە :(یەئجوج ومەئجوج دەردەچن بۆناوخەڵکی وئاوەکان دەخۆنەوەوخەڵکی لەبەریان ڕادەکات ، یەئجوج ومەئجوج تیرەکانیان بۆئاسمان دەهاوێژن ودەکەوێتەخوارەوە ، کەتیرەکانیان بەخوێن سووربوو، دەڵێن : بەسەرخەڵکی زەوی دازاڵ بووین بەهۆی هێزودەسەلآتمان) وتراوە خوای گەورەجۆرە کرمێك دەنێرێتەسەریان کەلەپشت ملیان دەردەچێت ولەناویان دەبات ، یاخودخوای گەورە نەخۆشییەکیان بۆدەنێرێت کەجۆرەکرمێکە لەناوکەللەی سەریان کرمێك پەیدادەبێ لەناولووتیان دێتەدەرەوە ، هەموویان بەیەکەوەدە دەکەونەسەرزەوی ودەمرن٠

دووکەڵ :

دووکەڵێکی گەورەبەسەردنیادادێت وەکولەئایەتی (١٠ و١١)ی سوڕەتی (دخان)باسکراوە٠ئەم دووکەڵە ئیمانداران دەگرێتەوەوەکوهەلأمەتێك ، بەلأم بێباوەڕا ن دەگرێتەوە،تاوەکووای لێدێت لەهەموودەرچەیەکی لەشیان دێتەدە رەوە٠

هەڵهاتنی خۆرلەخۆرئاوا :

کاتێك ئەم نیشانەیەهات تەوبەقبوول نابێت ، ئەگەرپێشترئیمانی نەهێنابێت ، وەکولەئایەتی (١٥٨) ی سوڕەتی (ئەنعام)باسکراوە٠

هاتنی گیاندارێك لەزەوی دا ، کەقسەلەگەڵ خەڵکی دادەکات :

ئەوکەسەی بێباوەڕبێت خەتێك لەلووتی دەدات بۆئەوەی کەدیاربێت بێباوەڕە ، لەم کاتەش دا ئیمان هێنان هیچ سوودی نییە ، خوای گەو رە لەئایەتی (٨٢)ی سوڕەتی (نمل) داباسی ئەم گیاندارەی کردووە٠ هەروەهاپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (ئاژەڵەکەکەدێت وگۆچانەکەی پێخەمبەرمووسای پێیە وئەنگوستیلەکەی پێخەمبەرسولەیمانی پێیە ، کافری پێ نیشان دەکات) ، ئەم گیاندارە لەمەککەوەدێت ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێت : (ئاژەڵەکەدێت لەگەورەترین مزگەوت کە(بەیتولحەرام)ە،کاتێك زەوی دەهەژێت وشەق دەبات ، لەم بەینەداگیاندارەکەدێت دەردەچێت) ، ئیشی ئەم گیاندارەئەوەیە : موسوڵمان وبێباوەڕلێکترجیادەکاتەوە٠

کۆتانیشانە : دەرچوونی ئاگرێکی گەورەلەیەمەن پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (ئاگرێك لەیەمەن دێت ، خەڵکی کۆدەکاتەوەوڕاپێچیان دەکات بەرەومەحشەر) ، هەروەهافەرموویەتی : (ئالێرەداکۆدەکرێنەوە ، ئالێرەداکۆدەکرێنەوە ، بەسواری ولاغ ، بە ڕۆیشتن ، بەپێ ، بەسەردەم وچاودا)٠

"ئیبن ئەبی کەبیر"دەڵێ : بەدەست ئاماژەی بۆلای شام کرد ، جافەر مووی : ئالێرەداخەڵکی کۆدەکرێنەوە٠ بێگومان نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی زۆربەیان ڕوویان داوەکاتێك یەکەم نیشانەی گەورەی ڕۆژی دوایی بەدیارکەوت ، ئەوانی تربەدوای دا دێن ، وەکوچۆن تەسبیح دەپچڕێت ، دەنکەکانی بەدوای یەکدادەکەون٠

## بەشی دووەم

**ئەخلاق :**

**بريتييەلەكۆى ئەوهەلسوكەوت ورِەفتارومامەلأنەى كەمرۆڤ لەگە لْ خەلْك ودەورووبەرئەنجامى دەدات٠ئەفلأتوون پيى وايەئامانج لەپەروەردەئەوەيەتاك ببيتەكەسيكى چاك لەكۆمەلگا٠سىْ دامەزراوە بە بەشدارى لەدروستبوونى ئەخلاق دەكەن :**

**يەكەم : خيزان**

**خيزان كۆمەلّەيەكەلەميردوژن ومندالّەكانيان يان بىْ مندالْ پيكدىْ٠دەتوانين بلّيين خيزان رِاگرى كۆمەلگايە٠ژيان لەسەرزەوى سەرەتابەباوكەئادەم ودايكەحەوادەستييپيكردووە ، ئەمانە يەكەم خيزان بوون لەسەرزەوى٠ خيزان بەهاوشيوازەكانى رِەفتاردەگوازنەوەبۆنەوەكانيان ، لەگەلْ ئەوەشدا تەنهاخيزان رِۆلّى پيگەياندنى كۆمەلأيەتى نابينيت ، بە لْكولەپالْ خيزان قوتابخانەوهاورِييەتى تەواوكەرى ئەم پرِۆسەيە ن٠ لەم دامەزراوەيەدا دايك بەپلەى يەكەم ديت ، باوك بەپلەى دووەم ديت٠ "ستالۆتزى"پەروەردەكارى ئەمريكى دەلّيت :(دايك بنەچەى هەمووپەروەردەيەكەومندالّەكەى چاوى ليدەكات ويەكەم مامۆستايەتى)٠چونكەمندالْ زۆرينەى ژيانى لەگەلْ دايكيدايە،چونكەباوك زۆربەى كات لەئيش وكارەولەدەرەوەيە٠بۆيەزياترپە روەردەى مندالْ دايك لەئەستۆى دەگريت٠شاعيرى ميسرِى (حافيزئيبراهيم) دەلّيت :**

ألام مدرسة اذاأعددتها  أعددت شعباطيب الاعراق

واتا : دایك قوتابخانەیە ئەگەربەباشی پێیبگەیەنیت٠

ئەواگەلێکی پاك و چاکت بارهێناوە

پەندێکی کوردی دەڵێ : (دایکی ببینە ، کچی بخوازە) واتانیشاندەری ئەودایکەیە کەسەرپەرشتی کاری پەروەردەکردنی بووە٠زۆرجارئەگەرئافرەت بۆمێردی خراپ بێ ، کچەکەشی کەشوی کردبۆمێردی خراپ دەبێ٠بەلاّم مەرجیش نییەکورنوێنەری باوك بێ بەلاّم زۆرجارکچ کۆپی دایکییەتی٠ حەزرەتی ئا دەم (سەلامی خوای لێ بێ) کورەکەی دەستی کردبەکوشتنی براکەی ، جائەگەر خێزان هەمووشتێك بوایە دەبوایەکورەکەی ئادەم وەك باوکی بوا یە٠بەلاّم خێزانیش زۆرگرینگە ، چونکەکۆمەڵگاسەرجەمی گەلاّ لەبوونی هەموخێزانێکە ، ماڵیش گرینگترین شوێنەبۆوانەکانی ژیان٠(ت م) دەڵێ : لەتەمەنی منداڵیمدالەدەرەوەی ماڵەوە باوکم چاودێری هەڵسوکەوتەکانمی نەدەکرد ، بەلایەوەگرینگ نەبووئاخۆلەقوتابخانەزیرەکم یان نا؟! ئەمەبووەهۆی ئەوەی هاورێیەتی لەگەڵ چەندمنداڵێکی سەرەرۆولاساری هاوتەمەنی خۆمدادروست بکەم ودواجارگەنجێکی سەرکێشم لێ دەربچێ٠ماوەیەك دەستم کردبەحەبخواردن ئەم حەب خواردنەوردەوردە لەگەڵ تەمەنمداگەشەی کردکارگەیشتەئەوەی ئالوودەی ماددەبێهۆشکەرەکان بووم ، سەرەنجام دەستگیرکرام بەتۆمەتی بازرگانیکردن بەتلیاکەوە٠

دووەم : قوتابخانە

قوتابخانەخۆشترین شوێنە٠ئەوشوێنەدڵگیرەیەکەهەموورۆژێکتیاکۆدەبینەوەبۆخوێندن وفێربوونی هەموجۆرەزانست وزانیارییەك لەبەرئەوەقوتابی هەمووکاتێك بۆچوونە قوتابخانە زۆربەپەرۆشە٠لەقوتابخانەدا دووئامانج دیاریکراوە ، پەروەردە بە پلەی یەکەم دێت ، فێرکردن بەپلەی دووەم دێت٠دایك وباوکیش پێویستەسەردانی قوتابخانەی منداڵەکانیان بکەن وپرسیاری ئاستی منداڵەکانیان بکەن ، چونکەزۆرجاربەرێوەبەرایەتی قوتابخانەقوتابییەك بۆماوەی سێ رۆژلەقوتابخانەدووردەخاتەوە ، ئەوقوتابییەناوێرێ کێشەکەی بۆماڵەوەباس بکات بەوشێوەیەی لەماڵەوەگەیاندووە کەدەچێتەقوتابخانە ، بەلاّم تاتەواوبوونی کاتی قوتابخانەلەدەرەوەدەبێت لەگەڵ منداڵانی شەرانگێزتێکەڵ دەبێت زۆرجاریش کۆتاییەکەی بەچوونەبەندیخانەدێت ، بۆیەزۆرگرینگەدایکان وباوکان سەردانی قوتابخانەی منداڵەکانیان بکەن٠ئەومنداڵانەی کەوادەچنەقوتابخانەفێری ئیلتیزام دەبن٠لەتوێژینەوەیەکی مەیدانی کەقوتابی دکتۆرا (چنارسەعدعەبدوڵا)بەناونیشانی (رۆڵ وکاریگەری سیستەمی پەروەردەلەسەررەهەندی نەتەوەیی لەکۆمەڵگای کوردیدا) لەساڵی (٢٠٠٩) لەبەشی کۆمەڵناسی کۆلیژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین وەك بەشێك لەپێداویستییەکانی بەدەستهێنانی پلەی دکتۆرائەنجامیداوە سەبارەت بەوشوێنەی کەقوتابیان حەزدەکەن زۆرترین کاتی تیابەسەربەرن ٢٧ ٪ ی ئەندامانی نموونەی توێژینەوەکەحەزدەکەن زۆرترین کات لەناوخێزان بەسەربەرن ٢٢ ٪ حەزدەکەن لەقوتابخانەبن ٢٥ ٪ حەزدەکەن لەناوگروپی برادەران

بن٠لەوزانیارییانەبۆمان دەردەكەوێ فوتابخانەلەئاستی حەزووئارەزووی ئەواندانییەبۆیەحەزدەكەن كاتەكانیان لەماڵەوەبە سەربەرن٠

**سێیەم : كۆمەڵگە**

كۆمەڵگائەوشوێنەیە كەمرۆڤ تێیدادەژی ، كەچەندین هۆكارلەخۆدەگرێ وەك : هاورِێ وتەلەفزیۆن و٠٠٠هتد٠كەناڵەكانی ڕاگەیاندنیش بەسەرچاوەی ئەخلاق دەژمێردرێت ، چونكەزۆرجارگوێمان لێدەبێت منداڵێك لەبەكارهێنانی توندوتیژی لاسایی پاڵەوانی فیلمێكی كردۆتەوەیان هەرزەكارێك لەكرداری دزیكردنێك سوودی خراپی لەپلانی فیلمێك وەرگرتووە٠

## ڕۆڵی ئەخلاق لەگەشەسەندنی ئیسلام :-

**چەند نموونەیەك :-**

١ — دەگێرِنەوەجارێكیان پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەیەكێك لەشەقامەكانی شاری مەككەدادەرِۆیشت ، پیرەژنێكی پشت چەماوەی بینی كۆڵێكی گەورەی پێبوو ، پیرەژنەكەچاوی بەپێخەمبەری خواكەوت ، وتی : ڕۆڵەوەرەئەوكۆڵەم بەپشتی دادە٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرمووی : دایەگیان تۆناتوانی ئەوەهەڵگری من بۆتی هەڵدەگرم ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) كۆلەكەی بەپشتی خۆی داداوبەرەوماڵی پیرێژن بەرِێكەوتن كاتێ گەیشتن بەشوێنی مەبەست ، پیرێژنەكە وتی : كورِم دەمەوێ لەبەرامبەرئەوچاكەیەی لەگەڵ منت كردووە ئامۆژگارییەكت بكەم ، دەڵێن پیاوێك پەیدابووە ناوی (محمد)ە بانگەشەی پێخەمبەرایەتی دەكات ، نەكەی بەقسەكانی برِوابكەی وهەڵت خەڵەتێنێ٠لەدوای تەواوبوونی قسەكانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەنەرم ونیانییەوە فەرمووی : دایەگیان ئەوپیاوەی تۆباسی دەكەی ئەوەمنم ، پیرەژنەكەبەشەرمەزارییەوەوتی : چۆن تۆئەوپیاوەی بەزەییت بەمنداهاتەوە لەگەڵ ئەوەش دەزانی من بێباوەرِم ، بێگومان بەرِاستی تۆپێخەمبەری خوای٠

٢ - دەگێرِنەوە صلاح الدینی ئەییوبی بۆرِزگاركردنی شاری نەینەوالەدەست خاچپەرستان هێزێك ئامادەدەكات بۆهێرشكردنە سەرئەوشارە ، لەوكاتەداشاژنی موسڵ دووگیان دەبێ كاتی لەدایك بوونی منداڵەكەش نزیك دەبێ لەكۆشكداهەمووخەمیان دەكەوێتەبەرئەگەرئەوهێرشەی موسوڵمانان بكرێ شاژن سكەكەی لەباربچێ ، بۆیەدایكی پاشابرِیاردەدابچێ بۆلای صلاح الدینی ئەییوبی تكای ئەوەی لێبكابۆئەوەی دوومانگ هێرشەكەی دوابخاتابەسەلامەتی منداڵەكەلەدایك ببێ٠صلاح الدینی ئەییوبیش بەدایكی پا شادەڵێ : ئێمەبۆئەوەنەهاتووین ببینەمایەی ترس وتۆقاندنی ئا فرەتانی دووگیان ولەبارچوونی كۆرپەلەبێگوناهەكانیان برِیارمانداماوەی دوومانگ هێرشەكەمان دوابخەین ، ئەم هەڵوێستەوایكرددوای دوومانگەكەولەدایكبوونی كۆرپەلەكەپاشاودایكی بێنەخزمەت صلاح الدینی ئەییوبی وكلیلی شاری نەینەوای تەسلیم بكەن وخەڵكی ئەوناوچەیەش خۆیان فەرموولەسەركردەی موسوڵمانان بكەن٠

٣ – پیاوێکی بتپەرست بەمەبەستی کوشتنی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) هاتبوو ، ڕۆژێك پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)لەژێرداریك خەوتبوو ، پیاوێك بەسواری ئەسپێکەوەهات ولەلای پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)وەستا٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)بەبیستنی دەنگی پێی ئەسپەکەخەبەری بۆوە ، هەرکەچاوی کردەوەبینی کەشمشێربەسەریەوەدەبریسکێتەوە،پیاوەکەبەسەرپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)هاواری کردووتی: ئێستاکێ دەتوانی ڕزگارت بکات ؟ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)بەئارامی ودڵنیاییەوە فەرمووی : خوا(جل جلاله)٠بت پەرستەکەبەبیستنی ئەم قسەیەڕاچلەکی ودەستی بەلەرزین کردوشمشێرەکەی لەدەستی کەوتەسەرزەوی٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)هەستاوشمشێرەکەی لەدەست گرت وبەبت پەرستەکەی فەرموو : پێم بڵێ کێ دەتوانێ تۆڕزگاربکات ؟ بت پەرستەکەوتی : هیچ کەس٠حەزرەت فەرمووی : وانییەتۆش خوا(جل جلاله)ڕزگارت دەکات٠ئەوساشمشێرەکەی دایەوەدەست بت پەرستەکەوپێی فەرموو : شمشێرەکەبگرەوبڕۆ٠بت پەرستەکەوتەڕێ وپاش ئەوەی چەندهەنگاوێکی نا دووبارەگەڕایەوەوپێخەمبەری لەباوەش کردوبووەموسوڵمان٠

داوێنپاکی :

زیناکردن جۆری هەیە ، زیناکردن لەگەڵ ئافرەتێك کەهاوسەری هەبێت تاوانەکەی گەورەترە لەئافرەتێك کەهاوسەری نەبێت ، نەبێت ، چونکە زیناکردن لەگەڵ ئافرەتێك کەهاوسەری هەبێت وەچەونەوە تێکەڵ ودەشێوێنێت ، هەروەهازیناکردنی پیرێك لەگەڵ گەنجێك جیاوازی هەیە ، چونکە ژیری بەرەوپوخت چووەوحەزوئارەزووی کەم بۆتەوەوتەمەنی بەسەرچووەولەمردن نزیك بۆتەوە٠لەمەسەلەی داوێنپیسیدائەگەرئافرەتی داوێنپیس نەبێت پیاوی داوێنپیسیش وجودی نابێت وبەپێچەوانەوەش ڕاستە٠ کات وشوێنیش ڕۆڵی هەیە، بۆنموونە ئەگەرلەمانگی ڕەمەزان دابێت یاخود لەشاری مەککەی پیرۆزدابکرێت٠ دەتوانین بڵێین لەڕوانگەی تەندروستییەوە بەڕێوەبردنی هۆکارەکانی زیناتاوا نێکە وەك : بەڕێگای ئەنتەرنێت و وێنەودەنگ وفیلمی بەدڕە وشتی وهاندان ووروژاندنی جنس٠هەروەهاخەتەنەکردنی نێرینەخۆپاراستنی زیاترە وهۆیەکەبۆخۆپاراستن ، لەئەنجامی توێژینەوەیەك کەلەکۆسۆمۆ(کینیا)کرادەرکەوتووەکە ٥٣٪ئەوانەی کەخەتەنەکراون کەمترتوشی ئەم نەخۆشییەدەبن ، بەڕێوەبەری نیشتمانی تەندروستی ئەمریکی (ئاتونی فوس) ڕایگەیاندووە کەبیرۆکەی خەتەنەکردن دەتوانێ بمانپارێزێ لەم نەخۆشییە٠هەروەهائازادبوونی (زینا) دەبێتەهۆی کەمبوونەوەی هاوسەرگیری٠

زینادەبێتەهۆی پەیدابوونی جۆرەهانەخۆشی :

ئایدز: بریتییە لەنەخۆشی کەمبوونەوەونەمانی بەرگری لەش زۆربەی تووشبووانیش دەکەونە ئەفریقیا٠ئەم نەخۆشییە بەچە ندرێگەیەك دەگوازرێتەوە:

١ - لەرێگەی خوێن وەرگرتن لەمرۆڤێکی تووشبوو٠

٢ – لەرێگەی زایەند٠

٣- لەدایك بۆکۆرپەلە ، لەرێگەی شیردانەوە٠

سوزەنەك: یەکێکەلەونەخۆشییانەی کەبەهۆی جووتبوونی ناشە رعییەوەتووشی مرۆڤ دەبێ وبریتییەلەسووتانەوەی تیژی ئەوپە ردە لینجە کەلولە ورێچکەی میزدادەپۆشێت ، کەبەهۆی میکرۆبێکەوەپەیدادەبێت پێی دەڵێن (گۆنۆکوکەس)٠

لەسزای داوێنپیسی دا تەنها ئەوئەندامەی بەکاریهێناوەسزای بەرناکەوێت ، واتاداوێنی نابڕدرێت وەکودزدەستی دەبڕدرێت ، چونکە:

١ - داوێن وعەورەت ئەندامێکی داپۆشراوە ، بەبڕینی نابێتە عیبرەت کەخەڵك بەبینینی دەرس وعیبرەتی لێ وەرگرن ، چونکە عەورەت وداوێن داپۆشراوەونابینرێن٠

٢ - داوێن وعەورەت تەنها یەك دانەیە،چونکە ئەگەردزدەستی بڕ ا ، ئەوا دەستێکی تری هەیە کاری پێبکات ، هەروەکولەتاوا نی( بوختان) یش کەلەم تاوانەدا زمانی بەکارهێناوە زمانی نابڕدرێت، چونکە زمان تەنهایەك دانەیە بەبڕینی هیچی ترنییە کاری ئەوبکاتەوە٠

٣ - چێژی زینا هەمووجەستەی گرتۆتەوە٠

لەبارەی قسەکردن :

زمان پارچەگۆشتێکە ، یەکەم ئامرازەبۆدەربڕینی هەستی دەروو ن وقسەکردن ، وەیەکەم هۆیەبۆخواردن وقووت دان وچەشتنی خۆراك ، مرۆڤ دەتوانێ لەرێی زمانەوەجۆراوجۆری تامی خواردن بناسێ٠قسەی خراپ ژیان بەرەوتێکدان دەبات وەکوبوختان ودووزمانی وهتد٠زۆرجارمرۆڤ بەیەك قسەخۆی توشی بەڵایەکی گەورەدەکات٠جاری وایەمرۆڤ قسەیەك دەکات هیچ گرینگی پێنادات٠

شاعیردەڵێ :

احفظ لسانك ایهاالانسان
لایلدعنك انه ثعبان
کم في المقابرمن قتیل لسانه

واتا : زمانت بپارێزەئەی ئینسان
باپێتەوەنەداچونکەزمان مارەوپێوەدانی هەیە
چەندەهاکەس لەگۆڕستانەکان کوژراوی زمانن

(الكلام صفه المتكلم)واتا: واتاقسه سیفەت وخوڕەوشتی قسەکەرد ەگەیەنی ، کەواتە مرۆڤ دەبێ زۆر وریابێ هەرکاتێ ویستی قسە بکات لەپێش دالەقسەکەی وردبێتەوە ئینجابیکات هەروەهاقسە نەخاتە ناوبە ینی قسەی خەڵکی هەروەهابەئارامی ولەسەرخۆیی قسەبکات و بەلەفزێکی سادەوساکاربیکات،هەروەهائەگەرشتێکیان لەیەکێ پرسی ئەوزووجواب نەداتەوە هەروەهالەکاتی موجادە هەروەهاپێویستە مرۆڤ لەکاتی قسەکردن ڕووی بکاتە کەسەکە ، لە(عەمری کوڕی عاس)(خوای لێ ڕازی بێ)دەگێڕنەوەکەوا وتوو یەتی: پێخەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەربێ)کاتێ قسەی کر دباڕووی دەکردە خراپترین کەسیش ، هەروەها (درودی خوای لە سەربێ) فەرموویەتی:(لاتسبواالاموات فتؤذوابە الا حیاء) واتا: (جنێوبەمردوان مەدەن،دڵی زیندوان پێ دەڕەنجێنن) رواە طبرانی تەنانەت کەسێك جنێوبەخوای بێباوەڕەکان بدات ، پەنابەخوا ئەوانیش جنێوبەخوای تاك وتەنیابدەن : (ولاتسبواالذین یدعون من دون الله فیسبو االله ) الانعام.

(کامیل) دەڵێ :(گوێبیستی هەروتەیەکی جوان بم وەری دەگرم گرینگ نییەبۆم خاوەنەکەی کێیە). وەوتراوە : (کلام الملوك ملوك الکلام) واتا : (قسەی پاشایان پاشای قسانە). هەندێ منداڵی بێباوەڕە لەدنیا دەرچووەکان موسوڵمان بووبوون ، وەك: (عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل)بەلاّم موسوڵمانان قسەیان بە ئەبوجەهل وئەوانی دیکە دەوت دڵی نەوەکانیان پێ دەڕەنجاند، بۆیە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : (جنێوبەمردووان مەدەن دڵی زیندووەکان پێدەڕەنجێنن) هەروەها فەرمو ویەتی:(لەگوناهەگەورەکان ئەوەیەیەکێك جنێوبەدایك وباوکی بدات، هاوەڵەکانی وتیان: ئەی پێخەمبەری خوا(درودی خوای لەسەربێ)پیاوجنێوبەدایك وباوکی خۆی دەدات؟ فەرمووی : بەڵێ، پیاوجنێوبە باوکی یەکێك دەدات، ئەویش جنێوبەبا وکی ئەودەدات، جنێوبەدایکی دەدات ئەویش جنێوبەدایکی ئەودەدات) متفق علیە. باسکردنی ئافرەت ، وەك : باسکردنی (جووتبوون)خاوەنەکەی لەبەرچاوی خەڵك نزم دەکاتەوە. هەروەها ناکرێت بەبێ وتنی ناونیشانی وەزیفی ، یان زانستی یان پیشەیی بانگی کەسەکان بکەین ، واتاکەسێك کەدکتۆربێت یان مامۆستا بێت بە تەنیاناوی کەسەکە بڵێین ، کاتێك کەسەکان بەناوی خۆیان بانگ دەکرێن هەستیان بریندارەدکرێت. خوای گەورەفەرموویەتی : (لاتجعلوا دعاء الرسول کدعاء بعضکم بعضا ) النور : ٦٣ واتا : (ئەی موسوڵمانینە بانگکردن لەپێخەمبەروەك بانگکردن لەخۆتان دامەنێن) (یاخود بەناوی خۆیەوە بانگی مەکەن وەك ئێوە یەکتر ی بانگ دەکەن ، بەڵکوبڵێن ئەی پێخەمبەری خوا ، پێخەمبەر(د رودی خوای لەسەربێ) بەپەیامەکەی بانگ دەکرێت وناوی ناوی هێنرێت. هەروەها شایستەنییەپرسیارلەکەسانێکی تربکەیت بەمەبەستی دەرخستنی نەزانینیان چونکەئەگەرکەسێك ئەم ڕەوشتەی هەبێت هەوڵدەدات لەڕێزی بەرامبەرەکەی کەمبکاتە وە وبیشکێنێت ، هەندێك جارکەسی پرسیارکەروەلاّمەکەی لاهە یە دەیەوێت بەم پرسیارکردنە کەسی پرسیارلێکراودەسەوسان بکات ئەمەش نابەجێیەوجوان نییە. هەروەها قسەکردن بەلایەکی دەم ، یان وەلاّم نەدانەوە ، هەروەها قسەکردن

بەچپەکاتێك زیادلەدووکەس بن شایستە نییەلەکەسانی ئامادە بووبشار نەوە کاریگەری زیانبەخش لەدەروونی کەسانی تردادروست دەکات ، هەروەهاقسەکردن بەزمانێکی ترکەهەرخۆیان لێی تێبگەن بەهەمان شت دادەنرێت٠هەروەهاقسەکانی مرۆڤ پارێزراون ئەوەیەکلابۆتەوە کەئەوشەپۆلانەی دەنگی مرۆڤیان هەلگرتووە دەمێننەوەبەهەتاهەتایی دەبن ولەناوناچن ، زانایان پێیان وایەئامێرێك دەبێت کەدەنگی سەردەمانی پێشووبێنێتەوە،دەکرێت دەنگی مێژووی هەرسەردەمێك بەهەموودەنگەکانییەوەببیسترێت٠هەروەهازانستی سەردەم جەخت لەوەدەکاتەوەهەمووئەوکارانەی لەڕووناکی یان تاریکی دەیانکەین لەباری وێنەگرتندان ، هەمووجولەیەکمان لەسەرشاشەی بوون تۆمارکراوە چونکەزیاترلەچیرۆکی تۆمارکراوی ناوستۆدیۆدەچێت٠ژنانیش زۆرترلەپیاوان قسەدەکەن ئەگەرسەیربکەین بۆنموونەلەڕێی داواکردنی سۆندەیەکی ئاوەوەماوەیەکی زۆرپێکەوەدەوەستن بەباسکردنی ئەم وئەوەوەخەریك دەبن٠

قسەکردن بەچرپە :

کاتێك دووکەس چرپەچرپیان کردکەسی سێیەم هەست دەکات کەسێکی نەخوازراوەووای بۆدەچێت باسی ئەودەکەن٠(م د) دەڵێ : من لەبەرئەوەی کەپیشەم مامۆستایەکەدەچمەپۆلەوەفوتابییەکانم بەچرپەقسەدەکەن زۆرم پێناخۆشەواهەست دەکەم باسی من دەکەن٠(ه)کەکارمەندی یەکێك لەدەزگاکانەدەڵێ : ڕەنگەئەوقسانەی کەدووکەس دەیکەن پێویست نەکات کەسی سێیەم بیزانێت ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا باشترەلەشوێنێکی ترئەوقسانەبکەن تاکوکەسی سێیەم هەستی بریندارنەبێت٠(ب) دەڵێ : کاتێك سێ هاوڕێن دوانیان قسەبۆیەك دەکەن شتێکی زۆربێزارکەرە من بۆخۆم وادەزانم باسی من دەکەن٠(ش)دەڵێ : ئاینی ئیسلام نەهی لەقسەکردن بەچرپەکردووە٠مامۆستا(نا ئە)کەوتاربێژی مزگەوتێکەدەڵێ : دیارەلەهەمووکاتێکداواباشترەقسەکردن بەئاشکرابێت ، بەلام هەندێ قسەهەیەوەك باسکردنی نەخۆش واپێویست دەکات نەخۆشەکەنەیزانێت (لەشوێنێکی تربیکەن) ، بەلام بەشێوەیەکی گشتی ئاینی ئیسلام قسەکردنی بەچرپەی حەرام کردووە ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)دەفەرمووێ:(هەرکەسێك ئیمانی بەخواوبەڕۆژی دوایی هەیە،ئەگەرسێ کەس بوون بادووانیان قسەنەکەن کەکەسی سێیەم بەشداری پێنەکات چونکەدەبێتەهۆی خەفەتدان بەکەسی سێیەم)٠

نەرم ونیانی :

بۆنموونەئەگەرلایەنی کڕین وفرۆشتن وەربگرین بەگشتی ئەگەرسەیربکەین کەسی فرۆشیارلەسوپەرمارکێت ومۆڵەکان دوورلەتوڕەیی وگرژی وقسەڕەقین٠تەنانەت ئەگەرئەوکەسانەی سەردانیان دەکەن ئەگەرکەل وپەل وشت ومەکەکانیشیان نەکڕن دوورلەتوڕەیی وگرژی وقسەڕەقین ، بەلام لەناوەندەکانی تری فرۆشتن زۆرجارلەئەگەری نەکڕینی کەل وپەل وشت ومەك قسەی ناخۆش وقسەی ڕەقیان پێوەدیارەدەڵێ : مادەم

ناکڕی موشتەری نی بۆچی کالاَکان تێکدەدەی ؟ وەك ئەوەی کەتۆشتێك تاقی بکەیتەوە وەیان سەیری بکەی هەرئەبێ بیکڕی ، بەلاَم لەمۆڵەکان وسوپەرمارکێتەکان فرۆشیاربەدڵخۆشی ولێبوردەییەوەپێشوازی کرپاردەکات ئەمەش ڕاکێشانی کرپارە ، بەلاَم خراپی هەڵسوکەوت وقسەڕەقی نیشانەی نازیرەکی فرۆشیارنیشاندەدات وڕەواندنەوەی موشتەرییە وژمارەی موشتەرییەکان کەم دەبنەوە٠چونکەئەگەرکەسێك بەڕەقی مامەڵەی لەگەڵ کرابێ لەلایەن دوکاندارێکەوەهەرگیزجارێکی ترئامادەنییەڕووبکاتەئەوشوێنە٠(ب س) دەڵێ: سوپەرمارکێتەکان شوێنەکەی فێنکەوبەرواری کەل وپەلەکان بەسەرنەچووە٠

**کەمدویی :**

کەمدویی یەکێکەلەوسیفەتانەی کەوامرۆڤەکان لەڕووی قسەکردنەوەلەسەری پێوانەدەکرێن ، بەلاَم لەزۆرگوتن باشترە ، چونکەوەك هەمووومان دەزانین مرۆڤ تازیاتربلێت زیاترهەڵەدەکات ، بۆکەسانی کەمدوش هەندێ ئیدیەم هەیە وەك:زمانی لەدەمدانییە٠شەکرێك بشکێنە٠کەمدویی هەندێ جارڕەنگەنیشانەی بێزاری وخەمباری بێ٠

**دەنگ بەرزکردنەوە :**

بەرزکردنەوەی دەنگ لەکاتی ئاخاوتنداشتێکی ناپەسندە ، بەتایبەتی ئەگەردەنگ بەسەرکەسێکی گەورەترلەڕووی تەمەن وپلەوپایەبەرزبکرێتەوە ، ئەوادەچێتەخانەی بێ ڕێزی کردنەوە٠ئەگەرچی ئاخاوتن بەدەنگی بەرزپەسندنییە ، دەنگی زۆرنزمیش بەرامبەرلێی حالی نابێ٠

**بوختان :**

(ئا)باوەڕی وایەبوختان پەیوەندی بەنەبوونی هۆشیارییەوەهەیەئەوانەی کەقسەی لەم جۆرەدەکەن ئەوکەسانەن کەڕۆشەنبیرییاننییە٠(م)دەڵێ : هاوڕێکەم یەکەم کەس بووبوختانی بۆکردم لای دووهاوڕێی دیکەم حەیای بردم تەنیالەبەرئەوەی ڕۆژێکیان لەنزیك پەیمانگالەگەڵ (س)ی برازام سواری ئۆتۆمبیل بووم٠(ت)دەڵێ : زمان شیرینی وجوانییەکەم قوریان کردبەسەرما ، چونکەکۆمەڵگاکەمان کۆمەڵگای بوختان ووتی وتیە٠

**لەبارەی ڕێزگرتن :**

یەکێکەلەوبەهاکۆمەلاَیەتییانەی کەدەبێتەهۆی بەختەوەری خەڵك وبەرزبوونەوەی ئاستی ڕێزی خۆشی لای خەڵکی٠هۆکارێکی کاریگەرەبۆدرێژەدان بەپەیوەندییەکۆمەلاَیەتییەکان٠

ڕێزگرتن شتێکی بنچینەییەلەئەخلاقدا ، مرۆڤ ناچارنییە هەمووکەسێکی خۆشبوێ ، بەلاَم ناچارەڕێزلەهەمووکەسێك بگرێ٠مرۆڤ کەڕێزلەکەسانی تردەگرێ واتاڕێزلەخۆی دەنێ ، وەڕێزگرتن دەبێ

دوولایەن بێ بۆنموونەئەگەر(ئەلیف) کەسێك بێ و(با)کەسێکی تردەبێ ڕێزگرتن لەئەلیفەوەبڕوات بۆباولەبائەوەبڕوات بۆئەلیف٠قورئان وگشت کتێبەپیرۆزەکان دژی بێڕێزین قورئانی پیرۆزدەفەرمووێ : (ولقدکرمنابنی ادم)٠لەناوپاسداکەئافرەتێك دێت یەکێك جێگەکەی بۆچۆل دەکات٠ئەمەئەگەرمندالی پێبێت، نەخۆش بێت ، یاخودلەبەرئەوەبێت لاشەی پیاووژن بەریەك نەکەوێت قەیناکە ، بەلام ئەگەربۆئەوەبێت کچ بەپێوەنەوەستێ ژن ئادەمیزادێکەوەکوتۆدەتوانێ (١٠)دە دەقیقە بەپێوەبوەستێت٠ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(اکرموا الخبز الخ)واتا: (ڕێزی نان بگرن)(نان سەرچاوەوهۆکاری ژیانە ، مرۆڤ کاتێك پارچەنانێك لەکۆلانێ دەبینێ هەلێگرێتەوەوبیخاتەلایەك داینێ٠نابێت چێشت زیاد لەژمارەی خێزان لێبنرێت ، بۆنموونەئەگەرخێزانێك پێنج کەس بن نابێ خواردنی دەکەس دروست بکرێت ئەوەی تربەشی زبلدان بێت٠نموونەیەکتان بۆدەگێڕمەوە : لەسالی (١٩١٤ — ١٩١٨) کەلەوماوەیەجەنگی یەکەمی جیهانی ڕوویدا زۆربەی ولاتانی گۆی زەوی گرتەوە٠ئەم شەڕەکۆمەلێك دەرەنجامی ترسناکی لێکەوتەوە ، یەکێك لەودەرەنجامە ترسناکانە بلاوبوونەوەی برسییەتی وقات وقڕی بوو بەتایبەتی لەعیراق ولوبنان٠ئافرەتێکی لوبنانی لەیاداشتنامەکەیدا دەلێ:بەیانییەك لەبالەخانەی خانووەکەمدا وەستابووم چاوم بەمندالێك کەوتبۆخواردن تەنەکەزبلەکان دەگەڕا٠داوام لەخوشکەکەم کرد منالەکەبهێنێتەژوورەوە خواردنمان بۆدانا وەکودڕندە پەلاماری سەرسفرەکەی داوهیچی لەسەرنەهێشت ، ئەوندەی خواردتووشی سکئێشان بوو)٠(ئەبوتەلعە) بەرلەوەی موسولمان ببێ خوازبینی (ام سلمی)ی کرد ، (ام سلمی) گوتی :(لەڕاستی دا حەزدەکەم تۆپیاوێکی ڕەت ناکرێیتەوە ، بەلام تۆپیاوێکی بێباوەڕی ، منیش ژنێکی موسو لمانم بۆم دروست نییە شووت پێبکەم ، ئەگەرموسولمان ببی ئەوەمارەیی منە) ، چووەخزمەت پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)وموسولمان بوو٠ (وینەدایەر)دەلێ : (ئەوەخۆتی کەسانی ترفێردەکەی کەچۆن ڕەفتارت لەگەل بکەن ) هەروەها(ئادەم سمیث) دەلێ : (هەر چەندە ڕێزلەکەسانی دیکەبگری ، بۆخۆت حورمەتت بەدە ستهێناوە)٠

پێکەنین :

پێکەنین دەشێ بۆدەربڕینی خۆشی بێ ، بەلام هەندێ جاربۆسوکایەتیکردن بەگوێگربەکاردێ٠ئەم پێکەنینەش بەزۆری بەدەنگی بەرزدەبێت٠پێکەنین چێژوخۆشی تێدایە ، هەندێك جارپێکەنین لەغەمەکانی مرۆڤ کەم دەکاتەوە٠هۆیەکانی پێکەنین :-

١ — لەئەنجامی قسەکردنی کەسێك٠

٢ — لەئەنجامی بینینی ڕووداوێك٠

پێکەنین ئەوەدەردەخات ، ئەوکەسەکەسێکی دلخۆشە ، کەسێکی کراوەیە حەزبەهاوڕێیەتی دەکات ، حەزبەگفتوگۆدەکات لەگەل بەرامبەردا٠زەردەخەنەش زۆربەی کات بەواتای خۆشی وشادی دێت ، بەلام زەردەخەنەی ئافرەت ئەگەرڕەگەزی خۆی نەبێ کارەساتە٠(ئا ق) دەلێ : ((زۆرجارپیاوی ڕووخۆش

بەنوکتەوقسەی خۆش دەبنەجێگای سەرنج ڕاکێشان ، بەلاّم خاوەن قسەخۆشەکان هیچ کات جێگای باوەڕپێکردن نین کەزۆربەی ژنان بەکەسایەتییەکەیان هەلّدەخەلّەتێن ، بەقسەخۆش وبێماناکان وات لێدەکات تۆبەپێکەنین بێنیّ ، بەلاّم لەدواییداهەمووشتێك بەگریان وهات وهاوارکۆتایی دێ))٠(ك)دەلّیّ : پێکەنینی کچان وروژێنەرەکاتێك کچێك پێدەکەنیّ وادەکات سەرنجی بەرامبەرەکەی بۆخۆی ڕابکێشیّ٠(ه)دەلّیّ : پێکەنینی ئێمەزۆرجاربەئەنقەستەبۆئەوەیەسەرنجی کوران بۆلای خۆمان ڕابکێشین٠(د)دەلّیّ : کاتێك کچێك دەبینم بەزەردەخەنەوەپێدەکەنیّ وادەزانم لەگەلّ من پێدەکەنیّ دلّم زۆرخۆش دەبیّ ، ئەگەربۆم بکریّ منیش لەگەلّی پێدەکەنمەوەئاماژەی دەدەمیّ! (ب)دەلّیّ : پێکەنین خۆجوانکردنەبۆدەم وچاو٠(ئا)دەلّیّ : زۆرجارهەست بەودیاردەیەدەکەم دەبینم کچێك بەبیّ ئەوەی هیچ شتێك ڕوویدابیّ هەرلەخۆیەوەپێدەکەنیّ بەتایبەتیش لەناوبازاڕیان شوێنەگشتییەکان ، ڕۆژێك لەبازاڕکچێك بەکوڕێك پێکەنی دیتم کوڕەکەلەدەوری کچەکەدەسوڕایەوەدەیویست قسەی لەگەلّدابکات٠

### گوێگرتن :

بریتییەلەگرینگیدانی گوێگربەقسەکەر٠پێویستەگوێگرئاڕاستەی ڕووی لەقسەکەربێت وگوتنی دەستەواژەی وەك : وایە٠گوێم لێیەتێدەگەم٠ڕاستدەکەی٠گرینگیدان بەقسەکەرلەکاتی قسەکردندا ڕێزگرتنە٠کاتێك قسەدەکەین حەزدەکەین خەلّك گوێمان لێبگریّ، چونکەبەوەهەست بەمتمانەوڕێزی خۆمان دەکەین ، بۆیەدەبیّ‌تەماشای دەم وچاوی ئەوکەسەبکەین کەقسەدەکات بۆئەوەی بزانیّ ئاگاداری ئەوی کەقسەدەکات وڕێزی لێدەنێی وگرینگی پێدەدەی ، دوای ئەوەی کەتەماشای چاوی ئەوکەسەت کردکەقسەت بۆدەکات پێویستەئارام بگریت وچاوەڕیّ بکەی وقسەی پێنەبڕی ، چونکەقسەپێبڕین بابەتەکەلەبیرکەسی قسەکەردەباتەوەیان کەسەکەئیعراج دەبیّ٠

### سوپاسکردن :

یەکیّ لەووشەسادەوجوانانەی کەمرۆڤ حەزی لێیەگوێبیستی بیّ وشەی سوپاسە ، چونکەجۆرێك لەئارامی دەروونی پێدەبەخشیّ هەست بەگرینگی خۆی دەکات لەناوکۆمەلّدا٠واتاکاتێك کەسێك چاکەیەکت لەگەلّ دەکات یاخودهاوکارییەکت پێشکەش دەکات سادەترین وەلاّمی ئەوچاکەیەوەیان ئەوهاوکارییەبەکارهێنانیوشەی سوپاسەبەرامبەربەوکەسە٠بەلاّم ئەگەرهاتووکەسێك کاری چاکەی کردوسوپاس نەکرایان دەستخۆشی لێنەکرالەوانەیەئەوکەسەتوشی ساردبوونەوەبێت٠لەقورئانی پیرۆزداشوکرانەبژێری (سوپاسگوزاری)کەهەندێك جارئێمەواتێگەیشتووین تەنهاوتەیەکەبەدەم دەوترێت بۆنموونەلەشێوەزاری سلێمانیداشوکرزۆربەکاردیّ لەکاتی چاك وچۆنیدادەوترێت : (شوکرباشی) ، بەلّکودەبێت لەژیانی کرداریش سوپاسگوزاری خوای گەورەبکەین ، کەبریتییەلەهەستکردن بەنیعمەتەکانی

خوای پەروەردگار٠سوپاسگوزاری یەکەم بەرامبەرخوای گەورە ، دووەم بەرامبەربەدەورووبەر٠ئەگەرسەیربکەین چەندین جارئەم سیفەتەلەقورئانی پیرۆزداهاتووە : (لعلکم تشکرون) المائدة : ٦ مرۆڤ ئەگەرشتێکی دەستکەوت دەڵێ : (الحمدلله) (خوایەسوپاس بۆتۆ) ، بەلاَم ئەگەرمرۆڤ بەلآشی بەسەرداهات هەرسوپاسی خوای گەورەبکات٠لەنوێژداله سەرەتای سورەتی (فاتیحە) دەڵێین (الحمدللەرب العالمین) بۆیەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (نوێژکۆڵەکەی دینە(الصلاة عمادالدین) بکەوی کەبەجێی نەهێنا یان ئەوەی ئەوکۆڵەگەی ڕووخاندئاینەکەی لەسەرچی بوەستێت ؟ بۆیەنوێژپێش ئەوەی هەرشتێك بێ شوکرانەبژێرییە بۆخوای پەروەردگار٠

**لەبارەی لەبەرهەڵسان :**

ئەم بابەتەکێشەی زۆری لەسەرە،لەزۆردیوەخان وکۆشکی پاشاکان ئەم شێوازەبوونی هەبووە ، کەگەورەکەیان دانیشتووەوئەوانی تر وەستاون ، پێخەمبەر(درروودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو : (لاتقوموکماتقوم الاعاجم) واتا: (لەبەرم هەڵمەستن وەکوچۆن عەجەمەکان لەبەرگەورەکانیان هەڵدەستنەوە) ، هەروەهافەرموو یەتی:(انماهلك من کان قبلکم بانهم عضموا ملوکهم بأن قاموا هم قعودا) واتا :(خەڵکی پێش ئێوە خۆیان دادەنیشتن ودەوروبە ریان دەبوایە بوەستن)٠هەروەهافەرموویەتی:(هەرکەسێ پێی خۆشبێ خەڵك لەبەری هەڵسنەوەدۆزەخییە)(ئەمەش وەك ئەوەی خۆی بەگەورەبزانێ)، بەلاَم کاتێ(سەعدی کوڕی مەعاز)هاتەلای پێخەمبەر(درروودی خوای لەسەربێ) ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی بەئامادە بووان کرد لەبەری هەڵسن(قوموالی سیدکم اوخیرکم)، هەروەها لەسەحیحی موسلیم داهاتووە : (جەنازەیەك تێپەڕی پێخەمبەر(درروودی خوای لەسەربێ) لەبەری هەڵسا ئێمەش هە ستاین ووتمان : ئەی پێخەمبەری خوائەمەئافرەتێکی جوولەکەیە ، فەرمووی: (کاتێ تەرمتاندیت هەڵسن لەبەری)٠هەروەهالەکاتی هاتنی میوان بۆنواندنی ڕێزهەستان لەبەرمیوانەکەودابینکردنی شوێنی گونجاوبۆی ڕێزە٠

**دەستپاکی :**

سپاردە (ئەمانەت) : بریتییەلەئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەتی ودانەوەی ماف بۆخاوەن ماف٠جائەومافەماددی بێ یان مەعنەوی ، ئاشکرابێ یان نهێنی ، تایبەتی بێ یان گشتی٠مەبەست لەئەمانەت هەمووبەرپرسیارییەتییەکە کەمرۆڤ هەڵیدەگرێت ، نهێنی ئەمانەتە ، سپاردە ئەمانەتە ، ئەمانەت تەنها بریتی نییە لەسپاردەکان لەڕاستی دا سپاردە تەنیا جۆر ێکی ئەمانەتە٠ پێخەمبەر(درروودی خوای لەسەربێ) فەرموویە تی:(هەرکەس دۆزراوەیەك لای خۆی گڵبداتەوەهەتابانگەوازی بۆنەکات بەگومڕادادەنرێت)موسلیم ڕیوایەتی کردووە٠

لەبارەی شتی دۆزراوە ، هەلگرتنەوەی باشترە ، چونکەلەوانەیە کەسێك هەڵی گرێتەوەدەستپاك نەبێت وبۆخۆی بیبات ، کەسێك وەك خۆی وەسفی کردبۆی دەگێڕدرێتەوەوەك باسکردنی سیفەت وژمارەکەی ئەگەرپارەبوویان ئەگەرژمارەکەشی نەدەزانی، بەلأم جانتاکەی زانی(واباشترە هەمیشە ژمارەی تەلەفۆن ناوجانتاکەت هەبێت)٠دەربارەی حوکمی (دۆزراوە) دوای ساڵێك ، دووڕاهەیە:

بەڕای ئیمامی( شافیعی) دەبێتە مولکی خۆی، بەلأم بەڕای ئیما می (ئەبوحەنیفە)بۆی هەیە بیکاتە خێرنابێ بۆخۆی بەکاری بێنێت ، ئەگەردوای ساڵێك خاوەنەکەی پەیدابووبەڕای هەندێك قەرەبووبکرێتەوە ، بەلأم بەڕای هەندێکی ترقەرەبووناکرێتەوە، چونکەبۆتە مولکی خۆی٠ خوای گەورە لەسوڕەتی (ال عمران) ئایەتی (٧٥) باسی گاوروجولەکەکانمان بۆدەکات:(ومن أهل الكتب من ان تأمنه بقنطار يؤده اليك الخ) واتا : (دەستەیەك لەئەهلی کتاب هەن ، ئەگەرماڵ ودارایيەکی زۆریان بەئەمانەت لادانێیت (هەرکاتێك داوابکەیت) بەبێ خیانەت بۆت دەگەڕێنێتە وە ، هەشیانە ئەگەردینارێکی لادانێیت بۆت ناگێریتەوە ، مەگەر بەسەریەوە وەستابی ووازلەمافی خۆت نەهێنیت)٠

تەحسین حەمەغەریب لەکتێبەکەی دا : (ئەخلاقناسی) ، دەڵێ : (هەمووپیشەیەك دوودیوی هەیە ، دووڕەهەندی هەیە ، ڕەهەند یێکی بریتییە لەشارەزایی لەوپیشەیە ، دووەم مامەڵەی ئەخلاقیا نە لەگەڵ ئەوپیشەیە ، بۆنموونە : خەیاتێك بۆئەوەی خەیاتی بکات پێویستی بەدووشت هەیە : یەکێکیان بریتییە لەوەی لەخەیاتی داشارەزابێت ، دووەمیان ئەوەیە مامەڵەی ئەخلاقیانە لەگەڵ پیشەکەی خۆی دابکات ، واتائەگەرخەیاتێك بازۆرشارەزابێت ، بەلأم ئەگەرقوماشی خەڵکی بدزێت ، ئەمە بۆهەمووپیشەیەك ئەوهایە) ، هەروەها دەڵێت : قوتابییەك چوارساڵ یان شەش ساڵ دەخوێنێت (بەپێی کۆلیژە کان) ، دوایی سوێندێکیان دەدەن لەکاتی دەرچوون (تەخەڕوج)دا ، ئەوەدیوی ئەخلاقەکەیەتی سوێندیان دەدەن کەخیانەت لەوزا نستە نەکەن ، چونکەهەرچەندە شارەزایی هەبێت ، ئەگەرخاوەن ئەخلاق نەبێت ، چونکەهەرچی شارەزایی زۆرتربێت باشتردەزا نێت دزی بکات وخەڵکی پێی نەزانن٠ لەکاتی هەڵبژاردنەکانی ئەمریکادا ، ئەمریکییەك هەڵسایەوەبەئۆبامای وت : (ئێمە بۆیە تۆهەڵنابژێرین زیرەکی ، بەڵکوبۆیەهەڵتدەبژێرین ئەمین وده ستپاکی)٠

**هاوڕێیەتی :**

ئاشکرایە مرۆڤ ناتوانێ بەتەنیابژی ، بۆیەژیان بێ هاوڕێ وهاودەم ناچێتەسەر٠پێشگری (هاو) لەزۆروشەداهەیە کەبەمانای هاوبەشی دووکەس یان زیاتر ، وەکو : هاوشێوە ، هاوبیر ، هاوژین ، هاوکار ، هاوولأتی ، هاوڕێ ، ٠٠٠هتد (هاوڕێ) ش واتادۆست و برادەر٠بەهۆی هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسانی خراپ ، ڕێ نیشاندانیان بۆشوێنی خراپ ، ئەنجامدانی تاوانی جۆراوجۆر وەك : قومارکردن ومەی خواردنەوەوداوێنپیسی وچەندەهاتاوانی تربۆتە هۆی گۆشەی زیندان وبەسەربردنی ڕۆژگارێکی

دوورودرێژلەگۆشەی زیندان بەداخ وپەژارەوەرۆژەکانی بەسەردەبات٠بەتایبەتی لەرۆژ گارێکی وەکوئەمرۆئەوپەڕی فەسادوبەدئەخلاقی٠ هەندێ لەزانایان هاوڕێیان بۆسێ جۆرپۆلێن کردووە:

یەکەم: بۆسودوەرگرتن

دووەم: بۆچێژوەرگرتن

سێیەم: چاکەخواز

نەریتێکی جوانەکەپیاوپارەی خواردن وخواردنەوەی هاوڕێکەی دەدات لەچێشتخانەیان چایەخانە ، عەلی وەردی دەڵێ : ئەونەریتەلەشێوەزاری بەغدایی بە(الویر)ناسراوە واتائەگەرکەسێك بچێتەچایخانەچای بۆبێت یەکێك لەهاوڕێکانی کەلەوێ دانیشتووە بانگ دەکات (وێر)مەبەستی ئەوەیەپارەی چایەکەلەسەرحیسابی ئەوبێت٠زۆرجارپێشبڕکێ لەنێوان دووهاوڕێ دەبێت لەسەردانی پارەی چایان خواردن یان لوناوپاس هەتائێستاش خەڵك پابەندن بەودیاردەیە٠عەلی کوڕی ئەبی تالب(خوای لێ ڕازی بێ)،دەڵێ:(دۆستەکانت سێن ودوژمنەکانیشت سێن) ، دۆستەکانت بریتین لە : دۆستی خۆت ، دۆستی دۆستت ، دوژمنی دۆستت) ، دوژمنەکانیشت بریتین لە :(دوژمنی خۆت ، دوژمنی دۆستت ، دۆستی دوژمنت)٠

جیاوازیش هەیەلەوەی کەسێك دەیناسیت ، لەوەی هاوڕێت بێت ، بەگشت هەمووکەسێك بناسیت باشە ، کێ دەڵی بەرزناکرێتەوەو هێزی ناکەوێتە دەست کەهەرحیسابیشی بۆنەکراوە٠پیاوی ژیر ئەوکەسەیە نهێنی خۆی لای کەس نادرکێنێ ، لەبێ توانابییە کە سێك نهێنی خۆی لای هاوڕێکەی بدرکێنی ، چونکە دوورنییە ها وڕێکەت لێت هەڵبگەڕێتەوەکەئاگاداری نهێنییەکانە وزیانی زیاتر بێت٠ هەروەها لەڕۆژی دوایی ئەوکەسەی هاوڕێیەتی پیاوی خراپ دەکات دەڵێت : (یاویلتي لم اتخذ فلانا خليلا) الفرقان: ٢٨ واتا : (خۆزگە فلانە کەسم نەکردبا هاوەڵ ودۆستی خۆم ) ، هەروەها پێویستەتاك پابەندبێت بەوادەکان لەگەڵ هاوڕێکەی ، وەخۆی سەرقاڵ بکات بەکێشەی هاوڕێکەی وهاوڕێی باش ئەوکە سەیە سوودببەخشێ بەهاوڕێکەی زیاترلەوەی سوودمەندبێت لە هاوڕێکەی٠ پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ) ، فەرموویەتی: (المؤمن مراة المؤمن ، والمؤمن أخوالمؤمن) رواه ابوداودواتا: (بڕوادارئاوێنەی بڕوادارە ، بڕوادار برای بڕوادارە)

ئاوێنە سێ جۆرە:

١ - ئاوێنەی قۆقز: ئەم جۆرەئاوێنەیە وێنەبچووك دەکات ، بۆ ئۆتۆمبیل بەکاردێت بۆئەوەی وێنەی پشتەوەی خۆیان بە شێوەیەکی بچوککراوە ببینن٠

٢ - ئاوێنەی قووڵ: ئەم جۆرەیان وێنەگەورەدەکات ، لەسەرتاشخا نەکان سوودی لێ وەردەگیرێ٠

٣ - ئاوێنەی تەخت: ئەم جۆرەیان وێنە نەگەورەدەکات ونەبچوو کیشی دەکات، بەڵکووەکوخۆی پیشانی دەدات٠مەبەست ئاوێنە ی(تەخت)ە نەك(قۆقز)و(قووڵ) ، ئاوێنەوشەیەکی لێکدراوە ،(ئاو)و(وێنە) ، ئەمەش ئەوەدەگەیەنێت کەئاوێنە وەك ئاوی ڕوون وێنەوەك خۆی پیشان دەدات، هۆکاری بەکارهێنانی ئەم

زاراوەیەئەوەیەکەمرۆڤ بۆیەکەمجاروێنەی خۆی لەئاودا بینیوەکەبەعەرەبی پێی دەوترێ(المراة) ، ئاوێنەی(قۆقز)و(قوولێ)بەکەڵکی هاوڕێیەتی نایەن، چونکە ڕا ستییەکانت لێ دەشێوێنن هەروەهائاوێنەپێویستەپاکبکرێتەوە ، تەپ وتۆزی لەسەرلابرێت،(هاوڕێ)ش دەبێ هاوڕێی خۆی پاك بکاتەوە لەخوڕەوشتی خراپ٠هەروەهاپێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: (نموونەی دووبراوەك ئەودووودەستە وایە کە یەکێکیان ئەویان دەشوات وپاکی دەکاتەوە) ، چونکە هەردووودەستەکەدەبنە هاوکاری یەکتری بۆئەنجام دانی یەك مە بەست٠(جۆرج بەرنادشۆ)دەڵێ : ((جوانترین شت لەژیانداهاوڕێیەتییە ، جوانترین شت لەهاوڕێیەتیشداوەفایە))٠

هاوڕێی خراپ :

(ف) بەهۆی سەرەڕۆیی وکەللەڕەقی یەوە نەیتوانی خوێندن تە واوبکات ولەپۆلی پێنجەمی وێژەییەوە وازی لەقوتابخانەهێنا ، ئەم کوڕە زۆربەی کاتەکانی خۆی بەخواردنەوە بەسەردەبردوشەوانیش بەدوای نامووسی خەڵکیدادەگەڕا،زۆرجارلەگەڵهاوڕێ خراپەکانیداچەندشەونەدەهاتەوەنێومالێ،چونکەدەچوونەماڵەخراپەکانی (بەغدا) بۆڕابواردن٠(ف)کەتەمەنی گەیشتە(٢٢)ساڵ دایك وباوکی بۆئەوەی لەخراپەکاری وداوێنپیسی دووربکەوێتەوە ، ژنێکی جوانیان بۆهێنا ، بەڵام (ف) چونکەفێری هەوەسبازی بووبووازی لەوکارەخراپانەی نەهێناولەگەڵ هاوڕێ خراپەکانیدا بەچەندشەونەدەگەڕانەوەماڵەوە ، گەیشتەئەوەی کەژنەکەی داوای تەلاقی لێبکات،چونکەبۆی دەرکەوتبووکەمێردەکەی بۆیەگرینگی پێنادات چونکەغەریزەکانی لەگەڵ ژنانی دیکەدالەداوێنپیسیداخاڵی دەکاتەوە ، بۆیەپاش پێنج مانگ لەهاوسەرگیری ژنەکەی (ف) تەلاقی وەرگرت ولە (ف)جیابۆوەوگەڕایەوەماڵی باوکی٠(ل)کەخوشکی(ف)بووقوتابی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی بووکچێکی تابڵێی زیرەك ولێهاتووبوو ، گاڵتەی بەعەقلی (ف)ی برای دەکردکەخوێندنەکەی کردۆتەقوربانی ڕابواردن،بەڵام (ل)چەنددەستەخوشکێکی هەبووکەڕەوشت وئەخلاقیان باش نەبوو ، (ل) لەگەڵئەودەستەخوشکانەی دەچووەقوتابخانەوهەرلەگەڵ ئەوانیش لەقوتابخانەدەگەڕاوە،ئەودەستەخوشکانەی (ل) زۆرکاریگەرییان لەسەر(ل)هەبوو ، ئەوان لەدوای دەوامی قوتابخانەدەچوون لەئارایشگاکاریان دەکرد،لەپێناودەستکەوتنی پارەی زیاترپیاوی بێ ڕەوشت بەئۆتۆمبیل دەهاتنەدوایان وبەرەوجێگای نادیاردەیانبردن٠ئەم سێ کچەڕۆژانەلەبنگوێیان دەخوێندبەتەماعی پارە(ل)یان لەخشتەبرد ، پێیان دەوت : ئەگەربێت ولەگەڵ ئێمەداکاربکەیت لەئارایشگاپارەیەکی زۆرت دەستدەکەوێت دەتوانی زێڕوخشڵی جوانی پێبکڕی ئەوەبووقسەکانی ئەوان کاریگەرییان خستەسەر(ل)وئەویش بێ پرسی ماڵەوەبڕیاریدالەگەڵیانداکاربکات ، ئەوەبووزۆرجارتەنانەت دەوامی قوتابخانەشی دەکردەقوربانی کاری ئارایشگاونەدەچووەقوتابخانەوئەوکچەشیان فێری بەدڕەوشتی کردلەماڵەوەلێیان دەپرسی (ل) خۆتۆموچەت نییەوقوتابی وهیچ کارێك ناکەی ئەم هەمووزێڕەلەکوێ دەینی ؟ هی کێیە ؟ ئەویش دەیوت : هی خۆم نییە

، هی دەستەخوشکەکانمە٠دوای ئەوەی (ل)فێری کاری داوێنپیسی بوو لەگەڵ زۆرێك لەگەنجان داوێنپیسی دەکرد٠ڕۆژێکیان هاوڕێ خراپەکانی(ف)ی برای(ل) کەدەگۆی ئەوەدەبیستن کچێکی زۆرجوان هەیەلەفلاَن ئارایشگاکاری بەدڕەوشتی دەکات ، ئەوانیش بێئەوەی بزانن کەئەوەخوشکی (ف)ی برادەریانە دوولەبرادەرەکانی (ف)بەناوەکانی (س)و(ح)بەئۆتۆمبیلێك دەچنەبەردەم ئارایشگاکەوبەپارەیەکی زۆر(ل)لەگەڵ خۆیان دەبەنەماڵی یەکێکیان کەماڵی باوکی (ح)بووچۆلیش بوو ، (ل)یش دەڵێ: ئێوەکاری خۆتان تەواوکردووەبەپەلەبمبەنەوەئارایشگاکە ، ئەوانیش دەڵێن : ناپەلە مەکە ئێستابرادەرێکمان دێت بۆلات پارەیەکی چاکیش لەوبەردەوە ، ئەوکاتە (ح)بەسەیارەکەدەچێتەشوێن (ف) ، دەڵێ : زووکەکچێکی زۆرجوان قەت لەژیانت کچی واجوانت نەبینیوە ، (ف)یش بەپەلەدەچێت وکەدەچێتەژوورەوەدەبینێ (ل)ی خوشکی خۆیەتی بەڕووتی لەباوەشی (س)ڕاکشاوە(ل)هەرکەچاوی بە(ف)دەکەوێ پڕبەدەنگی خۆی دەقیژێنێ ، یەکسەر(ف)پشتاوپشت دەکشێتەوەهیچ قسەیەك لەدەمی نایەتەدەرەوەوبەشەرمەزارییەوەڕادەکات ، لەوکاتەدا (س) و(ح)سەریان سوڕدەمینێ زۆردەترسن ، بۆیەخێرا(ل)دەبەنەوەبۆئارایشگاکەوبەهاوڕێ کچەکانی دەڵێ : من چیترلەوئارایشگایەکارناکەم وبەتەکسییەك دەگەڕێتەوەماڵ خۆی ئامادەدەکات کەبیکوژن ، هەرکەنزیك ماڵێ دەبیتەوە جەنجاڵی وقەرەبالغیەکی زۆرلەژن وپیاوومنداڵ لەپێش ماڵیان دەبینێ ، کەدەچێتەناوئاپۆڕای خەڵکەکەپێی دەڵێن : (ف)ی برات بێ ئەوەی کەس بزانێ هۆکاری چ بووە لەژوورەوەبەگوریسێك خۆی خنکاندووە٠جاپاش سێ ڕۆژپرسەی براکەی (ل)شکایەت لەهاوڕێکانی براکەی وهەرسێ دەستەخوشکەکەی خۆی دەکات و ئابەمشێوەیەهەموویان دەستگیردەکرێن٠( جیهانێك لەتاوان ، بەرگی یەکەم)

هاوڕێی ئەلکترۆنی:

یەکەم: ئینتەرنیت (تۆڕی جیهانی)

ئەم ئامێرە بۆیەکەمجارلەساڵی(١٩٦٢)بەئامانجی سەربازی درو ستکراواتاخزمەتکردنی بواری سەربازی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاساڵی(١٩٩٤)یش چووەناوبواری بازرگانی ولەناوخەڵکدا بلاَوبۆوە ، (نیستەرداسیۆن) ، دەڵێت: (ئینتەرنیت وەکوهەواوایە) دەکرێ والێکبدرێتەوەمرۆڤ چۆن ناتوانێت هەواکۆنترۆڵ بکات بە هەمان شێوەناتوانێت ئینتەرنیت کۆنترۆڵ بکات٠

دووەم: مۆبایل

مۆبایل بەیەکێ لەوهۆکارانەدادەنرێ کەژیانی چەندین خێزانی وێران کردووە ، دەیان ژن وپیاوبەهۆیەوەدووچاری جیابوونەوەودەست لێکبەردان بووینەوبەدەیان ئافرەت وپیاویش بەهۆیەوەکوژراون٠هەمووشتێك لەژیانی مرۆڤدالایەنی سلبی وئیجابی هەیە کەوتۆتەسەرمرۆڤەکان چۆن بەکاری دەینن ، ئەمەش پەیوەندی بەعەقلی تەندروست یان ناتەندروستی مرۆڤەکەوەهەیە بۆنموونەئەگەرسەیری ئاگربکەین دەبینین گەورەترین سودی بەمرۆڤایەتی گەیاندووە ، زۆربەی

خواردنەکان بەهۆی ئاگرەوەمرۆڤ دەتوانێ بیانخوات ، بەلاَم دەبینین خۆکوشتن کەچەندگوناهێکی گەورەیە کەچی دەبینین ئافرەت بەنەوت وئاگرخۆی دەسوتێنێ،جامۆبایلیش لەئەنجامی خراپ بەکارهێنانیداتائێستاچەندین کەس ئابڕوویان چووەوبونەتەقوربانی٠کەواتەئەگەربەلایەنی باش بەکاری بێنین دەتوانین بارودۆخ بەرەوباشی ببەین ئەگەربەلایەنی خراپ بەکاری بێنین ئەوادەتوانێت کۆمەلگەخراپ بکات٠مۆبایل بەرهەمی ئەوپێشکەوتن وگۆڕانانەیە کەلەتەلەفۆنی (نۆڕمالّ)داڕوویداوەبەتەلەفۆنێکی بێتەلی نوێ دادەنرێت کەکار دەکات لەڕێگەی ناردنی شەپۆلّەکان ومانگە دەستکردەکان (مانگە دەستکردەکان بریتییەلەوێستگەیەکی بچووك هاتوچۆکەرلەئاسماندا) تەلەفۆن ئامێرێکەبۆگواستنەوەی دەنگ بەهۆی تەلێکی کانز اوە،خاوەنی ئەم داهێنانەش(گراهام بێلّ)ی ئەمریکی بوولەسالّی ( ١٨٧٦)کەبەسەرچاوەی داهێنانی مۆبایل دادەنرێت ، واتامۆبایل شێوەیەکی پێشکەوتووی تەلەفۆنە تەقلید ییە تەلدارەکەیە بەهۆیەوە دەتوانین پەیوەندی بەکەسێك بکەین بەخێراییەکی زۆرولەهەرکات وشوێنێك دا ، بەلاَم سەرەڕای ئەم نموونانە چە ندان نموونەی ترسناك بوونیان هەیە ، بۆنموونە:لەسالّی( ٢٠٠٦) کوڕێك ئیشی ناشیرینی لەگەلّ کچێك دەکات ودواتریش وێنەی دەگرێت وبەمۆبایل بلاَوی دەکاتەوە لەئەنجامی ئەم کارە هەردو وکیان دەکوژرێن ودوژمنداری دروستبوولەنێوان خێزانە کانیان٠یاخودکەسانێك مۆبایل بۆبەناوخۆشەویستی بەکاردەینن وچەندین کاری خراپی پێ ئەنجام دەدەن٠مۆبایل سوودی زۆرەئەگەربەچاکی بەکاری بێنی وسوودی چاکی لێ ببینی ، بۆنموونە ئیشی وا هەیەدەبێ بەتەکسی بچی ، بەلاَم بەمۆبایل دەتوانی ئیشەکەی خۆت جێبەجێ بکەی٠زۆرڕووداوی ناخۆشیش لەئەنجامی خراپ بەکارهێنانی مۆبایل ڕوویداوە کەببێتەدەرسێك٠کچێك دەلّێ بەهۆی تەلەفۆنەوەگەنجێکم ناسی ، ڕۆژێکیان تەلەفۆنێکم بۆهات گوتی : داوای مالّی فلاَن کەس دەکەم ، منیش بەدەنگێکی ناسکەوەگوتم ژمارەکەت هەلّەلێداوە ، پاشان هەندێ قسەم بەنازەوەلەگەلّ کرد٠کوڕەکەوایلێهات چەندجارێکی ترتەلەفۆنی بۆکردم ئەمەش بووەهۆی ئەوەی کەئاشنای یەکتربین گوایەیەکترمان خۆش دەوێ (بەمانایەکی ترحەزی لەوکچە کردووە ، هەروەك چۆن بلّێین حەزم لەپرتەقالەیان هەرشتێکی تر)چەندجارێك یەکترمان بینی ووێنەی خۆمان دابەیەکتر، ئەوپەیوەندییەچوارسالّی خایاند ڕۆژێکیان کوڕەکەوتی خۆتم تەسلیم بکە ، منیش وتم سەرەتاوەرەمارەم بکە٠کوڕەکەوتی : ئەوەی پێت دەلّێم نەیکەی ئابڕووت دەبەمهەمووقسەکانی تۆم تۆمارکردووە ، کچەکەدەلّێ : منیش ناچارخۆم تەسلیم کرد٠(ش) کچێکەدەلّێ : ((دووسالّ بوومۆبایلم هەبوو ، ژمارەیەك زۆرپەیوەندی پێوەکردم تاخۆی پێناساندم هەرکۆلّی نەداومنیش بڕوام پێکردماوەی سالّێك پەیوەندیمان هەبوو ، دوای ئەوەی کەبۆم دەرکەوت ئەولەڕێگەی مۆبایلەوەچەندین کچی وەك منی هەلّخەلّەتاندووە بەناخۆشی وازم لێهێنا٠ئەوناپیاوەهەلّسابووژمارەی منی دابووبەچەندکوڕێك لەبرادەرەکانی وەك خۆی ، ئەوانیش بێتامیان کردبووتاناچاریان کردم سیمکارتەکەم بفرۆشمەوە))٠بێگومان زۆرجارکوڕان دەنگی کچان تۆماردەکەن بۆئەوەی هەرکاتێ داواکارییەکانیان بۆبەجێ نەهێنان هەڕەشەی بلاَوکردنەوەی

دەنگەکانیان لێ دەکەن٠سەبارەت بەڕووداوێکی تری مۆبایل (د)لەگۆڤاری (زنار)ژمارە(١٥)ی ساڵی (٢٠٠٨) ، دەڵێ : ((کچێکی گەڕەکی ئێمەکەزۆرجوانە ژمارەکەی دەست یەکێك لەکوڕانی گەڕەك کەوتبووئەویش تەلەفۆنی بۆدەکات دەڵێ من چاك تۆدەناسم ماڵتان لەفلاَن شوێنەوکۆمەڵێ قسەی ناشیرن دەکات کچەکەش مۆبایلەکەی دەداتەدەست براکەی وکوڕەکەش دەستدەکات بەجنێودان ودەڵێ ئەگەرپیاوی دێی بۆفلاَن شوێن ، شوێنەکی هەڵەی پێدەڵێ براکەشی دەچێت بۆئەوشوێنەتەنهایەك کوڕی لێ دەبێت کەخەریکی مۆبایلە ، براکەی زۆربەتوڕەییەوە وادەزانێ ئەوەکوڕەکەیە لەوێ لێیان دەبێت بەشەڕ))٠لێکۆڵینەوەیەکلەساڵی (٢٠٠٧ – ٢٠٠٨) لەوڵاتی میسرئەنجامدرا دەریخست کە(٧٥)هەزارحالەتی جیابوونەوەڕوویداوە کە (٤٥)هەزارحالەت بەهۆ ی ئەنتەرنێتەوەبووە٠لێکۆڵینەوەیەکی ترلەزانکۆی قاهیرەئەنجامدراوە دەریخستووە کەهۆکاری ناپاکی هاوسەرێتی دەگەڕێتەوەبۆئەوفیلم وزنجیرە درامایانەی کەپەخش دەکرێن ، ئەم زنجیرەدرامایانەهانی ژن دەدەن لەژیانی هاوسەریان یاخیبن٠تەکنەلۆژیالایەنی باش وخراپی هەیە ، جاران دەچوویەماڵێك خەبەرت نەدەناردەچووی ئەوان لەماڵێ نەبوون٠بۆنموونەسەیران وگەشت حەلالەبەلاَم کەسێك دەچێ لەپەنای سەیران وگەشتدامەشرووب دەخواتەوە خۆناگونجێ بڵێین گەشت وسەیران قەدەغەیە٠

سێیەم: تەلەفزیۆن

تەلەفزیۆن وشەیەکی لێکدراوە ، (تێل)بەزمانی یۆنانی واتا (لە دوورەوە) ، (ڤژین)واتا(بینین)، هەردوو وشەکەواتا(بینین لەدو ورەوە) ، مێژووی دەرکەوتنی دەگەڕێتەوەبۆساڵی(١٩٣٩)٠بەپێی سەرچاوەمێژووییەکان عیراق لەساڵی ١٩٥٦ بۆیەکەم جارپەخشی تەلەفزیۆنی دەستپێکردووەلەسەردەمی مەلیك فەیسەڵی دووەم٠زنجیرەدرامای تەلەفزیۆنی بریتییەلەکۆمەڵێك ئەلقەی پێکەوەگر ێدراوکەهەرئەلقەیەکی لەساتێکی واتەواودەبێت بینەروالێدەکات بۆئەوەی بەتامەزرۆییەوەچاوەڕێی ئەلقەی داهاتووبکات ، ئەمەش لەچیرۆکی هەزارویەك شەوە(ألف ليلةوليلة) دەچێت کەمەلیکێك هەبووە گومانی لەژنەکەی هەبووە ڕۆژێك مەلیك خۆی دەگۆڕێ لەگەڵ خزمەتکارەکانی دەچێتەدەرەوەی شاربۆسەیرانکەدێتەوەدەبینێ واژنەکەی لەگەڵ هەندێك لەخزمەتکارەکانی خەریکی کاری بەدڕەوشتییە کەئەمەدەبینێ ئەمردەکات کەدەبێت هەرشەوێك ئافرەتێکی بۆبێنن شەولەگەڵ کچەکەدەبووپاشان بۆبەیانی دەیکوشت ، یەکێك لەکچەکانی وەزیرکچێکی دە بێت ناوی (شهرزاد)ە بەمانای (جوانترین کچی شار) ، ڕۆژێك  نۆرەی ئەم کچەدەبێ شەوپێش ئەوەی بنوون (شهرزاد)چیرۆکێك دەگێڕێتەوەگرێیەك دروست دەکات مەلێك بەیانی هەڵدەستێك دوودڵەلەکوشتنی ، چونکەدەیەوێ بگاتەئەنجامی حیکایەتەکە ، شەوی دووەمیش بەهەمان شێوەگرێیەك دروست دەکات هەتاهەزارویەك شەوی خایاندلەوماوەیەدوومندالی لێدەبێ ناتوانێ بیکوژی٠

سودوزیانەکانی تەلەفزیۆن:

زۆرجارتەلەفزیۆن بۆهێورکردنەوەی منالّ بەکاردێ،کەجوولەیان زۆرە،چونکەکاتێ مندالّ بەدیارتەلەفزیۆنەوەدادەنیشێ جۆرەبێ دەنگییەك دروست دەبێ ، بەلاّم زیانی زۆرە ، لەتوێژینەوەکان کەئەنجام دراوە دەرکەوتووەکەوا پەیوەندییەکی خراپ هەیەلەنێوان سەیرکردنی تەلەفزیۆن وئاستی خوێندن بەتایبەتی جاران کەیەك کەنالّی تەلەفزیۆن هەبووئێستاچەندین کەنالّ هەیە ، توێژینەوەیەك کەلەسالاّنی هەشتاکان کراوە، مندالّی ئەوشارانەی کەیەك کەنالّی تیڤی یان هەبوونمرەی بەرزتریان بەدە ستهێناوە لەوشارانەی کەچەندکەنالّێکی تیڤی هەبووە ، جگەلەوەش تەلە فزیۆن وا لەقوتابی دەکات کەتادرەنگی شەونەخەون ، ئەم کەم وکورتی یانەش کەلەنووستن داهەیەلەوانەیە لەقوتابخانە ئاگای لەوانەکانی نەبێت٠

**لەبارەی مەی(مەشرووب) :**

مەبەست لەشەراب ئەوشلەیەیەهۆشی مرۆڤ دابپۆشێ وبێهۆشی بکات، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ، فەرموویەتی : (الخمرماخمرالعقل)رواه الشیخان واصحاب السنن٠مەینۆشی ترسناکترین دیاردەیەکەگیرۆدەی گەلان ومیللەتان بۆتەوە ، کۆمەلگەی مرۆڤایەتی بەردەوام پێوەی دەنالێنێت٠زیانی زۆری بۆسەرژیان هەیەولەهەمان کاتدادەروازەیەکەبۆتاوان٠ مەی لەزۆرکۆنەوەهەبووە ، ئاینی ئیسلام قەدەغەی کردووە ، زیانی زۆربەتەندروستی دەگەیەنێ ، زۆرکێشەی کۆمەلاّیەتی و خێزانی دروست دەکات٠ (ئەرستۆتالیس) و(ئەبوقرات) دەلّێن : (خۆسەرخۆشکردن واتا خۆشێت کردن بەئەنقەست)٠ ئەگەرراددەی ئەوکحولەی کەلەمەشروب داهەیە گەیشتە یەك دلّۆپ بەرامبەربە(١٠٠٠)هەزاردلّۆپ خوێن ئەوائەوکەسە سەرخۆش دەبێ ، بەلاّم ئەگەرگەیشتە (٦)شەش دلّۆپ بەرامبەربە(١٠٠٠)هەزاردلّۆپ خوێن ئەوائەوکەسەدەمرێ٠زۆربەی ئەوکەسانە ئێمەلەژیانی ڕۆژانەدەیانناسین باهەرچەندەخراپەشیان هەبێ بەلاّم لایەنی خێروچاکەشیان هەیەئەگەرکەمیش بێ ، کابرایەك هێنراخزمەت پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) بۆدارکاریکردن لەسەرئارەق خواردنەوە ، پیاوێك وتی : نەفرەتی خودات لێ بێ چەندەجارەدەیهێنن بۆدارکاریکردن لەسەرئارەق خواردنەوە ، کاتێك پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)گوێی لێبوو فەرمووی:(نەفرینی لێ مەکە ، چونکەئەوەخواوپێغەمبەری خۆش دەوێ)ئەم پیاوە هەرچەندەکەسێکی سەرپێچیکاربوو ، بەلاّم لایەنی باوەڕی تێدابووکەواتەکاتێك باسی کەسێك دەکەی دادپەروەربەولایەنی چاکییەکەی فەرامۆش مەکە٠

زیانەکانی مەشرووب خواردنەوە:

١- ئەوکاتەی دەخواتەوە ئەدەب وڕەوشتیشی نامینێت٠

٢- لەئێران لەسەردەمی (ناسرەددین شا) ، شابڕیاری کوشتنی (ئەمیرکەبیر)ی دەرکردکەئەوکاتەشای ولاّت سەرخۆشبوو، بڕیا ڕەکەی واژووکردداوای هۆشیاربوونەوە پەشیمان بۆوە ، کەبەهەلّە یەکی سیاسی گەورە دادەنرێت٠ ٣- نوێژوخواپەرستی پێناکرێ٠

**جیرانەتی :**

**لەخزمەت پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)چاکەی ژنێکیان دەگێڕایەوە ، وتیان : بەڕۆژبەڕۆژودەبێ ، بەشەویش نوێژان دە کات ، بەلاَم ئەزیەتی جیرانان دەدات ، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : لێم ڕوونە ئەوژنە دەچێتە نێو ئاگری دۆزەخ)٠ئیمامی غەزالی دەڵێ : (بە ئیبن المقفع یان وت جیرانەکەت لەبەر قەرزاری خانووەکەی دەفرۆشێ ، (ئیبن مقفع) قەرزەکەی داوە نەیهێشت خانوەکەی بفرۆشێ)٠**

**بۆئەداکردن(بەجێهێنان)ی هەقی جیرانەتی پێویستە ڕەچاوی ئەوخالاَنە بکرێ:**

**١ - ئەگەرعەیب وعارێکی لێ دی پێویستە چاوپۆشی لێ بکا٠**

**٢ - زبڵ وزارنەهاوێتەبەردەرگای٠ ٣ - ڕێگای هاتووچۆی لێ تەنگ نەکات٠**

**٤ - ئەگەرچووەسەفەرئاگای لەماڵەکەی بێ٠**

**٥ - بەچاوی خراپ نەڕوانێتە ژن ومنداڵی٠**

**یەکێك لەهۆکارەکانی پتەوکردنی پەیوەندی کۆمەلاَیەتی سەردانییە٠سەردانیش زۆرجۆری هەیە :**

**یەکەم : سەردانی ئاساییی**

**دووەم : سەردانی بۆنەخۆشەکان**

**سێیەم : سەردانی بۆنەناخۆشەکان : بەمەبەستی دڵدانەوەوسەبووری خاوەن مردووەکە ، خواردن وهەمووکارێکی دڵنەوایی پرسەوسەرەخۆشی لێبکەن ودەوری قەلەبالەغ وزۆربێت**

**بۆئەوەی کەمترئێش وئازارکاری تێبکات ، ئەگەرتەنهابێت هەست بەبێکەسی ونامۆیی دەکات وبرینەکەی قولتردەبێت٠**

**خۆبەگەورەزانین :**

**خۆبەگەورەزانین ڕەوشتێکی ناشیرین وقێزەونە٠ئیبن قەییمی جەوزی ، دەڵێ : سەرچاوەی هەمووتاوانێك سێ شتە:**

**١ - خۆبەگەورەزانین : ئەوەبوو ئیبلیسی گەیاندەئەوپلەیەی کەئێستاتێی دایە٠**

**٢ - تەماح : ئەوەبوو ئادەمی لە بەهەشت دەرکرد٠**

**٣ - حەسودی : ئەوەبوو قابیل هابیل ی کوشت٠**

**(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (خۆبەگەورەزانەکان لەڕۆژی قیامە ت دا لەوێنەی مێرووله بچوکەکان دالەشێوەی پیاوداکۆدەکرێنەوە) بوخاری وترمذی ڕیوایەتیان کردووە٠ یەکێك لەپیاوچاکان دەڵێت:(کەسێك ڕۆژی سێ جاربەدەست پیسایی دەشوات چۆن خۆی بەگەورە دادەنێت؟)هەروەهاپێغەمبەر(درودی خوای لەسە ربێ) فەرموویەتی : (لەدەفری ئاڵتوون وزیودا مەخۆنەوە ، لەمەنجە ڵەکانیشیان مەخۆن،چونکە لەدنیادا بۆئەوانەولەقیامەتیشدا بۆئێوە) ئیمامی بوخاری**

گێڕاویەتییەوە لەبارەی هۆکاری حەرامبوونی وتراوە دەبێتەهۆی خۆبەگەورەزانین٠لەتێڕوانینی هەندێك کەس کەسی بەڕێزدەبێت کەسێك بێت کەم قسەیان لەگەڵ بکات ئەگەرلەگەڵیان ساکاربووئەواپێیدەوێرن وسووکایەتی پێدەکەن ، بۆیەهەندێك کەس ئەگەرکەسێك لەگەڵیان نەرم ونیان وسادەبووئەوائەوکەسەزەرەردەکات ، چونکەبەکەم سەیری دەکەن ، ئەگەریش لوتبەرزبووئەواڕێزی دەگرن٠نوکتەیەك لەبارەی پیاوێك دەگێڕنەوەکەئەوپیاوەبەشادییەوەدەچێتەلای هاوڕێکەی ، چونکەئاغاپێی وتووە : ((خۆڕی ئەوەلەکێندەری؟!))کەچی پیاوەکەزۆرشانازی پێکردووە ، چونکەئاغابۆسوعبەت وخۆشی پێی وتووە کەشانازی بەقسەکردن لەگەڵ پیاوی گەورەکردووە٠

جۆرەکانی خۆبەگەورەزانین:

یەکەم: خۆبەگەورەزانین لەدڵدا

کەسی خۆبەگەورەزان،خۆبەگەورەزانینەکەی لەدڵ داجێگیربووە، پێی وایەباشترەلەکەسانی تر٠

دووەم:لەکردەوەکانیداخۆبەگەورەزانین دەردەکەوێ،دەبینی ئەوکەسە لەکۆڕوکۆبوونەوەکان دالای سەروودەگرێت وڕووی لەخەڵکی وەردەگێڕێت یان بەفیزەوە تەماشای خەڵکی دەکات٠

سێیەم: خۆبەگەورەزانین لەزمانی دادەردەکەوێت،وەك: قسەی زل وشانازیکردن بەخۆوەیان بەڕەگەزوڕەچەڵە کییەوە ، (دروودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(ان الرجل لیطغی فی کلامه ، کما یطغی في ماله)٠واتا:(پیاوی واهەیە بەقسەوگوفتارەکانی خۆی بەگەورە دادەنێت ، وەك چۆن هەیەبە پارەوسامانی خۆی بەگەورە دەبینێت)٠

چوارەم: خۆبەگەورەزانین لەڕۆیشتن دا

ئەکەسانەدەگرێتەوە کەلەکاتی ڕۆیشتن بەجۆرێ دەڕۆن یان جۆرەوەستانێك دەوەستن کەفیزولەخۆبایی بوونی پێوەدیاربێت٠

نیشانەکانی خۆبەگەورەزانین:

١ - پێی خۆشەخەڵکی لەبەری هەڵسیتەوە٠

٢ - خۆبەگەورەزان پێی عەیبەهەرخۆی بەڕێگەدابڕوات ، چەند کەسێکی لەگەڵ نەبێ٠

٣ - خۆبەگەورەزان کە ل وپەلی خۆی بەدەستی خۆی هەڵناگرێت یەکێك بۆی هەڵدەگرێت٠

٤ - ڕوو وەرگێڕان لەخەڵکی یەکێك قسەی بۆبکات پشتی تێدەکات وبەبایەخەوە گوێی بۆناگرێ٠

٥ - توندوتیژی ودەنگ بەرزکردنەوەوخۆتوڕەکردن٠

هۆکارەکانی خۆبەگەورەزانین:

١ - بەهۆی زانست: (درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(افة العلم الخیلاء) واتا : (زیانی زانست خۆبەگەورەزانییە) ، زۆر جارڕوودەدات زانا فیزدەکات بەزانیارییەکەیەوە بەچاوی کەم تەماشای عەوام دەکات٠

٢ - بەهۆی عیبادەتی زۆر : شانازی بەخۆی دەکات٠

٣ - بەهۆی ماڵ وسامان : هەندێك كەس خۆبەگەورەزانینیان بەهۆی ئەوەیە كەماڵ وسامانیان زۆرە (وكان لە ثمرفقال لصحبه وهويحاوره أناأكثرمنك مالا وأعزنفرا) الكهف : ٣٤ واتا : (جائەوخاوەن باخە ، زۆرسەروەت وسامانی تری هەبوو ، (كابرای خاوەن باخ غەرابووبەسامانەكەی ) بۆیەبەهاوەڵە هەژارە ئیماندارەكەی وت كاتێك گفتوگۆی لەگەڵ دەكرد : من سامانی زۆرزیاترم هەیەلەتۆ ، ماڵ ومنداڵیشم بەهێزترە لەوانەی تۆ)٠

٤ – جوانی:هەرچەندەجوانی بۆمرۆڤ شتێكی خۆشەونیعمەتێكەخودابەمرۆڤی بەخشیوە ، بەڵام زۆرجارجوانی ئافرەت مەغروروڵەخۆبایی ولوتبەرزدەكات٠

٥ – هەندێك خەڵك خۆبەگەورەزانینیان بەهۆی ئەوەیە كەڤە وم وعەشیرەتیان زۆرە٠

٦ - یاخود بەهۆی ئەوەی كوڕیان زۆرە ، شانازی دەكەن٠

٧ - خۆبەگەورەزانین بەهۆی ڕەنگ :

پێشترلەئەمریكا لەزۆرێك لەچێشتخانەكان نوسرابوو: هاتنە ژوورەوە بۆڕەشپێستەكان نییە٠ هەروەهالەهەمووپاسێكدا ڕێزی یەكەمی بۆسپی پێستەكان و ، بەشی دوواوەش بۆڕە شپێستەكان تەرخانكرابوو، هەروەهائەوە یاسا بوو ، ئەگەر سپی پێستێك بهاتبایە نێوپاسێكەوە ڕەشپێستەكەبۆی نەبوو لەوشوێنەدابنیشێ ، واتاسەرپێچی یاسای كردووە دەیتوانی پۆلیس بانگ بكات وسكاڵاتۆماربكات بەتۆمەتی سەرپێچی كردنی یاسای هاتوچۆ٠

خۆبەگەورەزانین لەبواری ڕامیاری :

ئاشكرایەزۆرجیاوازی هەیەلەبەشەردا ، ڕەنگی پێست وكورتی ودرێژی وڕەگەزوزمان و هتد٠ لەبیستەكانی سەدەی ڕابردوو، وەزیری ناوەخۆی ئەڵمانیاوتبووی :(تێكەڵاوبوونی ڕەگەزەكان دەبێتەهۆی پەرتبوونیان،گەل نامرێت بەدۆڕاندنی شەڕ ، بەڵكوئەوكاتەلەناودەچێت ، كەخوێنی پاك پیس دەبێت بەتێكە ڵبوونی ڕەگەزێكی ترلەگەڵیدا)٠مرۆڤ بەپێی ڕەنگ كراوە بە چەند بەشێكەوە :

یەكەم : نەتەوەی سپی كەئەوروپییەكانن٠

دووەم : نەتەوەی ڕەش (زەنجی) كەئەفریقییەكانن٠

سێیەم : نەتەوەی زەردكەمەغۆلەكانن٠

چوارەم : نەتەوەی سوورلەئەمریكای سەرووخواروو٠

پێنجەم : نەتەوەی ئەسمەركەهیندییەكانن٠

مرۆڤ دووسەرچاوەی ڕەنگی پێستی هەیە :

١-ئەوڕەنگەی كەدەگەڕێتەوە بۆڕێژەی ڕەنگی (میلانین) وتەنهاپەیوەندی بە(جین)ەوە هەیە٠

٢- ئەوڕەنگەی لەئەنجامی تیشكی خۆروكاریگەرییەكانی ترەوەدروست دەبێ٠ڕەنگی سروشتی پێست بەستراوەبە:

١-هیمۆگلۆبین ( لەدوو وشەپێکهاتووە ، هێم واتا (ئاسن) ، گلۆ بین ماددەیەکی پرۆتینییە لەش دروستی دەکات ، ڕێژەی ئا سن لەلەشی پیاودا زیاترە (ئاسنی تواوەلەخۆراکدا)٠

٢- کارۆتینۆید٠

٣- ڕەنگی میلانین ، کەلەشانە ڕەنگدەرەکانەوە دەردەچێ ، شانە ڕەنگ دروستکەرەکان دەکەونەناوتوێژی شانەدروستکەرەکانی پێست ودووفەرمان بەجێدەهێنن :

١-دروستکردنی (میلانۆسۆم) کەڕەنگ بەپێست دەدات ٠

٢- بلاّوکردنەوەی گوێزانەوەی ڕەنگ بۆشانەکانی تری پێست٠

جیاوازی نێوان پێستی نەتەوەکان وەکوقەوقازی ونیگرۆ(ڕەش پێستەکان) دەگەرێتەوەبۆرێژەی ڕەنگی (میلانین)لەپێست دا٠ ئاشکرایە ئاووهەوازۆرکاردەکاتە سەررەنگ ، لێرەداپێویستەبپر سین کەدانیشتوانی سەرزەمین یەك چەشن بوون بەرەگەزونە تەوەی جیاجیا ، یان زۆرچەشن ؟

هەموومرۆڤەکان لەیەك چەشن ولەیەك بنجن ورەگەزەکانیش بەسافی نەماونەتەوە ،بەڵکوتێکەڵ یەکبوونە ، ئەوجیاوازییە ، ڕەنگەبەهۆی سەرماوگەرماوە ئەووێنەیەیان گرتووە ، ئێمە ئازاین ، ئێمە زیرەکین ، ئێمەباشترین ٠ ئەم بیروبۆچوونانە کزبوونە ، بەلاّم لەرەگ وریشە هەڵنەکێشراون٠ بەشی زۆری زانایان دەڵێن : لەرو وی زەوی داهیچ رەگەزێك نییە رەگەزێکی تری لەگەڵ تێکەڵ نە بووبێ ، لەهیچ سەردەمێکدارەگەزێکی خوێنساف نەبووە، چونکە لەدێرزەمانەوە تا ئەمرۆخەریکی شە روشۆروبەیەکداچوونن ، ژن لەیەکتری دێنن ولەبەینی تێکرای رەگەزی سوورو سپی وزەرد ورەش پەیوەندییەکی بەتین هەیە ، ئەوکۆچانەی مرۆڤ کردوویەتی لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکی تروتا لاّنکردنی ئافرەت وئەوتێکەڵیەی بەهۆی ژن لەیەکهێنانەوە رووی داوە زۆرکاری کردۆتە سەرئەم رەگەزانەوەکووتم مرۆڤ لەچەند رەگەزێکی جیاوازپێکدێ : سپی پێست ورەش پێست وزەردوقاوە یی ، ئەم رەگەزانە چۆن دروستبوون ؟ ئەگەرکەسێك هەمیشە لەژێر تیشکی بەهێزی خۆردابژی ، بێگومان پێستی گۆڕانکاری بەسەردادێ ، بۆنموونە ئەگەرمرۆڤ لەناوچەگەرمەکان نیشتەجێ ببێت ، ئەوا ڕەنگیان ڕەش دەبێت ، چونکە بەردەوام تیشکی خۆرلەپێستیان دەدات ، وەك کرێکارێك کەبەردەوام لەژێرتینی گەرما ی هاویندا کاردەکات ، بەم شێوەیە ڕەنگی پێستی مرۆڤ بەپێی کەش وهەوای ناوچەکان گۆڕانکاری بەسەردادێت ، مرۆڤێکی سپی پێست ئەگەرماوەیەکی زۆرلەناوچەگەرمەکاندا نیشتەجێ ببێ، ئەوارەنگی پێستی ڕەش دەبێت ، کەواتە کەش وهەواوژینگەی نیشتەجێبوون هۆکاری سەرەکی گۆڕینی پێست وروخساریانە ، هەروەهابەشێکی ڕەنگی پێست دەگەرێتەوە بۆتێکەلاّوبوونی رە گەزەجیاوازەکان٠

**ڕێزگرتن لەیەتیم :**

**بێباوکی پیاوی مەزن وفەیلەسوف وداهێنە رونوسەرانی گەورەی دروستکردووە ، دکتۆر(پی یێرڕنچینگ)پسپۆڕوسایکۆلیجیستی سویسڕایی گەیشتۆتەئەوئەنجامەی کە زۆرلەناودارانی مێژوو ئەگەرباوکیان هەبوایەوەك خەڵکی دیکەگەورەبووبان نەدەگە یشتنەئەوپلەیەکەپێی گەیشتوون ، ناوبراو دەڵێ : (زۆربەی گە ورە پیاوانی مێژووبەبێباوکی گەورەبوون ، هیندەتاڵی وسوێری وکەندوکۆسپیان هاتۆتەپێش خۆیان لەئاووئاگرداوە ، خۆیان کەسایەتی خۆیان دروستکردووە)بەبڕوای ئەوچارەنووس وخودی بێباوکی یارمەتی ئەوانی داوە تادەسەلأت بگرنە دەست(ڕنچینگ) دەڵێ : (ئەوەشتێکی ئاشکرایەیەتیم بوون یەکێك لەشتەهەرەتاڵ وناخۆشەکانە ، بەلأم لەوکاتەدابەفازانجی منداڵەکەیە ، چونکە دەبێتەهۆی ئەوەی کەمنداڵەکەلەسەرپێی خۆی بوەستێ وتەنیا بەهیوای خۆی بێت وبەدوای ئامانجی خۆی بگەڕێت)بەبڕوای دکتۆر(ڕنچینگ)یەتیمی نەك تەنیاپیاوی سیاسی دروستدەکات، بەڵکودەبێتەهۆی دروستبوونی نوسەروفەیلەسوف وداهێنەروهونەرمەندی گەورە،ئایاهیچ بەڵگەیەکی لەوەباشترهەیەناودارانی وەك: ئەرستۆو دافنشی وچەندانی دیکەبێ باوك بوون؟ ناوبراودەڵێ : (بێ باوکی پاڵ پێوەنەرێکەکەمرۆڤ بەرەوپێش دە بات وسەردەخات)٠**

**پرۆفیسۆر(ئەندێرنانیال) کەکتێبێکی لەبارەی بیروڕای(ڕنچینگ) نووسی، ڕایگەیاندووەکەهەرلێهاتوێکی گەورەدەبێ شانبەشانی ڕەنجێکی گەورەبڕواتەپێش ئەوپەژارەگەورەیەتەنیائەوکەسانە هەستیان پێکردووە کە بەبێباوکی گەورەبوون وتامی تاڵی یە تیمی یان چەشتووە ، وەك دیارە( بێ دایکی) ش وەك بێباوکی تاڵی وپەژارەیەکی گەورەیە ، (کلابل لاتکرمون الیتیم) الفجر : ١٧ ، شێخ محەمەدی خاڵ لە(تەفسیری خاڵ) ، دەڵێ :(ئەم ئایە تەئەوەدەگەیەنێ کەئیسلام زۆری مەبەستە ڕێزلەیەتیم بگیرێ)**

**چەندنموونەیەك:**

**١ — زەیدی کوڕی سابت :**

**تەمەنی شەش ساڵان بووە باوکی لەشەڕی نێوان (ئەوس) و(خەز رەج) کوژراوە ، لەعەشیرەتی (خەزرەج) بووە ، یازدەساڵ پێش کۆچی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بۆ(مەدینە) لەدایك بووە ، یەکێك بووە لەنوسەروکۆکەرەوەی قورئان و(کاتب وەحی) لەپاش جەنگی (یەمامە) ئیمامی (ئەبوبەکر) (خوای لێ ڕازی بێ) داوای لێکردکەقورئانی پیرۆزبەتەواوی بنوسێتەوە ، ساڵی (٤٥)ی کۆچی لەسەردەمی (محاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) کۆچی دوایی کرد٠**

**٢-ئەبوهوڕەیرە:**

**ناوی (عبدالرحمن)ە ناسناوی ئەبوهوڕەیرەیە، لەسەردەمی نەفامی ناوی (عبدشمس)بوو٠**

٣-ئیمامی بوخاری: ناوی(محمد)ە،لەساڵی(١٩٤ك)لەشاری(بوخارا)ی ئۆزباكستان لەدایكبووە ، كتێبی حەدیسی داناوەكەبە(صەحیحی بوخاری) بەناوبانگە ، چونكەتەنیاحەدیسە صەحیحەكانی تۆمار كردووە،لەساڵی(٢٥٦ك)كۆچی دوایی كردولەشاری(سەمەرقەند)ی ئۆزباكستان نێژرا٠

٤ - ئیمامی شافیعی: ناوی(محمدكوڕی ئیدریس ی كوڕی عەبباس ی كوڕی عوسمان ی كوڕی شافیح ی قوڕەیشییە)یەكێك بووەلەوانەی بێ باوك گەورەبووە ، لەساڵی(١٥٠ك)لەشاری(غەززە)لەفەڵەستین لەدایك بووە ، خاوەن زیرەكییەكی دەگمەن بووە لەتەمەنی حەوت ساڵی هەمووقورئانی لەبەربووە ، لەتەمەنی(١٥)پازدەساڵی دابۆتەموفتی دامەزرێنەری زانستی(اصول الفقه)ە ، شاعیریش بووە لەمەدینە لای ئیمامی (مالك)زانستی ئاینی خوێندووە ، لەشاری بەغدا كتێبی (ڕیسالە)ی داناوە ، كەبنەمای دامەزراندنی زانستی فقهە٠لەقوتابییە كانی(ئەحمەدی كوڕی حەنبەل)ە ساڵی(٢٠٤ك)لەمیسرڕكۆچی دوایی كرد٠

٥ - ئەحمەدی كوڕی حەنبەل : منداڵ بووەباوكی مردووە٠لەقوتابییە كانی : ئیمامی بوخاری وموسلیم وئەبوداودە٠

٦- ئیمامی غەزالی(٢) : لەساڵی (٤٥٠ك) لەدایكبووە٠

٧ - ڕابیعەی عەدەویە: كچی ئیسماعیل عەدەویەیە ، لەساڵی (١٠٠)كلەشاری(بەسڕا)لەدایكبووە ، كچی چوارەمی خێزانەكەی بووە ، بۆ یەناویان ناوە(ڕابیحە)واتا(چوارەم)٠ تەمەنی(١٠)ساڵ بووە باوكی مردووە بۆبژێوی ڕۆژانەی خێزانە كەی لەشوێنی باوكی بەبەلەمەكەی كاری گواستنەوەی خەڵكی دەكرد كاتێك دەگەڕایەوە لەتاوهیلاكی وماندووبوون گۆرانی وشیعری لەبەرخۆی دەوت لەخەوداداوای لێ دەكرێت وازلەگۆرانی وشیعروتن بێنێت وڕوبكاتە خواپەرستی وقورئان خوێندن، دوای ماوەیەك دایكیشی دەمرێت لەگەڵ خوشكەكانی ژیانێكی زۆردژوا ردەگوزەرێنن تاكۆتایی تەمەنی بەزاهیدی وخواپەرستی ژیاوە ، ساڵی(١٨٠ك)لەتەمەنی(٨٠)ساڵی داكۆچی دوایی كرد٠

٨ - شێخ محمدی خاڵ: لەساڵی(١٩٠٤م)لەگەڕكی(گوێژە)لەشاری سلێما نی لەدایكبووە٠لەبەرهەمەكانی: تەفسیری خاڵ، فەرهەنگی خاڵ ، پە ندی پێشینانی كوردی٠

٩ - نیوتن: لەسكی دایكی دابووە باوكی مردووە ، بیردۆزەكەی بۆتەبناغەی زانستی فیزیا،زانایەكی بیركاری وفیزیاوی ئینگلیزی یە دۆزەرەوەی بیردۆزی هێزی كێشكردنی زەوییە ، ساڵی(١٧٢٨)مردووە (ئیسحاق نیوتن لەباخچەیەكدابووبینی سێوێك لەدارێك كەوتە خوارەوە ، ئەم پرسیارەی كرد : بۆچی ئەم سێوە لەم دارە كەوتە خوارەوە ؟ تاگەیشتە وەڵام ویاسای كەوتنی تەنەكانی بۆدا نا)٠

١٠ - شێخ شەریف: لە (تە نزانیا)ی ئەفریقیا لەتەمەنی دوومانگیدا قسەی كردووەلەتەمەنی(٥)ساڵی دابوبەوتاربێژ٠

١١- هیتلەر: دوازدەساڵان بووباوكی مرد٠

١٢- ناپلیۆن: لەتەمەنی حەوت ساڵی داباوكی مرد٠

**١٣- غاندی: لەپانزە ساڵی دابێباوك بوو.**

**١٤ - ماکسیم گۆرکی(١٨٩٦- ١٩٣٦): پێنج ساڵان بووباوکی مرد.نوسەرێکی بەناوبانگی ڕوسییە یەکێ لەبەرهەمەکانی ڕۆمانی(دایك)ە.**

**١٥- تۆڵستۆی: ئەدیبێکی ڕوسییە یەکێ لەبەرهەمەکانی (اناکارنینا)یەتەمەنی دووساڵان بوە دایکی مردووە،تەمەنی دەگاتە نۆساڵان باوکیشی دەمرێ ساڵی(١٩١٠)کۆچی دوایی کرد. ١٦- نیلسون ماندێلا: تەمەنی نۆساڵان بووە باوکی مردووە،دژی حکومەتی باشوری ئەفریقیا کەبەدەستی حکومەتی سپی پێستی ڕەگەزپەرستەوەبووخەباتی کردووە، لەساڵی(١٩١٤) بووەسەرۆکی باشوری ئەفریقیا لەساڵی(١٩٩٥)خەڵاتی ئەتاتورکی بۆئاشتی ڕە تکردەوەبەهۆی مامەڵەی تورکیالەگەڵ گەلی کورد ، ساڵی (٢٠١٣) لەتەمەنی(٩٥)ساڵی داکۆچی دوایی کرد.**

**١٧- یەشارکەمال :**

**لوتکەی ڕۆماننووسی تورکیا (یەشارکەمال) ، لەساڵی (١٩٢٣) لەدایك وباوکێکی کوردهاتۆتەدنیاوە ، تەمەنی چوارساڵ و نیوبوو ، باوکی لەمزگەوت لەکاتی نوێژکردن بە دەستی برایەکی بەخێوکراوی دەکوژرێ. لەتەمەنی حەڤدە ساڵییەوە وەرگێڕانی ڕۆمانەجیهانییەکانی : مۆلێروتۆلستۆی وشکسپیر ری دەخوێندەوە.**

**١٨ — چارلی چاپن :**

**لەساڵی (١٨٨٩)لەشاری لەندەن لەدایکبووە.منداڵ بووەباوکی مردووە.کەس نەبووەبەخێویان بکات ، دایکی نەبێ ، ئەویش ئەوەندەی پێنەچووشێت بوو ، خستییانەنەخۆشخانە.لەوکاتەداشارلی وسەدنی برایان ناردنەهێتیمخانە.پاش ماوەیەك دایکی چاکبۆوەوهەردوومنداڵەکەیان بۆناردەوە.بەڵام ژیانیان زۆرناخۆشبوو لەژوورێکی بچووك دەژیان زۆرجاربەبرسییەتی دەمانەوە.**

## مامەڵەکردن لەگەڵ گیانداران :

**وشەی (الحیوان) بنەڕەتی وشەکەلە (حیاة) ، (الحیوان) ناوێکە لەهە مووشتێکی زیندوودەنرێت. گوفتاری خوای گەورە (وان الدارالاخرة لهي الحیوان لوکانوا یعلمون )العنکبوت : ٦٤ واتا :(بەڕاستی ماڵی قیامەت ، ژیانی ناوبەهەشت هەرئەوەژیانە ئەگەربیانزانیبایەوتێگەیشتبانایە).**

**ئیمامی ئەحمەدونسائی ڕیوایەتیان کردووە:(ئەوەی چۆلەکەیەك بە گاڵتەبکوژێ ، ڕۆژی قیامەت داوای مافی خۆی دەکات ودەڵێت: ئەی خوای گەورە ئەم کەسە منی بەگاڵتەکوشت بۆسودوەرگرتن نەیکو شتم).**

**"ئەبراهام لنکولن" دەڵێ :(ئەوەی بەزەیی بەئاژەڵێکی بێ دەسەڵات نەیەت ناتوانێ بەزەیی بەمرۆڤ دابێت) دەبینی مامزێکی پڕخەت وخاڵی جوان بەچکەیەکی بەجێهێشتووە ، خۆشی لەعەردێکا دەلە وەڕێ ، بەلکوشیربێتەگوانییەوە ، مرۆڤ ئەوبەستەزمانە دەکوژێ بەچکەکەی بێ شیرومرداردەبێ، یاخودکەوێك لەبن دەوەنێکداهێلکەی کردووەلەسەری کرکەوتووە لەپڕتفەنگێکی تێدەگرن ودەیکوژن ، هێلکەکانیشی هەڵنایەن ولەناودەچن ، هەروەها لەوکاتانەدا ڕاوبکرێ کەوەختی زاووزێ نییە ، لەبەرئەوەی نێچیری ئاوس ڕاوکردنی**

تاوا نێکی گەورەیەو لەگەڵ ڕەوتی ویژدان ومرۆڤایەتی ناگونجێ٠ئەبودا ودرپوایەتی کردووە کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)بینیویەتی کۆمەڵێك هاوەڵ خەریکی سوتاندنی کونەمێروولەیەکن پێی فەرموو ن: کێ ئەمەی سووتاندووە ؟ هاوەڵەکانی وتیان : ئێمە فەرمووی : بێجگەلەخوا(جل جلالە)نابێ هیچ کەسێکی دیکە کەسێك بەئاگر بسووتێنێ)٠هەروەهاخوای گەورە بەهۆی سەگێکەوە لەئافرەتێکی بەدڕەوشت خۆشبووخستییەبەهەشتەوە، ئەوەبوولەسەربیرێك سە گێك لەتاوتێوەتی زمانی دەرهێنابوولەوکاتەشدائەوئافرەتە بەوێدا تێدەپەڕی کاتێك حالی ئەوسەگەبەستە زمانەدەبینێ خۆی پێڕانا گیرێ وپشتێنەی ناوقەدی لێدەکاتەوەودەیبەستێت بەپێلاوەکەیەوە ئینجائاولەبیرەکەدەردەهێنێت وسەگەکەتێرئاودەکات٠ ئەبوهوڕەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) ، ئەویش لەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (پێخەمبەرێك لەپێخەمبەران هەواری خست لەبن درەختێکدا مێروولەیەك گەستی فەرمانیدا جل وجێگەکەیان هە لگرت ، ئەمجا فەرمانیدا شارە مێروولەکەیان سوتاندخوای گەورە نیگای بۆنارد : بۆچی تەنها یەك مێروولەت نەسووتاند ؟ ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە٠وەگیاندارانیش هەست وسۆزیان هەیە ، چونکەهەندێك جوولەوکاردەکەن لەشێوازی ڕەفتاری مرۆڤ نزیکە کەمانای خۆشەویستی وسۆزدەدات٠

لەقورئانی پیرۆزداچەندین سورەت بەناوی گیانداران هەیە،وەك: (النمل ، البقرە ، الفیل ، النحل ، العنکبوت) ، لەچیرۆکی دووکو ڕەکەی ئادەم دا ، خوای گەورە مرۆڤ بەقەلەڕەش فێری ناشتن دەکات ، وەکولەئایەتی (٣١)ی سورەتی (المائدة)داهاتووە : (ئینجاخواقەلەڕەشێکی ناردوچاڵێکی لەزەوی دا هەڵکەندبۆقەلەڕە ڕەشێکی مرداربوو ، تاپیشانی بدات چۆن تەرمی براکەی بشارێتەوە ، هەرکەئەوەی دیت ، وتی : هاواربەماڵم ، چەندوەختە من بەقەد مرئەوقەلەڕەشە عەقلم نەبوو ، تاتەرمی براکەم بشارمەوە ، ئیتربۆ هەمیشەچووە ڕیزی پەشیمانانەوە) مردووناشتنیش (تکریم)ە ، میللەتی واهەیە مردووەکانیان دەخەنە سەرشوێنێکی بەرزبۆئەوەی تەیروباڵندەکان بیخۆن ، بەلاَم ئێمە کەیەکێك دەمرێ دەیشۆین و کفنی دەکەین ولاشەکەی بەخاك دەسپێرین ، پاشان لەسەرجێگەکەیبۆناسینەوەی دەنووسین : گۆڕی فلاَن کەسە ، ئەوە تەکریمە ٠

هەروەهاگواستنەوەی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ وچاندنی سەرەتای تاقیکردنەوەی ئەم کردارە لەسەرگیانلەبەران بووە ، وەك ئەوەی لەسەرسەگ وپشیلەوکەروێشك ومشك وبۆق ئەنجامیان داوە ، واتا لەسەرەتادا ئەم کردارەیان لەسەرسەگ بۆسەگ وپشیلە بۆپشیلە تاقیکردۆتەوە ، ئینجا لەسەرمرۆڤ تاقیکراوەتەوە ، هەروەها گواستنەوە لەنێوان مرۆڤ وگیانلەبەران تاکوئەمڕۆش تاقیکراوەتەوە وبەردەوامە ، وەك گواستنەوەی (ئەنسۆلین ) لەمانگا بۆمرۆڤ ، کە بۆچارەسەری نەخۆشی (میزی شەکرە) بەکاردەهێنرێت٠

**گواستنەوەی خوێن :**

ئەم کردارە لەهەمووجۆرەکانی گواستنەوە بەربلاوترە ، کەبۆجاری یەکەم لەلایەن زانای بەریتانی (ریتشاردلاور) ئەنجام دراوە لەساڵی (١٦٦٥) ، سەرەتالەنێوان سەگەکان تاقیکراوەتەوە ، دواتر (جین بابستن دینس) هەڵسا بەگواستنەوەی خوێن لەنێوان مرۆڤەکان دا ، بەلام گشتیان مردن ، دواترلەسەدەی نۆزدەم (جیمس بلندڵ) ی ئینگلیزی لەساڵی (١٨١٨)هەڵسا بەگواستنەوەی خوێن لەنێوان مرۆڤەکان دا ، بەلام زۆربەیان مردن ، تاکوساڵی(١٩٠٠) زانایەکی بایۆلۆژی نەمساوی گرووپەکانی خوێنی دۆزییەوە ، ئینجا ئەم دیاردەیەبووبەکارێکی ئاسایی ، بۆیە ناتوانرێت هەمووکەسێك خوێن بدات بەکەسی تر، تاکوگرووپەکەیان دیاری نەکرێت ، بۆیە تەنیا گرووپی (ئۆ) دەتوانێت خوێن بەهەمووگرووپەکانی تربدات و گرووپی (ئەی بی) دەتوانێت خوێن وەربگرێت ، جگە لەوەی کەهەریەکەیان خوێن دەداتەوە گرووپی خۆی ٠

**چاندنی بیابیلەی چاو :**

لەساڵی (١٨٣٥) زانا (بیگر) ، یەکەم سەرکەوتنی کرداری چاندنی بیلبیلەی چاوی لەنێوان دوو(ئاسك) دا ئەنجام دا٠ ئەم جۆرە چاندنە ئێستا باوەولەزۆرولاتان دا کاری بۆدەکەن وسەرکەوتوون٠

**چاندنی گورچیلە :**

یەکەم کەس کەبەم کردارەهەڵسا ، نەشتەرگەری ئەمریکی (امریش ارلمان)بوولەساڵی(١٩٠٢)، سەرەتاش تاقیکردنەوەکەی لەسەرسەگێك ئەنجام داوە ، چاندنی گورچیلە بەوەجیادەکرێتەوەلەئەندامەکانی تری لەش ، بەهۆی ئەوەی دوودانەیە،بۆیەدەتوانرێ بەگواستنەوەی یەك دانە هەردوولابژین ٠

**چاندنی پەنکریاس :**

پەنکریاس ئەندامێکی سەرەکی ناوەوەی لەشی مرۆڤە ، کەگرینگی هەیەلەدەردانی ماددەی (ئەنسۆلین) ، کەهۆکاری سەرەکی کەمکرد نەوەی ڕێژەی شەکرەلەلەش دا٠ هەرچەندەهەوڵدراوە ئەم ئەنسۆلینە لەمانگا وەربگیرێت ، بەلام هەوڵی ئەوەش دراوە کەپەنکریاس لەلەش دا بچینرێت ، بۆیە لەساڵی (١٨٩٢) ، (هیدون) هەڵسا بەچاندنی بە شێکی پەنکریاس لەسەگێك ودانانی لەژێرپێستی هەمان سەگ دا ، کردارەکەش سەرکەوتنی بەدەستهێنا ، کە لەجۆری چاندنی خۆیی بوو ، کەبووە هۆی دابەزینی ڕێژەی شەکرلەلەش دا ، پاشان نەشتەرگەر ییان گواستەوەبۆلەشی مرۆڤ٠ وەك دەزانین مرۆڤ لەگیانداران گەورە ترە ، کوشتنی گیاندارانیش چەندجۆرێکە :

یەکەم : ئەونەی زیانبەخشن ، وەك : مارودووپشك ٠

دووەم : ئەوانەی بۆخواردن٠

سێیەم : بۆچارەسەری مرۆڤ ، چونکەمرۆڤ لەگیانداران گەورەترە ، کرداری تاقیکردنەوەی پزیشکانیش دەچێتە سنووری ئەم بابەتە٠ بەلام لەکرداری گواستنەوەی ئەندامەکانی لەش لەگیاندارانەوە بۆ مرۆڤ ، کەسی وەرگرلەڕووی دەروونییەوە ، کەوا هەڵگری ئەندامی گیاندارێکە ئازاردەکێشێ٠

سیفەتی هەندێك لەگیانداران:

ئەسپ نیشانەی هۆشیاری ونەجیبی

بازنیشانەی پەلامار

مەڕنیشانەی بێگوناهی

تاوس نیشانەی جوانی

وشترنیشانەی قین وسەرسەختی

ڕێوی نیشانەی فێڵبازی

گوێدرێژنیشانەی گێلی

کیسەڵ نیشانەی لەسەرخۆیی

گورگ نیشانەی دڕندەیی

سەگ نیشانەی وەفاداری

شێرنیشانەی ئازایەتی

ئیمامی غەزالی دەڵێ :

زۆرسیفەتی هاوبەش لەنێوان مرۆڤ وگیانلەبەران هەیە : هەیانە سەگانەیە ، گەرنانی پێبدەی بەدەورت کلکە قێیەتی،ئەگەرپێشی نەدەی دەست بەوەڕین دەکات ، هەیانەدڕندەوتوڕەیە هەوڵی بریتییە لەدەستدرێژی بۆسەرخەڵکی ، هەروەهاوتراوە هەرکەس گۆشتی بەرازبخوات سیفەتی خۆراکەکە وەردەگرێت ، دوورنییە خوای گەورە ئاژەڵی دڕندەوباڵندەی ڕاوکەری بۆیەحەرام کردبێ ، چونکە خواردنی سیفەتی ئاژەڵەکە لەلەدەروونی دادروست دەکات ، خواش زانایە٠ هەیانە سروشتی وەك تاوس وایە خۆجوانکردن وخۆڕازاندنەوەبەپەڕەکانی)٠ (لیدەرەر) لەسەرەتای شەستەکان کتێبەکەی ناوناوە (امة من غنم - میللەتی مەڕ) ، ئەمەش بەهۆی کەمی هۆشیاری گەل٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(ئایائەوکەسەی کەلەپێش ئیمامەوە لەسەجدەدا یان لەرکوع د ا سەربەرز دەکاتەوە ناترسێت کەسەری ببێت بەسەری گوێدرێژ)ئیمامی بوخاری ومسلیم وئەبوداودوترمذی ونسائی ڕیوایەتییان کردووە٠

ئیمامی غەزالی لە بەرگی دووەمی کتێبەکەی (ژیانەوەی زانستە ئاینییەکان ) کەوەرگێڕدراوەتە سەرکوردی دەڵێ : (گۆڕانەکە لە ڕووی مەعناوە دەبێت ، چونکە بەزاهیری وئاشکرا ڕووی نەداوە ئەم گۆڕانەی بەسەردابێت واتا ئەوەنییە کەڕەنگ وشکلی وەك سەری گوێدرێژی لێ بێ ،بەڵکوتایبەتمەندییەکانی ئەووەردەگرێت کەنەفامی وگەمژەییە ، مەبەستی فەرموودەکەش ئەوەیە کەگۆڕا نکارییەکان لەناخ وناوەڕۆکدا دەبێت)٠

فڕین:

"عەبباسی کوڕی فیرناس" لەسەدەی نۆزدەم لەقورتوبە(ئەندە لوس)ژیاوە، فڕینی تاقیکردەوە لەساڵی(٨٥٢)عەبایەکی گەورەی کردە شان کەبەپارچەتەختە قایم کرابوو لەمنارەی مزگەوتی گەورەی قورتوبە خۆی فڕێدایەخوارەوە وتوانی بفڕێت،بەڵام زۆرناهەروەك ئەوانەی بەپەڕە شووت خۆیان فڕێدەدەنە خوا ڕەوە تەنهانیشتەوەودابەزی بەچەندبرینێکی سادەوە مەترسییە کەی تێپەڕاند ئەمجارەگردێکی لەدەرەوەی شاری قورتوبە هەڵبژ اردبۆئەنجامدانی تاقیکردنەوەکەی ، خەڵکەکەلەدامێن گردەکەکۆ بوونەوەدەیانویست بزانن ئەم زانایە چی دەکات؟ لەخوارەوەدەیانڕوانییە عەبباس وەك باڵندەیەکی ڕاستەقینە دەر دەکەوت،کاتێك عەبباس خۆی هەڵدایەخوارەوەبۆخوارەوەدەنیشت کاتێك دەستی کردبەباڵڕاوەشاندن بەئەندازەیەکی باش بەرزبۆوە بەمەش ناوی خۆی لەمێژوودا وەك یەکەم مرۆڤ فڕینی تاقیکرد بێتەوە تۆمارکرد ، بەڵام نیشتنەوەکەی بەشێوەیەکی توندبوو ، بۆیە خێرادابەزییەوەوباڵەکانی شکاوبرپبڕەکانی پشتی زیانیان بەرکەوت ، دوابەدوای عەبباسی کوڕی فیرناس ، چەندەهاکەسی ترفڕینیان تاقیکردەوە٠بۆنموونە: زانای تورکستان (جەوهەری)لەساڵی(١٠٠٢) دووباڵی لەتەختەوئاوریشم دروستکرد، باڵەکانی کردە شانی ولەمنارەی مزگەوتێکەوەخۆی هەڵدایە خوارەوەبەڵام زۆربەتوندی خۆی لەزەوی داومرد ، پیاوێکی ئەڵمانی بەناوی(ئۆتۆلیلینتاڵ) لەساڵی(١٨٩٦) فڕۆکەیەکی چارۆکەدارکەوەك کۆلارەیەکی گەورە وابووکەوتەخوارەوەومرد،ئەم پیاوەپەرتوکێکی بەناوی(بنەماکانی هونەری فڕین- فڕینی باڵندە)نووسیبوو٠

"ئۆرفیل"و"ویلبەرڕایت" دووبرابوون لەشاری (داتیۆن) لەویلایە تی(ئۆهایۆ)دەژیان هەرلەمنداڵییەوە خولیای فڕینیان هەبوو ، لە مێژوودا براکانی ڕایت وەك یەکەمین کەس فڕۆکەیان دروستکرد بێ هاتووە،براکانی ڕایت زۆربەوردی لەهەوڵەکانی پێش خۆیان دەکۆڵییەوەبەتایبەتی ئەوزانیارییانەی کە(ئۆتولینتاڵ)دەربارەی فڕینی باڵندەکان کۆی کردبووەوە ، (براکانی ڕایت)یش ، هەروەك "ئۆتۆلیتاڵ"پێیان وابووکەتەنهابەوردبوونەوەلەچۆنیەتی فڕینی باڵندەکان دەتوانن بگەنەئامانج،زۆرباش لەجولەی کلك وباڵی باڵندەکانیان کۆڵییەوە،توانیان یەکەمین فڕۆکە بەرهەم بهێنن ، فڕۆکەکەدووپەروانەی هەبوولەگەڵ فڕۆکەوانێکدا لەیەکەم هە وڵداتوانی بۆماوەی(١٢)دوازدەچرکەولەدووەم هەوڵیشدا بۆماوەی (٥٩)پەنجاونۆچرکەلەهەوادابمێنیتەوە،لەساڵی(١٩٠٣)براکانی ڕایت لەکاتی دروستکردنی یەکەمین فڕۆکە باڵەکانی سیسارکە کەچەڵ یان بەنموونەوەرگرتبوو، تەنها(باڵ)بەس نییە بۆفڕین بۆنموونە (مریشك)یش باڵی هەیە ، بەڵام ناتوانێ بفڕیت،چونکەباڵەکانی بۆفڕین دروست نەکراوە ، بەڵکوبۆلەباوەشگرتنی بێچوەکان دروستکراوە،باڵندەکان بەگشتی بەدووجۆرلەسەرزەوی بەرزدەبنەوە:

باڵندەبچووکەکان ، وەك: "پەڕەسێلکە"و"کۆتر"سەرەتابازێك بە ڕەوسەرەوەهەڵدەدەن لەم کاتەدا بەتەواوی خێراییەکانیان لەشە قەی باڵ دەدەن پاڵ بەهەوادەنێن بۆخوارەوە تابەتەواوی بەرزدەدەبنەوە پاشان بۆپێشەوەدەفرن باڵندەگەورەوقورسەکانیش وەك قازناتوانن لەجێی خۆیان بازێك بدەن وبفڕن ئەوان

پێویستیان بەڕاکردنە ، هەروەك فڕۆکەکان، هەربۆیە سەرەتا ڕادەکەن ، باڵ ڕادەوەشێنن پاشان خێراترڕادەکەن ولەزەوی بەرزدەبنەوەولەشە قەی باڵ دەدەن ودەفڕن، هەندێ جۆری (سیسارکەکەچەڵ) پەڕەی باڵەکانی بەشێوەی پە نجەی دەست دەکاتەوە کاتێك پسپۆڕڕان لەمەیان کۆڵیوەتەوە بینیان ئەوە تەوژمی هەواکەم دەکاتەوە ، کەلە ئەنجامدا فڕین وبەرگری هەواپەیدادەبێ ئێستاش فڕۆکەی باڵداریان لەسەرهەمان بنەمادروستکردووە،وەلەدروستکردنی هیلیکۆپتەرداوتراوەلاسایی مێرووی پوشیقنگەیان کردۆتەوە ، هەروەهافڕۆکەی (کۆنکۆرد) زۆرلە (دۆلفین) دەچێ.

ئایازیندەوەرهەمووی زیانیان بۆئادەمیزادهەیە ؟

پسپۆڕان دەڵێن ژمارەی جۆری حەشەرات نزیکەی (٦٥٠)هەزاردەبێت ، بەلأم لەسەدایەك یان دووی زیانی بۆئادەمیزادهەیە ، وەئەوانی ترکەمێکیان سوودیان هەیەوزۆریشیان نەقازانجیان هەیەنەزیان.

ئایاپێش ئەم شارستانیەتە ، شارستانییەتی ترهەبووە؟

لەداستانێکی کۆنی هیندی دا، کەناوی(ڕۆمایان)ە، دەڵێ : (کە ڕۆژبۆوە ، (ڕاما) چووە ناو ئەوعەرەبانە ئاسمانییەوە کە (پو شپاکا) لە(ڤیڤپیشاند)بۆی ناردبوو ، خۆی ئامادەدەکردبۆفڕ ین ، ئەم عەرەبانەیە لەخۆیەوە بەرزدەبوویەوەوزۆرگەورەبوو وەبەڕەنگی جوان بۆیەکرابوولەدوونهۆم وچەند ژورێکی پەنجە رەدارپێکهاتبوو ، کەئەم عەرەبانەیە بەئاسماندا دەڕۆیشت دە نگێکی نەگۆڕاوی لێوەدەهات، لەلایەکی تری داستانەکە دەڵێ:(کەعەرەبانەکەبەرزدەبۆوە بەهەرچوارلاداگرمەگرمی بلأودە کردەوە)،لەنوسراوێکی کۆنی(سانسکریتی) دا هاتووەکەکاتێ عەرەبانەکە هەڵدەستا، وەك شێردەینەڕاند، بێگومان نابێ زۆربێبڕوابین ئەوهەوالأنە ڕەتبکەینەوە ، (عەلی وەردی) ، لەکتێبە کەی دا:(چەردەیەکی کۆمەلأیەتییانەلەمێژووی نوێی عیراق)دا ، دەڵێ : (بەغدا ییەکان بەرلەجەنگ فڕۆکەیان نەدیبوو، بۆیەهە رکەئەم هەواڵەیان بیست باوەڕیان نەکرد، دەگێڕنەوەکابرایەکی ئاقلیان دەڵێ: ئەفرەنجییەکان گالیسکەیەکیان دروستکردووە بەئاسماندادەفڕی ئەوگالیسکەیە لەچ کەرەستەیەك دروستکراوە؟لەداروئاسن، ئاماژەی بۆچەکوشێك کردکەلەنەنیشتی بوو وتی: ماقولە ئەمە (لەداروئاسن دروستکراوە)بفڕێت؟ لە (٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی(١٩١٥) یەکەم فڕۆکەلەئاسمانی بەغدا پەیدابوو ئەوڕۆژە خەڵکی لەئاسماندا خاڵێکی ڕەشیان بەدیکرد بەقەد مێشێك دەفڕی وگیزەگیزێکی ترسناکی لێوەدەهات ، ترس لەناویاندابلأوبۆوە هەمووچونەسەربانی ماڵەکانیان بەتفەنگ تەقەیان لێ دەکردبێ سوودبوو) ، هەروەهازۆربیناوخانووبەرەی کۆنی وا هەیە کەبنیاتنانیان پێویستی بەزانیاری پێشکەوتووی واهەیە ئێستاوێنەیان کەمە، لەئیسپانیا (پەرستگای ئاووهەوای ڕەش)بەرزییەکەی دەگاتە(٧٥)م ، سەربانەکەی بریتییە لەتاشەبەردی دووهەزارتەنی ئامرازەتەکنیکییەکانی ئێستا(سرینگ)ناتوانن سەنگی وابەرزبکەنەوە ، یەکێك لەحەوت شتەسەیرەکانی جیها ن (منارەی نەسکەندەریە)یە ، ئەم منارەیەئاوێنەیەکی گەورەی لەسەربوو کەبەپێی پێویست دەجولاوتیشکەکەی لەدووری دەیەها کیلۆمە ترەوەدەبینرا ، دەڵێن دەتوانرا ئاوێنەکەی بەگۆشەیەکی وا

لاربكرێتەوە تیشكی ڕۆژكۆبكاتەوە، لەدوورەوە پاپۆڕی دوژمن بسوتێنێ ، بەپێی هەواڵی ناونوسراوەكۆنەكان بەرزی ئەومنارەیە ئەوەندەی خانوێكی شەست نهۆمی دەبووبلاّوبوونەوەی هەواڵی ئەوەی گوایە فیرعەونەكانی میسرپەنرخترین سامان وخشلیان لەژێربناغەكەی دا شاردۆتەوە، بۆیەدەستیانكرد بەهەڵوەشاندنەوەی كەنیوەیان ڕووخاند فەرمانی وەستاندنی ئەم كارەودروستكردنەوە یان دا ، بەلاّم نەیانتوانی دروستی بكەنەوە بۆنەگبەتی ئاوێنەگەورە كەشیان خستە خوارەوە، بووبەهەزارپارچە، لەسەدەی چواردەهەم ئەم نیوە منارەیەش بوومەلەرزەیەكی بەهێزتێكیدا٠

## لەبارەی پرسە(تەعزیە) :

تەعزیە : واتا دڵدانەوەی كەس وكاری مردووەكەوفەرمان پێكر دنیان بەئارامگرتن وهاندانیان بۆسەبروئارامگرتن٠غەم خواردن لەسەرمەرگی خۆشەویستان بەشێكەلەسروشتی مرۆڤ ، پرسەوسەرەخۆشیش ڕەنگەوەكوسوكناییەك بێت٠پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(من عزی مصابا فله مثل اجره)٠(عەبدولاّی كوڕی عومەری كوڕی عاص) وتویەتی: (لەگە ڕانەوەماندالەناشتنی مردوێك ئافرەتێك بەرەوڕوومان هات ، پێغە مبەر(درودی خوای لەسەربێ) زانی كە(فاتیمە)یە ، فەرمووی : شتێك لەماڵ دەری كردووی ؟ ئەویش وتی : ئەوەكەس وكاری ئەو ماڵەمردوێكیان لێ مردبووبەزەییم پێداهاتەوەوپرسەم لێكردن(سنن ابی داود)٠ئەمەش بەڵگەیە كەئافرەتانیش وەكوپیاوان دەتوانن بوپرسەبڕۆن ، هەروەهاپێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)پرسەی لەپیاوێك كردووە فەرموویەتی:(رحمك الله وأجرك)رواه احمد ، هەروەها (عبدالله ی كوڕی جەعفەر) لەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەگێڕێتەوە كەئەوپێی باش بوولەكاتی سەردانی ماڵی خاوەن مردوو هەندێ خواردن ئامادەبكەن لەگەڵ خۆت بیبەی بۆئەوەی نەبێتەبارگرانی بەسەریانەوە٠ هەروەهاسونەتەبۆخزم ودراوسێ خواردن بۆكەس وكاری مردووەكەئامادە بكەن هەروەكو لەكاتی مردنی (جەعفەر)پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرمانی كردخواردن بۆكەس وكاری جەعفەردروست بكەن ، هەروەهاسونەتە سەرەخۆشی لەكەس وكاری مردووبكرێت لەكاتی ناشتنیەوە هەتا (٣) سێ ڕۆژ (بڕوانە: شیكردنەوەی المقاصدالنووی ، علی محمدهێرۆیی) پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(مامن مؤمن یحزی اخاه بمصیبة الا كساة الله سبحانه من حلل الكرامة یوم القیامة) رواه ابن ماجه والبیهقی٠ واتا:(هەرباوەڕدارێك سەرەخۆشی لەبرای باوەڕداری بكات بەهۆی كارەساتێكەوەئەوەخوای گەورە پۆشاكی ڕێزی دەكاتەبەری لەڕۆژی قیامەتدا)٠ هەروەهاكاتێك(ابوسلمی) كۆچی دوایی كرد ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)سەردانی(ام سلمی)ی كردودڵی دا یەوە ئەودووعایەی فەرموو : (اللهم اغفرلابی سلمة الخ)رواه مسلم

دروسته موسڵمان بۆلەدەستدانی کەسی خۆشەویستی بگریت ،چونکه پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)بۆمردنی ئیبراهیمی کوڕی گریاوه، بەلأم لاواندنەوەوهاوارکردن ویەخەدادڕین حەرامەودروست نییه. مانای ئایەتی (٢٩) ی سوڕەتی الدخان : (فمابکت علیهم السماءوالارض).

واتا : ( ئەوانەی بڕوادارنین : نەئاسمان ونەزەوی فرمێسکیان بۆناڕێژن) سەعیدی کوڕی جوبەیر" دەڵێ : پیاوێك لە(ئیبن عەببا س)ی پرسی مانای ئەم ئایەتەچییه؟ ئاسمان وزەوی بۆکەس دەگرین ؟ وتی : بەڵێ ، چونکەهەمووکەس لەئاسماندا دەرگایەکی خۆی بۆهه یه ، لەودەرگایەرزق ونیعمەتی بۆدێ ، هەرلەوێشەوه کاروکردەوەکان بەرزدەبنەوه ، جاکاتێ مردئەودەرگایەدادەخرێ ، ئیترئەویش بۆی دەگری وهەرکات لەوجێگایەبڕا ، کەلەزەوی داسوجدەی تیابردووه ، ئیترزەویش یادی دەکات وبۆی دەگری ، بەلأم هۆزەکەی فیرعەون ، چونکه سوجدەیان نەبردوکردەوەی چاکیان نەبوو ئاسمان وزەوی نەگریابۆیان. گریان بەلگەیەلەسەرپاکیەتی دڵ ، بەهۆی نەرمی وناسکی دڵەوەبەسەرمرۆڤ زاڵ دەبێ ، گریان نیشانەی بەزەییه ، نەگریانیش پێچەوانەی ئەمه.وەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی : ئەم چوارشتەنیشانەی نەهاتی وشەقاوەتن :

١ - گریان نەهاتن وفرمێسك نەڕشتن.

٢ - دڵڕەقی.

٣ - تەماعکاری بۆکۆکرنەوەی ڕزق وڕۆزی وپول ودراو.

٤ - زیادەڕۆیی کردن لەگوناه وتاوان.

عن أنس بن مالك (رضي الله عنه)قال : قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): ((كنت نهيتكم عن زيارة القبورالافزوروهافاءنهاترق القلب وتدمع العين وتذكرة الاخرة))رواه البيهقي.

عن أبي هريرة (رضي الله عنه)قال:(( زارالنبي (صلى الله عليه وسلم)قبرأمه فبكى وأبكى من حوله...))رواه مسلم. پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : ((هذه رحمة جعلها الله في قلوب عباده وانمايرحم الله من عباده الرحماء)) رواه البخاري ومسلم کەواتەگریان مانای ناڕازیبوون نیشان نادات.عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي (صلى الله عليه وسلم)قال : ((مامن مولوديولدالاوالشيطان يمسه حين يولد ، فيستهل صارخا من مس الشيطان اياه الا مريم وابنها)) رواه البخاري. ئەم حەدیسه نهێنی گریانی منداڵان بۆئاشکرادەکات کەمنداڵ تازه لەسکی دایکی دەردەچێ.

سوودەکانی گریان:

١ - گریان یارمەتیمان دەدات بۆڕزگاربوون لەژەهری لەش،لەکاتی لێکۆڵینەوەدەرکەوتووه ئەوفرمێسکانەی لەکاتی وردکردنی پیازدادەڕژێن لەگەڵ فرمێسکەکانی بەهۆی پەستی وبێتاقه تییەوە ، دەرکەوتووه کەفرمێسکەکانی کاتی خەمباری زیاتر ژەهری لەش لەگەڵ خۆی دەباتەدەرێ.

٢ - گریان یارمەتی لینجە پەردەکان دەدات کەتوشی وشکبوون نەبنەوە ، چونکە ئەگەرچاوەکان وشك ببن کێشەی بینین دروست دەبێ٠ ئیمامی شافیعی(خوای لێ ڕازی بێ)پرسەنامەیەك بەشیعر بۆدۆستێکی خۆی دەنێرێ وسەرەخۆشی لێ دەکات:

انی معزیك لا نی علی ثقة

من الخلودولکن سنه الدین

ناالمعزن بباق بعدمیته

ولاالمعزن ولوعاشاالی حین

واتا: پرسەت لێ دەکەم پرسە سوننەتە

سوننەتی دینە مایەی ڕەحمەتە

بەلاّم دلّنیام دنیاهەتاسەر

بۆکەس نامێنێ هاکا بێ ٚخەبەر

**لەبارەی چاکەکردن :**

هەندێك لەفەیلەسوفان چاکەواپێناسەدەکەن : ((هەرشتێك کەبەختەوەری بێنێت))٠بەختەوەریش هەمووئەوشتانەدەگرێتەوەکەمرۆڤ ئاسودەدەکەن ، مرۆڤ ئەوکاتەی یارمەتی یەکێك دەدات ئاسودەیی وبەختەوەری بەوکەسەدەدات ، ئەوکارەی ئەنجامی دەدات تارێژەی ئەوکەسانەی پێی بەختەوەردەبن زیاتربێت ، ئەواکارەکەبایەخدارتروبەرزترتەماشادەکرێ ، بۆنموونە ئەوکەسەی گلۆپی داهێناوە ئەوکارەی کردووە ئەنجامی کارەکەی بەختەوەرییەکی گەورەبووە بەختەوەری تەواوی مرۆڤایەتی لێکەوتۆتەوە٠زۆرجاروواتێدەگەین چاکەکردن تەنیابەخشینی پارەیە ، بەلاّم لەڕاستی دابواری چاکەکردن زۆرفراوانە دەولّەمەندوهەژاردەگرێتەوە،چونکەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : (تبسمك فی وجە أخیك صدقة)٠

لەئاینی ئیسلامداچاکە تەنیاکردارنییە ، پەیوەستەبەنییەتەوە ، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(انماالاعمال بالنیات وانمالکل امرئ مانوی)بەوبۆنەیەی فەرموو ، پیاوێك لەپێناوی ژنێك دا ، بەناوی (ام قیس) لەمەککەوەکۆچی کردبۆمە دینە٠ ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە : ( ڕەنگە خێرکردنت بەدزێك ببێتەهۆی دەستهەلگرتن لەدزی ، یاخێر کردنت بەزینا کارێك لەوانەیە ببێتەمایەی تۆبەکردن لەوکارە ، یاخودبەخشینی پارەکەت بەزەنگینێك وای لێبکات بیرێ بکاتەوە ، ئەویش دەست بەبەخشین لەوسامانەی خواپێی داوە بکات )٠ (کاریگەری ئابلوقەی ئابوری شتێکی سەلمێندراوە کەبارودۆخی ئابوری کاریگەری هەبووە هەرچەندە هیچ بیانوبۆزیناکردن نییە)٠ هەروەها پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(نیة المؤمن خیرمن عمله) ، چونکە کردەوەی بێ مەبەست عیبادەت نییە ، بەلاّم مەبەستی بێ کردەوە عیبادەتە٠ لەنێوبەنی ئیسرائیل پیاوێك وتی : ئەگەرئەم کێوە گەنم با لەنێوهەژاران

دابەشم دەكرد ، وەحی هاتەسەرپێخەمبەری سەردەم ، فەرمووی : بەوكابرایە بڵێ : پەروەردگارت سەدەقەكەی لێ قبوول كردی ، ئەوپاداشتەی كەئەگەرئەوكێوە گەنم بایەولەنێوهەژاران دا بەشت كردبایە بەرت دەكەوت پێتی داوە٠

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(ئەوەی بەدە نگی بەرزقورئان دەخوێنێ وەك ئەوەوایە كەبەئاشكراخێردەكات ، ئەوەش بەنهێنی قورئان دەخوێنێ وەك ئەوەوایە كەبەبێدەنگی خێردەكات) ئیمامی ئەبوداودوترمذی ونسائی ڕیوایەتیان كردووە٠ (وانفقواممارزقناكم سراوعلانية ) رعد : ٢٢ (ان تبدوا الصدقت فنعماهى) البقره : ٢٧١ واتا : (ئەگەرخێروسەدەقەكانتان بەئاشكرا ولەبەرخودابیكەن ئەوەكارێكی زۆرباشە ) (بەمەرجێك بەمەبەستی ئەوەی كەسانێكی ترچاوی لێ بكەن یان لەبەرئەوەی سوالكەرەولەبەر دەم كۆمەڵێك خەڵك داوای كردووە ) پێخەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ)فەرموویەتی : (ردوا مدمة السائل ولوبمثل رأس الطائرمن الطحام ) رواه أبوداودوالنسائى وابن حبان واتا : (ئەگەریەكێك داوای لێكردن ، ئەواشتێكی هەربدەنێ بابەئەندازەی سەری باڵندە یەكیش بێ)٠ ( وان تخفوها وتؤتوهاالفقراءفهوخيرلكم ) البقرة : ٢٧ واتا : (ئەگەرچاكەكانتان لەبەرچاوی خەڵكی بشارنەوەوبەپەنهانی بیدەن بەهەژارەكان ئەوەباشترەبۆتان لەوەی ئاشكرای بكەن) (سودی شاردنەوەئەوەیە لەڕیاوناوبانگ ڕزگارت دەبێت )٠ ئەنەسی كوڕی ما ليك (خوای لێ ڕازی بێ) وتوویەتی : پێخەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی : (خواستەم لەئیمانداران ناكات ولەپاداشتی چاكەدا لەدنیاداولەقیا مەتیشدا پاداشتیان دەداتەوە ، بەلاَم كافرپاداشتی ئەو كارانەی كە كردوویەتی هەرلەدنیادا دەدرێتەوە بۆئەوەی كەگەیشتە قیامەت هیچ چاكەیەكی نەمینێ كەلەوێداپاداشت بدرێتەوەلەبارەی چاكەكردن لەگەڵ دایك وباوك ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ، فەرموویەتی : (هیچ منداڵێك پاداشتی دایك وباوكی ناداتەوە تەنها ئەگەریەكێك لەدایك وباوكەكەی كوەیلەبێ وبیكڕێ وبەوكڕینە ئازا دی بكات) موسلیم ڕیوایەتی كردووە٠ وەیەكێ لەوانەكەدڵی دایك وبا وكی دەڕەنجاند دای لەباوكی وڕایكێشایەشوێنێكەوە ، باوكی پێی وت : كوڕەكەم تائێرە بەسە ، چونكەمنیش لەكاتی خۆی باوكی خۆمم تائێرەهێنا ، بۆیەمرۆڤ بەبەردەوامی چاوەڕێی سزای تاوانەكانی خۆ ی بكات كەبەدەگمەن ڕزگاری بێت لێی٠خوای گەورەفەرموویەتی : (امايبلغن عندك الكبرأحدهماأوكلاهمافلاتقل لهماأف) الاسراء : ٢٣ واتا:(یەكێكیان یان هەردوكیان پیربوون چوونەساڵەوە ، پێیان مەڵێ ئۆف)٠وتراوە مانای ئەوەیەئەگەردایك وباوك پیربوون ، چوونەساڵەوەپێویستیان بەخاوێنكردنەوەی میزوپیسایی هەبوولوتت مەگرەوڕووت گرژمەكە ، چونكەكاتێك تۆمناڵ بوویت زۆرتۆیان خاوێنكردۆتەوە٠ئەبوداودونەسائی لەسەعدی كوڕی عبادەوە(خوایان لێ ڕازیبێ)دەگێڕنەوەوتویەتی وتم : ئەی پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) دایكم مردووە چ سەدەقەوچاكەیەك باشترە بۆی بكەم ؟ فەرمووی : ئاو ، ئەویش بیرێكی هەڵكەندووتی : ئەمەبۆدایكی سەعد٠ هەروەهاچاكەكردن هۆكارێكەبۆكردنەوەی دەرووی خێرلەكاتی ئاستەنگ وتەنگانەدا ، هۆكارێكیشەبۆقبولبوونی دوعاوپاڕانەوە ،

بەلگەش بۆئەمە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ:لەگەلەکانی پێش ئێوەداسێ کەس لەئاوەدانی دوورکەوتنەوە باران لێی داکردن بۆخۆپەنادان چوونەئەشکەوتێك لەناکاوبەردێکی گەورە خرایەبەردەرگای ئەشکەوتەکەورێگای هاتنەدەروەی لێگرتن ، هەریەکەیان بەهۆی کارێکی باشەوە کەئەنجامیاندابوواوایان لەخوای گەورەکردکەدەرووی خێریان لێبکاتەوە ، خوای گەورەش لەبەرئەوکارەچاکانەی ئەنجامیان دابوودەرووی خێری لێکردنەوەوبەردەکەی لەبەردەرگای ئەشکەوتەکەبۆلابردن ، کەیەکێکیان بەهۆی چاکەکاری وجوان ڕفتاری لەگەلْ دایك وباوکیدا ئەنجامیدابوو پاڕایەوەوخوای گەورەش نزاوپاڕانەوەکەی قبولکرد٠هەروەهالەعەبدوللای کوڕی عومەرەوە (خوایان لێ ڕازیبێ) دەگێڕنەوە وتویەتی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : (بروا ابائکم تبرکم أبنائکم وعفوا تعف نساؤکم) واتا : (چاکەکاروجوان ڕەفتاربن لەگەلْ دایك وباوکتان ، مندالەکانتان لەگەلتان چاکەکاردەبن ، داوێنپاك بن هاوسەرەکانیشتان داوێنپاك دەبن)٠کەچی کوڕهەبووە بەقسەی خۆش خانوی لەسەرناوی باوکی لابردووە وبەناوی خۆی کردووە دواتربەفێلێك بردوویەتییەخانەی بەسالاٚچووان٠

**لەبارەی گالتەکردن :**

گالتە بریتییە لەقسەیەکی خۆش بۆدلخۆشکردن بەکاردەهێنرێت ، گالتەپێکردنیش هۆکارێکە بۆدلتەنگکردن وبریندارکردنی هەستی بەرامبەربەکاردەهێنرێت٠ ئەگەربەهۆی سوعبەت کردن خەمێك لەسەردلی کەسێك لاببەی ، یان بۆناومالْ وخێزان بکرێت ئەوەکاکارێکی چاکە ، بەلاٚم کەسانێك هەن لەجیاتی ئەوەی بزانن بەرا مبەربەچ دلی خۆش دەبێ ، دەگەڕێ لەوشەیەك بزانێ بەچ تێکدەچێ تاوەکوپێی بلێ لەهەست ودەماری بدات٠ سوعبەتیش دووجۆرە : بەقسە ، بەجوولەوکردار، زۆرگالتەکردنیش کەسایەتی دادەبەزێنێ ولەبەرچاوی خەلك سووکی دەکات٠بەئەزموونی ژیان بینراوە زۆرجارگالتە بۆتەهۆی شەرم لەیەکترشکان وگەیشتۆتەئەوڕاددەیەی کەوا قسەی زبروناخۆش بەیەکتربلێن وناخۆشی وڕکابەری دروست ببێت وزۆرجاریش گەیشتۆتە ڕاددەی شەڕولێکدان٠ هەندێ جارگا لتەکردن پەیوەندی بەهێزدەکات وهەندێ جاریش بەهۆی گالتەوە پەیوەندی لاوازدەبێت وەیاهەرنامینێ مرۆڤەکانیش سروشتیان جیاوازە هەیانە پێی خۆشە گالتەی لەگەلدابکەی ، هەشیانە پێی ناخۆشەوتوڕە دەبێ هەندێ کەسیش گالتەکەیان بەڕاستە ، بەلاٚم بەشێوەی سوعبەت ، بۆنموونە هەندێ کەس حەزی لەسەعاتی دەستی کەسێکە بەناوی گالتە پێی دەلێ : ئەم سەعاتەم بدێ لەوانەیە کەسەکەحەزنەکات ، بەلاٚم لەشەرمان بیداتێ ، ئەم جۆرەوەرگرتنە بەزەوتکردن ئەژماردەکرێ لەڕوانگەی ئەم فەرموودەیەوە :(لایحل للرجل ان یاخذ عصا اخیە بغیرطیب نفسە) رواە احمد واتا :(بۆهیچ کەسێك حەلال نییە گۆچانی براکەی ببات بەبێ ڕەزامەندی دلی)٠هەندێ کەسیش ئەگەرگالتەی کرد تێدەپەڕێنێت وقسەی ناشیرین ونابەجێ دەکات پێویستەئەوجۆرە کەسانە گالتەی لەگەلْ نەکرێت وبواری نەدرێتێ ، هەروەهاپێویستە مامۆستا خۆی لەگالتەوسوعبەت بپارێزێت ، چونکە ئەگەربۆخەلکی ئاسایی خراپ بێت بۆمامۆستا خراپترە٠چونکە ئەگەروانە بێت قسەیان بەهەند وەرناگرێت

وكاريگەرييان نابێت ، هەروەها يەكێك لەگا ڵتەكوشندەكان (درۆی نيسان)ە ، كەلەناكاوهەواڵێكی زۆرناخۆش بەكەسێك دەدات وكەسەكە يەكسەرتووشی جەڵتەدەبێت ، يان لەپە لەپەلييان تووشی ڕووداوی هاتووچۆدەبێت٠ هەروەهازۆرجاربەناوی گاڵتەوە جنێوی ناشيرين بەيەكتردەدەن ، هەندێ كەسيش بۆگاڵتە بۆكس وشەق وپێلاقە لەيەكتردەدەن كەزۆرجارلەيەكترزويربوون وشەڕيش لەنێوانيان دروست دەبێت ، ياخوودبە سەيارە دەشكێنيتەوە سەری ، وەهەندێ كەسيش بەناوی گاڵتەلەناومالێ مندالێ ، مندالێ دەترسێنێ بۆنموونە : كارەبا لەسەرمنداڵی دەكوژێنێتەوە ياخودبە دەمامكی ناشيرين (قيناع)بەشێوەی ئاژەڵی دڕندە خۆی نيشانی مندا ڵەكەی دەدات٠ئيمامی عومەر(خوای لێ ڕازی بێ)وتوويەتی :(ئەوەی زۆرپێبكە نێت ڕێزی كەم دەبێتەوە ، ئەوەش گاڵتەبكات پێی سووك دەبێت ، كەسێكيش شتێك زۆردووبارەبكاتەوە پێی دەناسرێتەوە ، ئەوەی زۆربدوێ تووشی هەڵە دەبێت٠٠٠هتد) بۆيە دەبێ گاڵتەوگەپ كەم ودەگمەن بێت٠كاتێ برادەرێكت شتێكت لێ بشارێتەوە تۆش واتێدەگەی شتەكەت بزركردووە يان قسەيەكی ترسناكت بۆدەگێڕيتەوەلەپاشان دەڵێ : گاڵتەم كردئەوئازاری تۆی دا٠

لەبارەی نهێنی دركاندن :

نهێنی دركاندن شتێكی ناپەسندوقێزەونە بەتايبەتی ئەگەربەزيان كۆتايی پێبێت ئەگەرزيانيشی نەبێت هەرنەگوتنی باشترە ، نهێنی لەناوەكەی داديارەدەبێ پارێزراوبێ ، ئەمەش جگەلەوەی خيانەتە ، سيفەتێكی دووڕوويشە ، چونكەپێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ) فەرموويەتی : (اذااؤتمن خان) واتا :(ئەگەرئەمانەتی لادانرا ، خيا نەتی لێدەكات) ، تەنيا (شت ومەك)يش بەئەمانەت دانانرێت ، قسە ش بەئەمانەت دادەنرێت ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەر موويەتی : (الحديث بينكم امانة) (حەديسێكی مەرفوعە) ، واتا : (ئاخاوتنی نێوانتان ئەمانەتە) ، تەنانەت پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) كە(حوزەيفە)ی كردبووبەئەميندارى ناووسيفاتی دووڕوو ەكان ، هيچ لەهاوەڵانی لێ ئاگادارنەكردۆتەوە ٠ كەسێكيش نهێنی نەپارێزێت بەكەسايەتييەكی لاوازدادەنرێت ، ئەمەسەرەڕای ئەوەی كەخەڵكی خۆيانی لێ دەپارێزن ومتمانەی پێناكەن٠لەتوێژينەوەيەك كەڕۆژنامەی (دەيلی ميل)ی بەڕيتانی بلاَويكردۆتەوەدەركەوتووە كەژن ناتوانێ نهێنی بپارێزێ ، ڕۆژنامەكەدەڵێت : ژن ناتوانێت لە(٤٧)سەعات زياترپارێزگاری لەنهێنی بكات ، لەبەرئەوەی بەسروشتی خۆيان حەزيان لەقسەيە٠توێژينەوەكەكە(٣)سێ هەزارژن بەشدارييان تێداكردووە دەركەوتووە كەژن دوای تێپەڕبوونی(٤٧)سەعات نهێنييەكەبەكەسێك دەڵێ ، هەروەك سێ بەشی ئەوانەی لەم توێژينەوەيەبەشدارييان كردووە وتوويانەدوای ئەوەی كەنهێنييەكەيان وتووە هەستييان بەپەشيمانی كردووە٠

**لەبارەی بەڵێن شکاندن :**

**بەڵێندان یەکێکەلەوئەرکەکۆمەلآیەتییانەی کەلەدوای کارێکی خراپ ونەشیاودێت ، بەڵێن دەدات جارێکی ترئەم کارەدووبارەنەکاتەوە هەندێ جاریش بۆجێبەجێکردنی کاری باش دێ٠مرۆڤ کاتێك بەڵێن دەدات دەبێت بیباتەسەر، کەسێکیش بەڵێن نەباتەسەرکەسایەتی لاوازدەبێت ، ئەمەبێجگەلەوەی سیفەتێکی دوڕوویی لێ دێتەدی٠ دەگێڕنەوەکاتێك (عەبدولآی کوڕی عومەر) (خوای لێ ڕازی بێ) لەسەرەمەرگ نزیك بۆوە وەسیەتی کردوگوتی :(کابرایەکی قوڕەیشی هات وداوای کچەکەمی کردمنیش نیمچە بە لێنێکم پێدا ، جانامەوێ بەسیفەتی نیفاقەوە بچمەحزووری پەروەردگار، بۆیە بڕیارم دا ، کچەکەی خۆمی پێبدەم٠وە واچاکە هەربە لێنێکت دا ، بلێی(**ان شاءالله**)(تێبینی : (انشاء الله) ئەوهابنوسرێ هەڵەیە دەبێ فاصل هەبێ لەنێوان ان ووشەکەی تر) ، چونکەئەگەر ڕێگردروست بوولەهێنانەدی پەیمانەکە ولەتوانادانەبووجێبەجێ بکرێت ، ئەوارەنگەگوناهبارنەبیت٠** (ولاتقولن اني فاعل ذلك غدا الا ان يشاء الله ) الكهف : ٢٣ **واتا : (هەمیشە بلێ : ئەگەرخودا ویستی لەسەربێ فلأن کاردەکەم ، هیچ بڕیارێك مەدەن بەبێ وتنی (ان** شاء الله **) (بۆنموونە کابرایەك دەیەوێ بڕوات بۆگەشت لەپرئۆ تۆمبیلەکەی پەکی دەکەوێ ، یاخود خێزانێك خۆیان ئامادەدەکەن بچن بۆشوێنێك لەپڕمیوانیان دێ)٠ئەمەجگەلەوەی بەعەیب دادەنر ێت کەسێك بەویست وهەڵبژاردنی خۆی بەڵێن وپەیمانێك بدات ، دواتربەبێ هیچ ڕێگرێکپەشیمان بێتەوە ، ئەوکەسەلەچاوی خەڵك بچووك دەبێتەوەومتمانەی پێناکرێت ، وەئەگەردڵنیانەبوویت لەتوا نای جێبەجێکردنی بەڵێنەکانت بەڵێن نەدەی ، وەئەگەرڕێگردروست بوونەتوانرا بەڵێنەکەجێبەجێ بکەیت ، دوای گەردن ئازایی لەکەسە بەڵێنپێدراوەکەبکەی وهۆکانی بۆباس بکەیت٠(دایکی ئیمانداران عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) ، دەڵێ : پێخەمبەر(د رودی خوای لەسەربێ) لەنوێژدا دەپارایەوە : خوایەمن پەنادەگرم بەتۆلەسزای گۆڕولەفیتنەی دەجال وپەنادەگرم بەتۆلەفتنەی ژیان ومردن ، خوایەپەنادەگرم بەتۆلەهەرشتێ تووشی گوناهم بکات لەقەرزێك کەنادرێتەوە ، عائیشە دەڵێ : یەکێ وتی : ئەی پێخە مبەری خوا بۆئەوەندە پەنادەگری لەقەرزاری ؟ فەرمووی : پیاو ئەگەرقەرزاربووقسەدەکات ودرۆدەکات ، بەڵێن دەدات ونایباتە سەر)٠**

**لەبارەی درۆکردن :**

**درۆکردن واتاباسکردنی شتێك کەدووربێت لەڕاستی٠درۆکردن سیفەتێکی بۆماوەیی نییە ، بەڵکوفێری دەبین٠بۆنموونەبەڵێنی درۆبەمنداڵ بدرێ ، بەڵکوهەرشتێکی پێ وترادەبێ بۆی جێبەجێ بکرێ ، چونکەمنداڵ لاسایی گەورەکان دەکاتەوە٠**

**درۆکردن بەهۆی زیانەکانییەوەحەرام کراوە ، بەلأم ئەگەردرۆکردن بەقازانج کۆتایی هات ، وەك ئەوەی کەسێك بەدرۆکردن نێوانی دووکەس چاکبکاتەوە ئەوەبەدرۆناژمێردرێ ، یاخودببێتەهۆی نەهێشتنی ڕژانی خوێن٠ تەحسین حەمەغەریب لەکتێبەکەی دا :(ئەخلاقناسی) ، دەڵێ : (زۆرجارئەوشتانەی ئەخلاقن**

لەناوخۆیان داهاودژن ، بۆنموونە : بەڵێن وڕاستگۆیی ، کەسێك لای تۆخۆی حەشارداوە تۆش بەڵێنت داوە کەهەرگیزلای کەس باسی نەکەیت کەسێکیش دێت هەواڵی دەپرسێت دەیەوێت کەشفی بکات ، لێرەدا تۆناتوانیت ڕاستگۆبیت وبەڵێنەکەشت بپارێزی) بەشێوەیەکی گشتی تۆنابێت درۆبکەی بەلاَم لەهەندێ حالەت دا دەبێت ئێمە سەیری دەرەنجام بکەین٠ زۆرجارکەسێك بەدرۆکردن کەسێکی کوشتووە ، وەك ئەوەی چۆتە لای پیرەژنێك پێی وتووە کەکوڕەکەی مردووە ، ئەویش نەخۆشی دڵی هەبووە مردووە٠ئەگەرکەسێك درۆبەناوی خۆیەوەبکات پێی دەوترێ درۆزن ، بەلاَم ئەگەربەناوی کەسێکی دیکەوەبیکات لەم حالەتەداپێی بوختان وەك بڵێی فلاَن لەگەڵ فلاَن پەیوەندییان هەیە یان ئەوقسەی پێوتی٠درۆچەندین جۆروچەندین پلەی هەیەدرۆهەیەئەنجامەکەی سامناك وترسناك دەکەوێتەوەواتا هەندێ درۆهەیەسەرەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە وەکوبوختان یان بڵێی فلاَن قسەی پێوتی جیایەلەوەی بڵێی بڵێ لەماڵەوەنییە ، نوستووە ، پێم نییەکەپێم بوودەتدەمێ ، یان نانم خواردووە زۆرسوپاس برسییەتیشی یان نەخۆش بووم یان جوانترین ئافرەتی سەرڕووی زەوی ئەمە مەترسی زۆرلەکردنی نییە٠هەروەهامووڕەشکردنەوەجۆرێکی تری درۆکردنە ، چونکەدرۆکردن دووجۆر : زارەکی ونازارەکی٠(کا)دەڵێ : بێ ژنی وایکردووە سمێڵ ڕەشکەمەوە ئەوەی من هانام بۆبردووە بۆئەوەیەژنێکی پێ هەڵخەڵەتێنم ، کەی دەستم لەوکەسەگیربووئیدی وازی لێ دێنم هەرچەندەدەشزانم لەڕووی شەرعەوەگوناهە ، بەلاَم جێبەجێکردنی ٠٠
(س ت) دەڵێ : سپی بوونی مووی مرۆڤ نیشاندانی پێنانی قۆناغی پیرییە تاوەکوفام بکات وبەخۆی دابچێتەوە بزانێ ئەوتەمەنەی ماویەتی بگەڕێتەوەلەکاری دین وچاکەسەرفی بکات ، من وای دەبینم ڕەشکردنەوەی سمێڵ خۆدزینەوەیەلەپیری وفێڵ کردنەلەخەڵك٠(ت)دەڵێ : (مکیاژکردن شاردنەوەی پەلەولەکەوسروشتی دەم وچاولەڕێگەی مکیاژەوەدەبێ) (ل)دەڵێ : (مکیاژزۆرلەکەم وکوڕی دەم وچاومان دادەپۆشێ)
ڕاستگۆیی لەبواری ژنهێنان دا :
فەرمان خەرابەیی لەنامیلکەی (کێ دەکەی بەهاوسەری ژیانت) ، دەڵێ : یەکێك لەوخالاَنەی کەدەبێت ڕچاوبکرێت لەکاتی دەستنیشا نکردنی هاوسەری ژیان ڕاستگۆییە ، بۆنموونە کاتێك پرسیارت لێدەکەن لەبارەی خۆت ، دایکت ، باوکت ، داب ونەریتت ، تەبیعاتت ، بەتایبەتی درۆی نێوان دووهاوسەرزیانی زۆردەبێت ، جاری واشە باجەکەی دەدات ، بۆنموونە کچێك مارەکراوەوتەلاق دراوە ماڵی باوکی کچەکەش یان کچەکە هیچ باسی ئەوبابەتەناکەن ولێی دە شارنەوە ، کوڕەکەش کچەکەدەخوازێت ، بەلاَم پاشان بۆی دەردەکە وێت کچەکە تەلاق دراوە زیان بەهەردوولادەگات٠ (هەرچەندە کە سێك تەلاق درابێ یان ژنی تەلاق دابێ مەرج نییەهۆکاری تەلاقەکە ئەوبێت) ، بەلاَم زۆرجارداب ونەریت بڕیاردەدات ولای خەڵکی جێگا ی پرسیارە٠ بۆیەنابێ تەنیاباسی ئەوشتانەبکات کەپێی بەرزدەبیتەو ەوباسی ئەوشتانە نەکات کەزیانی بۆی هەیە ، هەندێك کەسیش درۆ لەگەڵ خۆیان دەکەن ، کاتێك چاوی بەبەرامبەرەکەی دەکەوێت دڵی ناگرێت ،

بەلاَم دەلَیّت بەدلّمە ، بۆیەتوشی چەندین کیّشەوناخۆشی دەبن٠ فەرمان خەرابەیی لەنامیلکەی دا :(کیّ دەکەی بەهاوسەری ژیانت ؟) ، دەلّیّ :(ئافرەتیّك دەناسم کوڕیّك هاتەداوای کوڕەکەی بەدلّ نەبوو ، بەلاَم وتی بەدلّمە ، ئەوەبوو شوی پیّکرد ، دوای چەندمانگیّك پەشیمان بۆوەوهیچیشی پیّنەدەکرا ، بۆیەتووشی نەخۆشی دەروونی بووبووبەردەوام دەبوورایەوە بردیانە لای دکتۆری دەروونی ، دکتۆردوای پرسیارکردن بەگرفتەکەی زانی ، پیّی گوتن ئەگەرکوڕەکەتەلاقی بدات چاك دەبیّتەوە ، ئەوانیش داوایان لەکوڕە کەکرد تەلاقی بدات ، بەلاَم کوڕەکە ڕازی نەبوو ، دوای بینەوبەردە یەکی زۆرکوڕەکە ڕازیبووبەدەفتەریّك دۆلارتەلاقی بدات)٠ ئەوخالّەش پیّویستە دایکی کوڕەکەوکچەکە ڕوونی بکەنەوە ، لەڕووی بیرکردنەوە ئاوایە ، بەردەوام تورەیە هتد زۆرکەسیش هەن لەمالّی باوکیان ئازاردەدریّن بۆئەوەی قوتاری بیّت هەرکەسیّك بیّتە داوای قبولی دەکات وئەگەردلّیشی نەیگریّت دەلّیّت بەدلّمە ، زۆرکەسیش کاتیّك کچیّکی بۆدەدۆزنەوە لەشەرمی ئەوکەسە وەك بلّیی درۆلەگەلّ خۆی دەکات دەلّیّ بەدلّمە٠ (بڕوانە نامیلکەی : کیّ دەکەی بەهاوسەر ی ژیانت ؟ )

کەژالّ ئەحمەد (١٩٦٧ك - ) لەشیعریّکدادەلّیّ :

لەسپیّدەی ڕۆژانی دەستگیرانیدا

کوڕەدرۆی گەورەگەورەڕیزدەکات و

کچەش خەونی ڕەنگالّەیی

بەوقسانەوەدەبینیّ

لەدواییداشۆڕش وگەل

هەمان کوڕوکچن ، بەلاَم

ئەبن بەژن ومیّردی یەك

ئیترلیّرەوە دیرۆکی

خیانەت وهەراوتەلاق دەستپیّدەکات

شاعیربەراوردی نیّوان کچ وکوڕلەماوەی دەستگیرانیدادەکات لەگەلّ شۆڕش وگەل لەپیّش سەرهەلّدانی شۆڕش ودواتردا ، بەوجۆرە کوڕوەکوسەرانی شۆڕش دەکات کەچەنددرۆی گەورە بۆخەلّك دەکەن تادەگەن بەدەسەلاَت ، کچیش کەگەلیّك خۆشباوەڕوسادەیەوبڕوابەهەمووبەلّیّنەکان دەکات ، بەلاَم دوای گەیشتن بەئەرزی واقیع سەیردەکات شتەکان ڕیّك پیّچەوانەی خەون وخواستی ئەون٠ شاعیرباسی ناسنەوەی کەسایەتی ڕاستەقینەی پیاودەکات ، کەپیاودووکەسایەتی هەبیّ کەژن ناتوانیّ تیّیبگات :

ئەی ئەوەی ناتناسم

بیّگومانم لەوەی شوتیت

تاوەك چەقۆبەناختاڕۆنەچم

ناتوانم بزانم تۆچیت

شاعیرپێیوایەمرۆڤ قوڵەناتوانی بەئاسانی تێیبگەی ، چونکەتەواوشاراوەوداخراوە تابارگەکەی هەڵنەدرێ ناتوانرێ بزانرێ کرۆکی چی تیایە٠شاعیرکەسایەتی پیاوی لەوجۆرەی بەشوتی چواندووە کەئایاناوەرۆکی هاوتایەلەگەڵ ڕوخسارەکەی یان شتێکی جیاوازە لەوە ؟

**لەبارەی غەیبەت :**

ئیمامی غەزالی دەڵێ : غەیبەت ئەوەیەکەباسی براکەت بکەی کەپێی ناخۆش بێ ئەگەرپێیبگات٠واتاباسکردنی مرۆڤەبەخراپەئەگەرچی ئەوەشی تێدامەوجودبێت٠

ڕێپێدراوەکانی غەیبەت :

١-ئەگەرکەسێك زوڵمی لێکرابێت ، بیەوێت هەقی خۆی وەرگر ێت ، بیەوێت باسی زوڵمکردنی ئەوکەسە بکات کەهەقی لێ زەوتکردووە٠

٢-ئەگەرڕاوێژوپرسی پێکرادەربارەی کەسێك لەژنهێنان وڕوونکردنە وەی سیفاتەکانی٠

**لەبارەی نەمیمی(قسەگێڕانەوە) :**

گێڕانەوەی قسەیەکە کەخاوەنەکەی پێی ناخۆش بێ٠ بۆنموونە : بەکەسێك بگوترێ فلاٌ نەکەس قسەی پێ وتووی ، ئەمەش دەبێتە هۆی لێککردنی خۆشەویستان ، هۆی نەمیمیش بەمەبەستی دەربڕ ینی دڵسۆزی وخۆشەویستییەبۆکەسی قسەبۆکراو ، یاخوددەروونی بەدوحەزکردنە بەزیان گەیاندن بەکەسانی تر ، ئەوکەسەی قسەشت بۆدەهێنێ پێویستە یەکسەربڕوای پێنەکەی ولێی بکۆڵێتەوە٠

**لەبارەی دووزمانی :**

ئەم تاوانە شێوەیەکی تری نەمیمییە وگێڕانەوەی قسەی دووکەسی ناکۆکە بۆیەکترلای هەریەکێکیان زەمی ئەوی تردەکات تادوژمنیایە تییان زیاتربێت٠ دووزمان هەوڵدەدات خۆی بەکەسێکی دڵسۆزلای هەردوولاپیشانبدات ، هەردووکان دەکات بەگژیەکدا٠ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(أن شر الناس ذو الوجهين الذي ياتي هؤلاء بوجه و هؤلاء بوجه)متفق عليه

واتا :(لەخراپترین کەسان ئەوانەن کەدووڕوون ، بۆکۆمەڵێك ڕویێکیان هەیە ، بۆکۆمەڵێکی تریش ڕوێکی تر)

(بڕوانە نامیلکەی : ئافاتەکا نی زمان لەنوسینی ئیمامی غەزالی )٠

**لەبارەی زمانی جەستە :**

زمانی جەستە : بریتییەلەوبیرکردنەوەوکردارانەی کەبەقسەدەری نابڕین ، بەڵکوبەهەندێك جوولە دەری دەبڕین٠یاخودبریتییەلەجولەی جەستەوچۆنیەتی ڕاوەستان ودانیشتن وئاماژەکانی ڕوو٠جولەی

جەستەبەشێکەلەپێکهاتەی قسەکردن بۆنموونە ڕەگەزی کچ جولەی سەربۆپۆزلێدان وڕاکێشانی سەرنجی بەرامبەربەکاردەینێت بەجولەیەکی خێراپرچی سەرڕوویان لادەبەن٠لەباری دانیشتندائەگەرکەسەکەلەسەرزەوی دانیشتبوو سەری لەسەرئەژنۆی دانابوو ، واتای غەم وپەژارەدەگەیەنێ٠ ئەگەرلەسەرکورسی ومێزبوونێوچاوانی لەسەرلەپی دەستی دانابوودیسان واتای غەم وپەژارەدەگەیەنێ٠لەباری دەربڕینەکانی جولەی چاودەوترێ : (چاوی پێدەچێ ، لەچاوی ڕادیارە ، چاوی سۆربووە)٠لێکخشاندنی دەست زۆرجاردەبینین کەسەکەهەردوودەستی لێکدەخشێنێ لەهەمان کاتداپێدەکەنێ ، بەپێی ژینگەکەلێکدانەوەهەڵدەگرێ ، دەشێ ئەوکەسەلەپیلان وفێڵێك سەرکەوتبێ وەیان بەئەنجامدانی کارێك وەیابڕیارێك دڵخۆش بێت٠لەژینگەی سارددااواتای خۆگەرمکردنەوەدەدات٠

١-دەستمان لەسەردەست داناوەلەپێشەوە ، ئەوجۆرەڕاوەستا نە نیشانی دەدات کەزۆربەڕێزوەستاوین٠

٢-دەستەکانمان لەناوگیرفان داناوە ئەوشێوەڕاوەستانە بەئاسایی دانەنراوە٠

٣-کاتێك شەقاوەکان بەشەقامەکاندا دەڕۆن ، سینگیان دەردەپەڕێنن وباڵەکانیانلێکدەکەنەوە٠

٤-دەست لەکەمەرگرتن بۆناوەوەی جەستە وکردنەوەی قاچەکان خۆی نیشان دەدات کەدەسەڵاتێکی گەورەی هەیە٠

**لەبارەی یاری تۆپی پێ :**

لەزۆربەی وڵاتانی جیهان دا یاری تۆپی پێ بۆتە شتێکی گرینگ ولەهەمووئاستەکانی کۆمەڵگا لەدەوری کۆبوونەتەوە ، لەکاتی بەڕێوەچوونی یارییەکان دا زۆرجاردیاردەی ئاژاوەگێڕی بەسەرهاندە رانی یانەکان دازاڵبووە ، وەکوهاتوهاواروجنێودان بەحەکەم وفڕێدانی دەبەی ئاولەگۆڕەپانی یاریگاکان کەزۆرجارکارەساتی دڵتەزێنی لێکەوتۆتەوە ، وەکو :

١-خۆکوشتنی بەکۆمەڵی دوازدە کەس لەوڵاتی بەڕازیل بەهۆی خەمی سەرنەکەوتنی هەڵبژاردەکەیان لەجامی جیهانی (١٩٦٦)٠

٢-هەرلە بەڕازیل ساڵی (١٩٨٢) لەیاری نێوان هەردوویانەی (سان لویس) و(فۆرتالیزا)سێ کەس بوونەقوربانی وبیست وپێنج کەسی دیکەش برینداربوون٠

٣-لەیەکێتی سۆڤیەتی جاران ساڵی (١٩٨٢) لەیاری نێوان هەردوویانەی(سپارتامۆسکۆ)و(هارلم)شەست ونۆهاندەربوونەقوربانی وسەدکەسی دیکەش برینداربوون٠

٤ – ساڵی (١٩٨٥) دەمەقالێیەك بووە هۆی کوژرانی سی ونۆهاندەری ئیتاڵی لەپشتیوانانی یانەی (یۆڤانتس) لەمیانەی یەکێك لەیارییە کانی یەکێتی تۆپی پێی ئەوروپا ، کەلەنێوان هەردوویانەی یوڤا نتسی ئیتاڵی ولیڤەرپولی ئینگلیزی ئەنجام درا٠

٥ – ساڵی (١٩٨٨) لەیاری پێش کۆتایی یەکێك لەپاڵەوانیەتییەکانی ئینگلتەڕا کەلەنێوان هەردوویانەی (لێڤەرپول) و(تۆتنگهام) ئەنجام درا ، بەهۆی کاری ئاژاوەگێڕی هاندەرانەوە(٩٥) نۆهەدوپێنج کەس بوونە قوربانی و(٢٠٠) کەسی دیکەش بریندداربوون٠

٦ – لەساڵی (٢٠١٢) لەخولی میسری لەیاریگای (پورسەعید) لەنێوان هەردوویانەی (ئەهای) و(میسر) حەفتاوسێ کەس کوژران٠

**لەبارەی لێخوڕینی ئۆتۆمبیل :**

**پەیوەندی نێوان ئەخلاق وئەم بابەتە چییە ؟**

ئەخلاق دەبێ لەهەمووشتێکدا بوونی هەبێت لەلێخوڕینی ئۆتۆمبیل یش٠

(مرکب) : بریتییەلەئۆتۆمبیل وکەشتی وبەلەم وشەمەندەفەروماتۆڕ وپاسکیل وفڕۆکەوسەرجەم هۆیەکانی هاتوچۆ ، واتا هەرشتێك کەبڕ ات یاخودڕابکێشرێت بەئۆتۆمبیل دادەنرێت٠ ڕۆژانە چەندین ڕوودا وی ناخۆش ڕوودەدەن وچەندین کەس دەبنەقوربانی ومردن وبریند اربوون وکەم ئەندام بوون٠ ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (دەبلیۆ ئێچ ئۆ) لەبواری هاتوچۆ ، دەڵێ : (لەساڵی (٢٠٠٧) نزیکەی(١٢٥٠٠٠٠) کەس گیانیان لەدەست داوەو ڕۆژانەلەگشت جیهان نزیکەی(١٤٠٠٠٠) کەس برینداردەبێت و(٣٠٠٠) کەسیش لە گشت جیهانداگیان لەدەست دەدەن٠ هەندێ جارسەرنشین کاتێ لەئۆتۆمبیل دادەبەزێ ، شوفێرئۆ تۆمبیلەکەی بەتەواوی ناوەستێنێ ، یاخود لەنێوپاسێکدا لەپڕیەکێك لەسەرنشینەکان داوای وەستان دەکات ، خۆئەگەرشوفێرەکەلەبەرنە بیستنی دەنگی یان لەبەرنەبوونی جێگەی دروست بۆوەستان چەند مەترێك زیاتربڕوات کەدادەبەزێت بەتوندی دەرگای ئۆتۆمبیلەکە پێوەدەدات٠

ئیمامی عومەر(خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ :(ئەگەرهێسترێك سەرسم بدالەلێواری فوڕاتدالەم بارەیەوەپرسیارلەعومەردەکرێت) ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) وتوویەتی :(کم من شهوة ساعة أورثت حزنا طویلا) واتا : (زۆرجارڕابواردن وتام وچێژی کاتژمێرێك مرۆڤ دەخاتە دڵتەنگی وپەژارەیەکی درێژخایەن)٠لەساڵی (١٨٢١) ئینگلیزەکان توانیان عەرەبانەی وادروستبکەن کەبە هێزی هەڵم بڕوات پێویست بەبەکارهێنانی ئەسپ نەما ، بەڵام لە ئەسپ سواری مرۆڤ تەنیا دەست وقاچی دەشکا وتەنیازیان بەخۆی دەگەیشت٠

**کارمەندی دەزگافەرمییەکان :**

کارمەند ئەوکەسانەدەگرێتەوەکەلەدەزگاحکومییەکان کاردەکەن٠ بۆیەلێرەدالەبەرامبەرئەوڕۆڵەگرینگەی کارمەند هەیەتی چۆن ئەرکی لەسەرشانە لەهەمان کاتیشدا مافەکانی پارێزراوبێت وڕ ێزلەکەسایەتی بگیرێت ، کارمەندیش پێش هەمووشتێك مرۆڤە مۆڵەتەکانیش لەسنووری مافەکانە ، هەمووکارمەندێك دەبێت پشوو ێکی هەبێت بۆئەوەی چالاکی خۆی نوێبکاتەوە ، هەروەهابارو دۆخی کۆمەڵایەتی وتەندروستی

وا لەکارمەند دەکات داوای مۆڵەت بکات٠بێگومان سەرەتاهەرمرۆڤێك لەشوێنێك دەستبەکاردەبێت ئەوتوانایەی نییە سەدلەسەدهەمووئیش وکارەکان بەشێوەیەکی تەواوبزانێ هەموانیش سەرەتابەم شێوەیەبوون ، بەلاّم بەتێپەڕبوونی کات فێری کارەکەی دەبێت٠

**لەبارەی قومارکردن :**

قومارگەورەترین کارەساتە ، مرۆڤ لەڕووی مادیی ومەعنەوییەوەتێکدەشکێنێ٠زۆرکەس لەقومارداخانووی دۆڕاندووە ، زۆرکەسیش لەسەرەتاداخاوەن ماڵ وسامانێکی زۆربوون بەهۆی قومارکردنەوەهاتوونەتەسەرساجی عەلی٠زۆرجارقومارسنورەکۆمەلاّیەتی وئەخلا قییەکانیش دەبەزێنێ کاتێك سەرمایەیان بەدەستەوەنامینێ گرەولەسەرکچەکانیان دەکەن! کەلەڕاستیدائەمەگەورەترین کارەساتە٠(ك) هاوسەری پیاوێکی قومارچییە دەڵێ : ((مێردەکەم شەوانەتاسەعات یەك ناگەڕێتەوەماڵ ، جگەلەوەی هەمووناومالّی دۆڕاندووە کەوتۆتەژێرباری قەرزاریشەوە لەسەرئەم ڕەفتارەچەندین جارلێی تۆراوم وبۆماوەیەك ماڵم بەجێهێشتووە ، بەلاّم سوودی نەبووە ، ئەگەرهەربەم شێوەیەبمینێتەوە ئەواناچارم لێی جیاببمەوە))٠(ج) کەپیاوێکی قومارچی بووە پاش ئەوەی هەموومالّەکەی دۆڕاندووە هەستدەکات ناتوانێ بەدەستی بێنیتەوە کەماڵ وئۆتۆمبیلەکەی دۆڕاندووە سەدهەزاردۆلاریش قەرزاربووە ، دواجارتوانای نەماوەکرێی خانووش بدات وبژێوی خێزانەکەی دەستەبەربکات دەمەوئێوارەیەکی درەنگ بەفیشەکێك کۆتایی بەژیانی خۆی دەهێنێت٠قومارمەترسیدارترین هۆکارەبۆلادانی کۆمەلاّیەتی وپێگەوکەسایەتی خاوەنەکەی لەناوکۆمەڵدالەناودەبات٠

## بەشی سێیەم

**جوانی :**

**جوانی دیارییەکەخوا(جل جلالە) ئەیدابە مرۆڤ ، جوانی هێزێکی بە تینە٠خوای گەورەکەسی لەجوانی بێبەش نەکردووە٠ ئەگەرجوانی لەشیشی پێنەبەخشیبێ ، جوانی دیکەی پێبەخشیوە ، یان جوانی کردەوەورەوشتی پێبەخشیوە یاخودجوانی زیرەکی ، ڕووخۆشی پێبەخشیوە٠ وتراوەلەدووکەس نزیک مەکەوە :**

**١-پیاوێك هەمووسەرمایەکەی پارەبێت٠**

**٢- ژنێك هەمووسەرمایەکەی جوانی بێت٠**

**شاعیردەڵێ :**

**جوانی ڕەنگ وجوانی خوو**

**جوانی بیری پێشکەوتوو**

**جوانی نامووس و ئابڕوو**

**بەنرخن تێکڕا هەموو**

**جوانی بریتییەلە شتێك کەسروشتی مرۆڤ حەزی لێدەکات وچێژی لێوەردەگرێ٠ دەبینین چێژولەزەتی چاولەدیتن دایە(سەیرکردنی شتی جوان وسەرنج ڕاکێش خۆشییەبۆچاو ، ئارامییەبۆدڵ ومێشك ئاسودەدەکات ، بەڵام زیاتردیمەنی سروشتی وەکودەریاودەشت وچیا وگوڵ وگوڵزار٠بەڵام دیاردەی سەیرکردنی مرۆڤ بۆمرۆڤ دیاردەیەکی ناشیرینە ، تەماشاکردنیش جۆری هەیە : هەمانەدیتن وبەرێکەوتەهەشمانە بەئەنقەست وبۆچێژوەرگرتنە ، بۆنموونەکەکچێك بەرێگادادەڕوات گشت چاوەکان سەیری دەکەن لەهەمووشیان خراپترئەوەیەکەوائافرەتێك لەگەڵ پیاوێکدایە کەلەوانەیەهاوسەریەتی یان خوشکییەتی ئەمەزۆرناڕەوایە٠زۆرجارئافرەت پۆشتەشەسەیری دەکەن زۆرجارلەگەڵ سەیرکردن قسەی ناشیرینیش دەکەن بەتایبەتی ئەوئافرەتانەی زیاترلەحالەتی ئاسایی خۆیان سفوردەکەن هەندێ جار ئافرەتەکەخۆی جوانکردووە وای لەخۆی کردووە ببێتەهۆی سەرنج ڕاکێشانی پیاوان ، پۆشتەیی باشترین شتەبۆرێگەپێنەدان بەم دیاردە یەلەرپیپۆرتاژێکی گۆڤاری خاتوزین ژمارە (٣١)ی ساڵی (٢٧٠٦)ی کوردی (گ)دەڵێ : ((من بۆئەوەخۆم جوان دەکەم تابتوانم سەرنجی کورێك بەلای خۆمداڕابکێشم))٠(ی س) دەڵێ : ((کچان بۆئەوەخۆیان جوان دەکەن تاکوکورێك بدۆزنەوە پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەنجام بدەن)) (ع) دەڵێ : ((مەرج نییەخۆڕازاندنەوەی کچان بۆڕازیکردنی دڵی کورێك بێت)) (ڕع) دەڵێ : ((ئافرەت**

هەمیشەهەوڵدەدات بەجوانترین شێوەخۆی دەربخات ، بەلاَم لەقۆناغی کچێنی دائەم هەوڵەزیاترە))٠هەروەهاخۆڕازاندنەوەی ئافرەت ساختەیی وفێڵ وهەڵخەڵەتاندنی تێدایەبەتایبەتی کاتێك ئافرەت مکیاژێکی زۆردەکات سەداهەشتاجیاوازی هەیەلەگەڵ جوانی سروشیی خۆی٠

گۆران (١٩٠٤ هەڵەبجە – ١٩٦٢سلێمانی) دەڵێ :

پایز ، پایز

شان ومل ڕووت

لێکچواندنی پایزەبەئافرەتی ڕووت ، داری بێگەلاَی بەئافرەت چواندووە٠لێکچواندنی درەختی پایزبەئافرەتی ڕووت لەشیعری قوبادی جەلیزادەش دەبینرێ :

پایزان باغ

لەشۆڕەژنێك دەچێ

ڕووت

ڕووت

چەمکی جوانیناسی کەئیستاتیکی پێدەوترێ واتای هەستەکان دەدات لەبنچینەدائەم زانستەلەوجوانی وناشیرینییانەی کۆڵیوەتەوە کەلەڕێی هەستەکانەوەدەرکیان پێکراوە٠یەکەمین کەس زاراوەی ئیستاتیکای بەکارهێناوە فەیلەسوف (ئەلیکسەندەربۆمگارتی) بوولەسەدەی هەژدەلەساڵی (١٧٥٠م) کاتێك لەکتێبی (وردبوونەوەلەشیعر) ئەم زاراوەیەی بەکارهێنا٠جوانیناسی زانستێکەلەهەست وچێژەکان دەکۆڵێتەوە ، بەلاَم مەرج نییەئەوەی چێژبەخش بێت جوان بێت بۆنموونەلەوانەیەکەسانێك هەبن لەدیمەنی کوژرانی خەڵك چێژوەربگرن٠بەپێی بۆچوونی (سوکرات) ئەوگولینانەی کەبەئەسپەوەدەکرێن جوان نین ، بەلاَم ئەوزینەی لەسەرپشتی دادەنرێت جوانە زینەکەهەمبەکەڵکەهەم جوان ، بەلاَم لەڕاستیداجوانی خۆی مەبەستەبێئەوەی مەبەستێکی هەبێ بۆنموونەئەگەرقسەلەسەر(گوڵ) بکەین مەبەستەکەتەنیاجوانییە٠جوانیش شتێکی ڕەهانییە ، ڕێژەییەواتالەکەسێکەوەبۆکەسێکی تردەگۆڕێ ، هەروەهائەوەی ئێستاجوانەمەرج نییەبەجوانی بمێنێتەوە بۆنموونە مرۆڤێك ئێستالەتەمەنی گەنجیدایەجوانە ، بەلاَم کاتێك پیردەبێ ئەوجوانییەی نامینێ٠جوانی شتێکی ڕێژەییە بۆنموونە گۆرانی بێژ (حەسەن زیرەك)وتویەتی :

سپی سادەشەش دینار

سوروسپی شەشست دینار

ئەسمەربێ وخاڵ لەڕووبێ

هەزاروشەشسەددینار

هەروەهادەڵێ :

سپی سادەبەلاشە

سوروسپی بێ باشە

ئەسمەربێ وخاڵ لەرووبێ

لەودنیائەوباشە

**جۆرەکانی جوانکاری :**

**یەکەم: جوانکاری قژ**

خوای گەورە مووی بۆپاراستنی سەری مرۆ ڤ دروستکردووە،وەکوقژی سەربۆپاراستنی سەری ئادەمیزادکەگرنگترین ئەندامی لەشی مرۆڤی تێدایە ئەویش مێشکە ، پاش تاقیکردنەوە بەدیارکەوتووە ، کەئەگەر (خەنە)چوارسەعات بەسەری هەرئافرەتێك بمێنیتەوە ، ئەواپێستی سەری لەهەموومیکرۆبێك پاقژدەکاتەوە ، قژتوندوتۆڵ دەکات وخوا ردەمەنیش دەداتە پێست ، خەنە بۆیەکی سروشتییە هیچ زیانێکی نییە ، بەلاّم ئەودەرمانانەی ئێستابەکاردێن هەموویان زیانبەخشن ، چونکەلەکەرەستەی کیمیاوی پێکهاتوون ، کەکاردەکەنە سەرکەمکر دنەوەی چەوری قژ ، ئەمەش بۆپێستی سەرباش نییە٠

نوژدار(ئەلیس کۆب)پسپۆری نەخۆشی قژوجوانی دەڵێت: (باشترین بۆیەبۆسەرخەنەیە ، چونکەلەسروشتەوەیە)گۆڤاری(وارڤین) لەژمارە (٢٩)ی ساڵی(٢٠١٠)بلاّوی کردۆتەوە ، (د ئینتیها) ، دەڵێ : (هەموجۆ رەڕەنگێك زیانی خۆی هەیە ، تەنهاخەنەوپێکهاتەکان هیچ زیانێکیان بۆسەرقژەپێستی سەرنییە)٠زۆرلەپسپۆڕانی بواری جوانکاری پێیان وایە کەیەکێك لەهۆکارەکانی پیسبوونی قژدەگەڕێتەوە بۆخراپی جۆری ئەوڕەنگانەی بەکاری دێنن ، هەروەهاڕەنگ کاریگەری لەسە رئافرەتی دووگیان هەیە ، بەشێوەیەکی گشتی ئافرەتی دووگیان ئا مۆژگاری دەکرێت ڕەنگ بەکارنەهێنن ، چونکە ئەگەری دروستبوو نی هەوکردن(التهاب)ی پێستوحەساسیەت دەبێت ئەوکات دەبێت دەرمان بخۆن ئەودەرمانانەش کاریگەری بۆسەرسکەکەی دەبێت ودەبێتەهۆی زیان گەیاندن بەتەندروستی کۆرپەلە،ئەوەی ئاشکرایە کەزۆربەدەگمەن دەبینین ئافرەت تووشی کەچەڵی بێت ، بەلاّم قژی کەم دەبێتەوە ، هۆی ئەمەش بۆهۆڕمۆناتی ئافرەت دەگەڕێتەوە کە ئافرەت دەپارێزێت ، هەروەهامرۆڤ ڕۆژی(٤٥)چل وپێنج داوەمووی لە

سەری هەڵدەوەرێت لەهەندێ کەس دەگاتە(٦٠)داوەموو ، بەلاّم لەبەر ئەوەی پێستی سەر(١٢٥٠٠٠)سەدوبیست وپێنج هەزارداوەمووی پێوەیە ، ئەم مووهەڵوەرینە بەزیانێکی وادانانرێت ، هەروەها مرۆڤ لەهەمووژیانی دابۆی هەیە( ١٥٠٠٠٠٠)یەك ملیۆنونیوداوەمووی لەسە ریدا هەڵوەرێ٠

**دووەم : جوانکاری لووت**

بابەتی نەشتەرگەری جوانی لووت حالەت نییە بەڵکوسنوری خۆی بەزاندووەوچۆتەخانەی دیاردەوە٠

لووت ئەندامێکی زۆرگرنگەلەلەشی مرۆڤ دا ، جگەلەوەی کەڕێگایە کی سەرەکییەبۆهەناسەدان وهەستکردن بەجۆرەکانی بۆن ، هەروەها ئەندامێکی دیارەلەڕواڵەتی مرۆڤ جوانکاری لووت بەزۆرترین نەشتە رگەری جوانکاری دەژمێردرێت ، شێوەی کەپووڕێك بێ یان ناڕێك نەخشی خودایەگوناه وتاوانە گۆڕانکاری تێدابکرێت، بەڵام ئەگەرناڕێکییەکە هۆکارەکەی بریداربوون وشکانی کەپوولەئەنجام ڕووداوێکەوەبووئەوەشتێکی ترەوخوای گەورەش باشتردەزانی.زۆرجارگوێبیستی ئەوەدەبین کەسێك بەهۆی نەشتەرگەری لوتییەوە لەژێرکرداری نەشتەرگەرییەکەبەهۆش خۆی نەهاتۆتەوەومردووە.بێگومان ئەگەرکەسێك لوتی کاریگەری کردبێتەسەرهەناسەدانی وجیوبی هەبێت ئاساییەبچێ نەشتەرگەری بکات ، بەڵام ئەگەرلەبەرئەوەبێ کەلوتی پانە یان گەورەیە ئەوەشتێکی هەڵەیە.ئەمڕۆدەبینین بۆتەمۆدیل وخەڵکێکی زۆرلاسایی دەکاتەوە.

سێیەم: جوانکاری ددان

ددان یەکێکەلەئەندامەگرینگەکانی لەشی مرۆڤ لەبەرئەوکارەگرینگا نەی ڕایدەپەڕێنێت لەبڕین وهاڕین وونجڕکردنی خۆراك وجوین ، (د هەڵگوردسالح)لەکتێبەکەی دا : (پاراستنی دەم وددان) ، دەڵێ : (ددان بۆمرۆڤ وەکودەعامییەی سەیارە وایەئەگەرئۆتۆمۆبیلێکی دوامۆدیل بکڕی ، دەعامیەکەی لابەریت هیچ لەجوانییەکەی نامینێت).سوودەکانی ددان :

١ – بڕین وهاڕینی خۆراك

٢ – یارمەتی قسەکردن

٣ – جوانی

چوارەم: جوانکاری لەپێ دا

پێڵاوی پاژنەبەرز ، ئەوانەی لەپێی دەکەن،چ پیاوبن یان ئافرەت ، بۆئەوەیە تا باڵایان بەرزبکەنەوە ، جگەلەوەش جل وبەرگە شۆڕەکا ن لەپیسبوون وقوڕولیتە دەپارێزێت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ئەم جۆرە پێڵاوانەدەبێتە هۆی گرفتی زۆربۆتەندروستی مرۆڤ،یەکێك لەوگرفتانە هەوکردنی بڕبڕەی پشت وپەیدابوونی مێخەکە لەپێی مرۆڤ.

پێنجەم: جوانکاری لە پۆشاك

جل وبەرگ یەکێکە لەهۆیەکانی جوانی مرۆڤ ، ئاژەڵ وپەلەوەرهەمو وجوانییەکەیان بەهۆی هەبوونی تووکەلەلەشیان ، جەستەی مرۆڤ پێویستی بەوەیەداپۆشرێ ،جەستەی مرۆڤ بەسروشتی خۆی شتێکی پێوەنییە کەمرۆڤ بپارێزێ ، بەپێچەوانەی گیاندارەکانی تر، چونکە گیاندارەکانی ترتوانای ئەوەیان نییەخۆیان پۆشاك بۆخۆیان دروست بکەن ، بۆیەدەبینین خوای گەورە بەپەڕوموودایپۆشیون. هەروەها هەربۆنەومەڕاسیمێك جل وبەرگی تایبەت بەخۆی هەیە بۆنموونە : ئافرەت کەدەچێت بۆتازیە ناکرێت جلی سووریان ڕەنگاوڕەنگ لەبەر بکات ، چونکە وا لێکدەدرێتەوە کەپێی خۆشەمردووەکە مردووە.جل

وبەرگ پێویستەلەهەمووڕوێکەوەتەواوبێت پاك وتەمیزبێت ، تەسك نەبێت چونکەجلی تەسك وتەنگ هەروەکوپشتێنی تەسك وپێلاوی تەسك کاردەکەنەسەرجولانەوەی خوێن لەلەشدا ، ئەوجێگایانەی تو ندپێچراوەبەوجلەتەسکانەخوێنی باشی بۆناچێت٠هەروەهانابێ کەس جلی یەکێکی تربەکاربێنێ پێش شوشتن وپاککردنەوەی٠لەسەهل کوڕی سەعدەوە (خوای لێ ڕازیبێ) دەڵێ : پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : (لەڕاستیدالەدەرگادان وڕوخسەت وەرگرتن دانراوەلەبەرپاراستنی چاوەکان)٠(چونکەلەوانەیەئافرەت ببینی بەبێ حیجاب)٠نوسەرێك دەنوسێت ودەڵێت : (سفوری ئەوەیەکەبەشێك لەلاشەی خۆی دەربخات کەلەڕووی شەرعەوە بۆی نییەدەریبخات مەگەربۆحەلالی خۆی نەبێ ، وەکودەرخستنی دەم وچاوی وقۆل ودەستی)٠

بەڵگەلەسەرئەوەی دەست ودەم وچاولەڕووی شەرعەوەجائیزەدیاربوونی :

١ – قورئانی پیرۆزلەسورەتی (نور)دا باسی ئەوجێیانەی کردووە کەجائیزەدەربخرێ ، ئەوەش لەفەرموودەی خوای گەورە : (ولا يبدين زينتهن الا ماظهرمنها) واتا : (زینەت وجوانی خۆیان دەرنەخەن جگەلەوەی کەدیارە وەك (دەم وچاوودەست)٠

٢ – ئەسمای کچی ئیمامی ئەبوبەکرچووبۆلای پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)کەپۆشاکێکی تەنکی لەبەردابوو ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ڕووی لێ وەرگێڕاوفەرمووی : ئەی ئەسماء ئەگەرئافرەت گەیشتەتەمەنی بێ نوێژی بۆی نییە ببینرێ تەنیائەوەوئەوەنەبێ ، ئاماژەی بۆدەم وچاوودەستەکانی کرد٠ئیمامی ئەبوداودڕیوایەتی کردووە٠ئێمەلەهەمووبوارەکانی ژیانداخۆمان وەك ئەوڕوپالێکردووە ئەوفەرموودەیەی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)زۆرجوان باسی ئەوحالەتەدەکات دەفەرموێت : (هەرکەس خۆی بەهەرنەتەوەیەك بچوێنێت ئەوەئەوکەسەلەوانە)٠لەناوکۆمەڵگەی ئێمەداسێ کەسایەتی ژن هەیە :

یەکەم : کەسایەتی ژنی ئاینی

دووەم : کەسایەتی ژنی داب ونەریت

سێیەم : کەسایەتی ژنی ئەوروپائاساکەتازەدەستی بەگەشەوزۆربوون کردووە٠

تێبینییەکی گرینگ :

پێویستکردنی داپۆشینی دەم وچاو ، ئافرەت مولزەم ناکرێ بەڵام ئەگەرئافرەتەکەبەرچاوبووبەخۆی کردی پاداشتی هەیە،چونکەبنچینەی جوانی دەم وچاوە ، بەڵام لەبەرپێداویستی ژیان٠٠٠

**سوودەكانی پۆشاك :**

**١ - داپۆشینی عەیب وعار :**

**شاردنەوەوپاراستنی عەیب وكەم وكوڕی لەهاوسەریش دەبینی ژن وپیاوبەجل وبەرگ چوێندراوە ، هەربۆیەقورئانی پیرۆزبەپیاودەڵێت : تۆلیباس وبەرگی ژنی ، بەئافرەتیش دەڵێ : تۆلیباس وبەرگی پیاوی٠(هن لباس لكم وانتم لباس لهن) البقرة : ١٨٧**

**١ - خۆپاراستن لەسەرماوگەرما٠**

**٢ - بۆجوانی وزینەت٠**

**٣ - هەروەهاجل وبەرگ جەستەلەئازاروزامی دڕك وداڵ وگەزتن وپێوەدان دەپارێزێ٠**

**شێوازی پۆشینی هەندێ شت ڕا ڤەی تایبەتی بۆدەكرێ:**

**١ - دانانی كڵاوی ڤیت بەلاری لەسەرپێشەوەی نێوچاوان بۆهەر زەكاروپیاوان نیشانەی بەدخوییە٠**

**٢ - هەروەهاكردنەوەی دوگمەی سینگیش نیشانەی بەدخوییە٠**

**(تێبینی : هەندێ لەیانەوەرزشییەكان وێنەی خاچیان لەكراس وهێماودروشمەكانیان داكێشاوە ، بۆنموونە : هەردوویانەی (ڕیال مەدریدوبەرشەلۆنە)ی ئیسپانی وێنەی خاچیان تێدایە ، هەروەها (لیڤەرپوول)ی ئینگلیزی وئەی سی میلان٠(ئەگەرچی پۆشینیان بەنییەت ومەقسەدیش نییە)٠هەروەهاخەڵكی ڕێزلەو كەسانە دەگرن كەجل وبەرگی خاوێن ومورەتتەب لەبەردەكەن وەكو(مەلامەشهور)كەچووبۆشاییەك جاری یەكەم بەجلی خراپ ، دواتربەجلی جوان٠ئابوریناسی ئەمریكی (تۆرستین وێبلێن)لەكتێبی (تیۆری چینی تێروتەسەل) كەلەساڵی (١٨٩٩)دابلاٌویكردۆتەوەدەڵێ:((جل وبەرگ بۆپیشاندانی پێگەی كۆمەلاٌیەتی وەك هێمایەك بۆسامان ودارایی بەكاردێ))٠**

**مۆدە :**

**مۆدە وشەیەكی فەڕەنسییەكەلەلاتینی وەرگیراوە ئەو وشەیەبەمانای شێوازوستایلێكەهەروەهاشێوەی ژیانیان٠(ئێسپێنسێر) پێی وایەمۆدەدەبێتەهۆی كێبەركێ لەناوچینی ساماندار، لەڕاستیدامۆدەلاسایی كردنەوەیەلەملمانێی خەڵكی دەوڵەمەندلەگەڵ یەكتری٠مۆدێرنیزمیش تێڕوانینێكی نوێیەبۆجیهان ومرۆڤ بەرامبەربەنەریت دەوەستێتەوە لەگەڵ دەستپێكی هەرساڵێك مۆدەمۆدیلی ساڵ دیاری دەكات بەمەش پارەیەكی زۆربەهەدەردەدرێ٠یاخود(تاتۆ)كەلەنەریتەوەبۆتەمۆدەكەخۆی خاڵ كوتانە (نەریتێكی نێگەتیڤە) ساڵی (١٧٦٩) كاتێك دەریاوانی بەریتانی (جیمس كۆك) چووبۆدوورگەكانی (هایتی) لەوێ بینی كەخەڵكی دوورگەكەوشەی (تائاتوو)بۆخاڵ كوتان بەكاردەیننتاتۆبریتییەلەكوتانی شوێنێك لەجەستەبەچەنددەرزییەك كەسەرەكەی شتێكی پێوەیەمەرەكەبی لەناوە بەپێست دادەكوترێت٠میسرییەكۆنەكان لەدژی چاوپیسی بەكاریان هێناوە ، پاشان بۆجوانكاری بەكارهێنرا ،**

یابانییەکانیش لەسەرەتاداتاتۆیان لەسەرنێوچاوانی تاوانباران دادەنا ، هەرچەندەئەوتاوانبارەتاوانەکانی دووبارەبکردبایەوە ئەوانیشانەکەیان زیاتردەکرد٠زاراوەی مۆدیل واتای داهێنان یان دروستکردنی هەرشتێك٠هەردووزانا(ڕالف تیرنرولویس کلیان)واپێناسەی مۆدیل دەکەن بریتییەلەوپرۆسەیەی گۆڕان بلآودەکاتەوەلەبەرئەوەهەندێ جل وبەرگ جاران بەلای خەلکەوەجوان بوون ، بەلآم بەتێپەڕبوونی کات سەردەمیان بەسەردەچێ وهیچ جوانییەك لەچاوسەردەمی کۆن بۆئێستانادەن٠

لاسایی کردنەوە :

میللەتی لاسایی کارواتامیللەتی تێکشکاو ، میللەتی لاسایی کراوەش واتائەومیللەتانەی زالبوون بەسەریانداوخستویانەتەژێرکاریگەری خۆیانەوە٠لەسەرئاستی کۆمەلگەش کۆمەلگایەك لاسایی کۆمەلگایەکی تردەکاتەوەواتاداب ونەریت وکلتوروعادەت وتەقالیدی خۆی تووشی کالبوونەوەدەبێت وچاودەبڕێتەکۆمەلگای دیکەولاسایی جل وبەرگ وداب ونەریت وتەنانەت ڕێوڕەسمی بۆنەکان لاسایی دەکاتەوە٠کۆمەلگاکانی ڕۆژهەلآت لەناویشیانداکۆمەلگای کوردی زۆربەخێرایی دەگۆڕێت ولاسایی کۆمەلگاکانی ئەوروپاوخۆرئاوادەکاتەوەبەتایبەتی مۆدەوشێوەی جل وبەرگ ، نکۆلیش لەوەناکرێ لاوازی لەبەرامبەرژنان لەلای زۆربەی پیاوانی دنیاهەیە٠(لا)زۆربەلایەوەئاساییەلاسایی ئەوئەکتەرانەبکاتەوەکەبەلایەوەجوانن دەلێ : وەك خۆشم لاسایی ئەکتەرەعەرەبەکان دەکەمەوە٠(پ)ئەوکچەلەپۆشینی لەچك وجۆروڕەنگەکان وشێوازی ئارایش وسەرپۆش لاسایی هونەرمەندوسینەماکاری ئێرانی (نیکی کەریمی)دەکاتەوە دەلێ : بەردەوام ئەولەچکانەبەکاردەینم کەئەوکچەئەکتەرەئێرانییەبەکاری دەینێ٠یەکێك لەوجوولەنائاساییانەی کەبۆتەحالەت زمان دەرهێنانەکەهەندێك پێیان وایەئەوجۆرەزمان دەرهێنانەهیچ جیاوازی نییەلەگەل شێوازی زمان دەرهێنانی سەگدا ، کەشتێکی وروژێنەروبەدرەفتارییە٠(م)دەلێ : ئێستاکوڕیش مکیاژدەکەن هەول دەدەن لەڕەگەزی ناسك نزیك ببنەوە) (چ) دەلێ : کاتێك کچان شێوازێکی کوڕانەهەلدەبژێرن یاخودکوڕان شێوازێکی کچانەهەلدەبژێرن بەڕەئی من ئەمەکارێکی جوان نییە ، هەردووڕەگەزدەبێ تایبەتمەندی خۆیان بپارێزن٠(ئا)ئەم کوڕەقژی درێژەدەلێ : ئەمبینی لەفیلمەکان کەسێك قژی درێژەیاخودیاریزانێك قژی درێژەهەمیشەحەزدەکەم لاساییان بکەمەوە٠(مەرج نییەقژی درێژهەمووکات ئەوەپیشان بدات ڕەگەزی خۆیان ڕەت بکەنەوە ، چونکەلەکۆندالەناوعەرەبان قژی درێژهەبووە٠)

شەشەم : ئالتوون (زێڕ) :

ئالتوون لەکۆنەوەلەلای زۆربەی میللەتان وەك خشلێکی بەنرخ سەیرکراوە ، لەسەردەمەکۆنەکاندا وەك پارەبەکارهاتووە لەکڕین وفرۆشتن ومامەلەدا ، بەلآم ئێستاوەك خشلی ڕازاندنەوەوجوانکاری بەکاردێ لەلایەن ئافرەتانەوە ، لەڕاستیدائالتوون لای ئافرەتان زۆربەنرخەوگرینگی زۆری هەیەلەلایان٠

حەوتەم : جانتا

جانتالەوپێداویستییەگرینگانەی ئافرەتەکەهەرگیزناتوانێت لێی دابڕێت لەکاتی دەرچووندا ، هەروەهاهۆکارێکەبۆدەرخستنی کەسایەتی٠وشەی جانتالەبنەڕەتداوشەیەکی تورکییەلەوشەی (شەنتا)وەرگیراوە٠جانتاهاوڕێی هەمیشەیی ئافرەتە ، جانتابۆئافرەت هاوشانی جزدانی گیرفانی پیاوە کەپیاوناسنامەوپارەی تایبەت بەخۆی تیادادەنێت٠

هەشتەم : جوانکاری لەمزگەوت

ئیمامی غەزالی دەڵێ : (لەم کارانەی خەڵکی لەم زەمانە فریویان پێ خواردووە ، جوانکردن وڕازاندنەوەی مزگەوتەکانە،خەرجکر دنی ماڵ وسامانێکی زۆرلەبیناسازی مزگەوتەکان وڕاخستنی فەرش وڕایەخی گرانبەهالەمزگەوتەکان کەبەبیدعەوکارێکی ناپە سند دادەنرێت ، وەنیشانەیەکە لەنیشانە خراپەکانی دنیاوێرا نبوون ، هەروەکو(دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (لاتقوم الساعه حتی یتباهی فی المساجد) واتا: (دنیاوێران نابێ تاخەڵکی شانازی دەکەن بەمزگەوت) هەروەها فەرموویەتی : (ماامرت بتشیدالمساجد)٠وەزانایان کۆکن لەسەرئەوەی نەخش ونیگاری مزگەوت بەناپەسند لەقەڵەم بدەن ، هەرئەوەندەبێت باووباران نەیگرێتەوە)٠ (ئیمامی غەزالی) ، لەبارەی نەقش و نیگاروجوانکاری لەمزگەوت دا لە (احیاءعلوم الدین) ، دەڵێ: (دەوڵەمەندان ئەوانەی کەمزگەوت دروست دەکەن داوادەکەن ناویان لەسەربنوسرێت ، ئەگەرمەبەستیان ناودەرکردن وناو نیشانێکی هەتاهەتایی نییە ، ئەگەرمەبەستیان ڕیاوخۆنواندن نییە ، خۆخوای گەورە نایان لەسەربنوسرێ ، یان نەنوسرێ دەزانێ ، دووەم : لەوانەیە هەرلەهاوسێیەکی هەژارێکی لێقەوماوهەبێ باشتروایەبەوهەژارەی بدات ، بەونەقش نیگاروجوانکا رییەسەرلەنوێژخوێنەکانیش دەشێوێنێ ، دیسان ئەگەرمەبەستیا ن خۆنواندن نییە خۆلەئاینی ئیسلامدا نەهی لێکراوە ، کاتێ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ویستی مزگەوتی (مەدینە) بکاتەوە ، جوبرەئیل(سەلامی خوای لێ بێ) هاتەخزمەتی وفەر مووی : (ئەم مزگەوتە حەوت گەزبەرزدروست بکە ، بەڵام مەی ڕازێنەوەونەقش ونیگاری بەسەرەوە مەکێشە) ، بۆیە باخەڵك وا نەزانن ڕازاندنەوەونەقش ونیگاری مزگەوتەکان ڕێزگرتنەلەمز گەوت ، بەڵکونوێژخوێنەکان سەرقال وغافل دەکات ویەکێکەلە داهێنراوە خراپەکان)٠

جوانکاری لەڕەوانبێژی :

ڕەوانبێژی واتا (ڕەوان گوتن) ، واتا گوتن ونوسین بەوشێوەیەی کەڕە وانەوکاریگەری لەسەردەروون داهەیە٠ جوانکاری بەشێکە لە ڕەوانبێژی ، کەبەهۆی ئەوەوە جوانی وڕێك و وپێکی قسەدەردەکەوێ ، ئەمەش دووجۆرە :

یەکەم : جوانکاری وشەیی

دووەم : جوانکاری واتایی

چەند نموونەیەك لەسەرجوانكاری وشەیی :

١-ڕەگەزدۆزی : بریتییە لەبوونی دوووشە كەلەدەربڕین داوەك یەك بن ، لەواتاداجیاوازبن٠مەلای جزیری دەڵێ :

گوڵی باغی ئیرەمی بۆتانم – شەب چراغی شەبی كوردستانم

٢- هێنانەوە : بریتییەلەبوونی دوووشەی هاوشێوە یان هاوڕەگە ز ، یەكیان لەكۆتایی دێرەكەدا دێت ، ئەوی تریشیان دەكەو ێتەسەرەتای نیوەدێری یەكەم یان ناوەڕاست یان كۆتاییەكەی یان سەرەتای نیوەدێری دووەم یان ناوەڕاستەكەی٠

مەحوی دەڵێت :

بەپیری ئەومەهەچووم وبەسەرچووم

پەری بوو ئەونەبوو شەوبوو بەسەرچووم

٣ – گێڕانەوە : بریتییەلەبەكارهێنانی چەندجارەی وشەیەك یان دەستەواژەیەك بەومەرجەی هەرجارەی لەپاڵ شتێكەوەهاتبێ٠

بۆنموونە (محەممەد حوسێن بەرزنجی) دەڵێ :

دارئەمرێ

ڕووبارئەمرێ

هەژارئەمرێ

زۆردارئەمرێ

مانگ وڕۆژدەترازێن وئەبنەچۆڵ

مرۆڤ ئەبنە نیشتەجێی گۆڕستانی چۆڵ

٤ – گەڕانەوە : بریتییەلەگەڕانەوەی شاعیرلەسەرەتای دێری دووەمدا یان سەرەتای نیوەدێری دووەم بۆجەختكردنەوە لەسەرواتا ، تائەووشە یان ئەووشانەی لەناوەڕاست یان لەكۆتایی دێری یەكەمیدا ، یان نیوەدێری یەكەمیدا هێناویەتی ، مەبەستیش لەمەتۆخكردنەوەی ئەووشەیەیە كەدووبارە دەگەڕێتەوەسەری٠

عەلی شێخانی دەڵێ :

سبەی جیاوازدەبێ لەگەڵ ئەمڕۆ

ئەمڕۆش جیاوازە لەگەڵ دوێنێ

بێگومان دوێنێ ش جیاوازبوولەگەڵ پێرێ

پێرێ ش لەگەڵ ڕۆژانی پێش خۆی

**٥ – دووپاتکردنەوە (تکرار) : بریتییەلەوەی شاعیروشەیەك یان دەستەواژەیەك یان ڕستەیەك بێنێ ، چەندجارێك دووپاتی بکاتەوە بۆچەندمەبەستێکی تایبەتی بەومەرجەی هەموویان واتایان یەك بێت ولەجارێکەوەبۆجارێکی ترواتایان نەگۆڕێت٠**

**بۆنموونە (کامەران مستەفا) دەڵێت :**

**دێینەوە ، دێینەوە**

**ئێمەدێینەوە**

**بەرەوولاتێکی وێران**

**بەرەوشاروشارۆچکەکان**

**بەرەوگوندەڕوخاوەکان**

**نمونەیەکی تر ، (ڕەفیق سابیر) دەڵێ :**

**بەتەنیاجێم مەهێڵە ، بەتەنیاجێم مەهێڵە**

**ئەمشەوزریان دەمچێنێ ، ئەمشەوزریان دەمچێنێ**

**نموونەیەکی تریش (عوسمان محەممەد هەورامی) دەڵێ :**

**بابە بابە**

**دایە دایە**

**تۆئەوخوایە**

**تاکەی ئەم هەراوهۆریایە ؟**

**٦ – بوونی پێویستە (لزوم مایلزم) : بریتییەلەوەك یەکی وهاوشێوە هاتنی پیتێك ، یان چەند پیتێکی بەرلەوپیتەی کەلەهۆنراوەدا سەر واولەپەخشان دا سەرواداردروست دەکات ، ئەمەش سەرواوسەروادارەکان جوانتردەکات لەشێوەبۆسەرزارخۆشترگۆدەکرێت بەرلەگەیشتنمان بەکۆتایی ڕستە یان دێرە شیعرەکە دەزانین کۆتایی بەچی دێ٠**

**"حەمدی" دەڵێ :**

**گوڵ غەرقی ئاووڕەنگە**

**غونچە دەم ودڵتەنگە**

**نێرگزگێژودەبەنگە**

**بولبول لەسەرئاهەنگە**

**٧ – هاوبڕی : ئەم شێوازە لەوەدا بەرجەستەدەبێت ، کەدووکەس لەدووشوێنی جودا بێئەوەی ئاگایان لەیەك بێ بەیەك زمان ، یان بەدووزمانی جودا هەمان شت دەڵێن ، بۆنموونە کورد دەڵێ : کوڕ شایی نەدەزانی**

دەیوت عەردخوارە. ئینگلیزدەڵێت : کرێکاری خرا پ گلەیی لەکەرەستەکانی دەکات. کورد دەڵێ : بەقەدبەڕەکەت پێ ڕاکێشە.عەرەب دەڵێ : پێت بەقەدلێفەکەت درێژکە.

**بەلگەئایەتییەکان :**

١ - (قالواادع لناربك یبین لنا مالونهاقال انه یقول انها بقرة صفراءفاقع لونهاتسرالنظرین) واتا : (وتیان ئەی مووسابانگ بکەلەپەروەردگارت ئەومانگایەڕەنگی چۆنە؟فەرمووی: خودای مەزن دەفەرمووێت : ڕەنگێکی زەردی تۆخی وای هەیە تەماشا کەران دڵخۆش دەکات) البقرە:٦٩ (شێخ محەمەدی خاڵ دەڵێ : بۆچی لەشەریعەتی موسادا (علیه السلام) مانگاهەڵبژێردراوە بۆسەربڕین ؟ دەڵێ : چونکەدەگێڕنەوەلەوکاتەدا گوێرەکەپەر ستی باوبووە ، ئەمەکاری کردۆتەسەربیروباوەڕی جولەکەکانیش بەجۆرێك کەخۆشەویستی گوێرەکە لەدڵ ودەروونیان دا سەوزبو وبوو ، ئینجا خوای تەعالا فەرمانی پێدان کەمانگایەك سەربڕن ، بۆئەوەی ئەوبیروباوەڕەیان کزببێ ونەمینێ (واذقال موسی لقومه ان الله یأمركم ان تذبحوابقرة) البقرة : ٦٧

حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێ) ، پاش ئەوەی لە(میسر) گەڕایەوە ، "سامیری"بتێکی لەگۆلك لەزێڕدروستکرد.(سامریه كان ئەوانەبوون کەلەناوەڕاستی فەلەستین نیشتەجێ بوون ، پایتەختەکەیان شاری "سامیرە"بوو).

٢- (والخیل والبغال والعمیرلترکبوهاوزینة ویخلق مالا تعلمون) النحل : ٨

واتا: (ئەسپ وگوێدرێژی بۆدروستکردوون بۆسواربوون وهۆی ڕازاندنەوەش بۆئێوەخوا شتی وادروست دەکات کەئێوە نایزا نن)

٣ - (ولکم فیهاجمال حین تریحون وحین تسرحون)النحل: ٦

واتا : (بۆئێوە هەیەلەوئاژەلانە دیمەنی جوان و ڕازاوە کاتێ لە لەوەڕگادەیانهێننەوە ، کاتێکیش دەیانبەن بۆلەوەڕگا).

٤ - ( واصبرعلی مایقولون واهجرهم هجراجمیلا)المزمل: ١٠

٥ - (المال والبنون زینة الحیوة الدنیا) الکهف : ٤٦

ڕاستییەکەی مندالً ڕازانەوەی ماڵن ، پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی: (ریح الولد من ریح الجنه)رواه طبرانی والبیهقی.

واتا:(بۆنی مندالً لەبۆنی بەهەشتەوەیە) مندالً بۆنی تایبەت بەخۆی هەیە ، دیاردەی بۆنی خۆشی مندالً بەڕاستی بوونی هەیە بۆنی مرۆڤ لەگەلً بەرزبوونەوەی تەمەندا دەگۆڕێت.حەزرەتی یەعقوب (سەلامی خوای لێبێ) کەلەغەمی ونبوونی کوڕەکەیدانابینابووبەبۆنکردنی ڕۆشنایی بۆچاوەکانی گەڕاوەتەوە : (اذهبوابقمیصی هذافألقوه علی وجه أبی یأت بصیرا) یوسف : ٩٣واتا : (یوسف هەواڵی باوکی پرسی

کەزانی نابینابووەوتی : بڕۆن وئەم کراسەم بەرن وبیدەن بەسەروڕووی باوکمدابینایی بۆدەگەڕێتەوەوچاوی چاك دەبێتەوە)٠ بەلأم منداڵ کاتێك گەورە دەبن بەرامبەردایك وباوکیان خراپن ، بۆیەتووشی خەم وخەفەتیان دەکەن لەشیعری شکسپیردادەخو ێنیتەوە کەپاد شا(لێر) ، دەڵێ : ( لەپێوەدانی ژەهری مارناخۆ شترۆئازەردەرترن کوڕی نافەرمان) ، منداڵ بەرەکەت(خۆشی) ماڵە ، منداڵ وپیرهە ردووکیان بەرەکەتی ماڵن٠منداڵ لەتەمەنی(٦)شەش مانگی بەسەرەوەهەندێ دەنگ وقسەی لێ دەبیسترێ کە ئاکامی ڕەنگدانەوەی ئەودەنگانەن کەمنداڵ ڕۆژانە دەیان بیستێ بەمەش دڵی دایك وباوکیان خۆش دەبێ بەتایبەتی کاتێك بۆیەکەمجاروشەی دایە وبابە یان لێ دەبیستنهەروەهاخۆنزیککردنەوەوخۆهەڵواسین بەدایك وباوك زیاتردڵی دایك وباوك خۆش دەکات، هەروەهاپێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(الولد سید سبع سنین، وعبد سبع سنین ، ووزیرسبع سنین)٠

واتا:(منداڵ لەحەوت ساڵ ساڵی یەکەمدا ، وەکوئاغاوفەرمانڕەوا وایە(زۆرخۆشەویستە) ، لەحەوت ساڵی دووەم دا وەکوعەبد وایە (لەئەمرونەهی دایك وباوك دایە) ، لەحەوت ساڵی سێیەم دادەبێ وەکووەزیرومشاوری خۆت چاوی لێ بکەی)٠

٦ - خوای گەورەلەسوڕەتی ال عیمران فەرموویەتی : زین للناس ئارایشکراوەبۆخەڵکی حب الشهوات من النساء لە (ژنان) واتا ژنان جوانکراون بۆپیاوان ، (ابن قەییم) وتوویەتی : (خشلی پیاوان قسەوکردەوەوئاکارەجوان وپەسندەکانیانە ، خشلی ئافرەتیش ئەوەیەکەلەبەرخۆیانی دەکەن)٠

(والبنین) (والقنا طیرالمقنطرة) من الذهب واالفضة داراییش جوانکراوە ، ئاڵتوون وزیو ، (والخیل المسومة والانعام ) ئەسپ وئاژەڵیش جوانکراوە بۆئینسان ، ناصرِی سوبحانی ، دەڵێ : وشەی (الخیل) ئەسڵەکەی لە(خەیاڵ)ە ، چونکە ئینسان کاتێ سواری ئەسپ دەبێ کەمێك فیزوتەکەببوری بۆپەیدادەبێ٠

٧ - (وهوالذی سخرالبحرلتاکلومنه لحما طریاوتستخرجوامنه حلیة تلبسونها )النحل : ١٤ واتا : خوائەوکەسەیە دەریای ڕام کردووە بۆئەوەی لەدەریا گۆ شتێکی نەرم وتازە دەربهێنن وبخۆن ، هەروەها زیوەروزینەت د ەربهێنن وبیپۆشن)٠

**بەڵگەی فەرموودە :**

١- (زینواالقران باصواتکم) واتا:(قورئان برازێننەوە بەدەنگتان)

٢- (خیرالنساء احسنهن وجوها وأرضحهن مهورا)رواه ابن حبان

(چاکترین ژنان ئەوانەن کەخاوەن جوانترین ڕوخساروکەمترین مارەیین)٠

(چونکەبەهۆی ڕوخساری جوانەوەخۆپارێزی بۆپەیدا دەبێت دینەکەشی دەپارێزێت وقایم تری دەکات٠

نابێ مرۆڤ تەنیابەجوانی فریوبخوات ، چونکە(دروودی خوای لەسەربێ) ، فەرموویەتی : (ایاکم وخضراء الدمن)واتا:(نەکەن خۆتان لەوسەوزاییەجوانە نزیك بکەنەوە ، کەلەناو زەویەکی پڕلەئاسەواری جێی پێی

پیسی خەڵك دا سەوزبووبن ، وتیان: ئەوەچییە؟ فەرمووی: المراه الحسناء فی المنبت السوء)٠واتا: ئافرەتێکی زۆرجوان کەلەجێگەولەوەرگەیەکی خراپ داسەوزبووبێت٠

٣ - پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ)گوێی لەوتەی پیاوێك بووکەقسەی دەکردسەرسام بوولەرەوانبێژی وجوانی قسەکا نی بۆیە فەرمووی : (ان من البیان لسحرا)رواه البخاری

واتا : (هەندێك دەربرین و وتارهەیە ، ئەوەندە کاریگەرە ، وەك سیحرکارلەدڵ دەکات)٠

٤ - (للصائم فرحتان، فرحة عند افطاره، وفرحة عند لقاءربه)رواه البخاری ومسلم واتا : (رۆژوگرتن دووجۆرە شا دی وخۆشی تێدایە : خۆشیەك لەوکاتەدا کەبەربانگ دەکاتە وەورۆژووەکەی دەشکێنێت ، خۆشییەکیش ئەوکاتەیە کەبە حزووری خوای خۆی دەگات کەپاداشتە تایبەتییەکەی وەر دەگرێت٠

٥ - ( دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:(اطلبوا الخیرعند حسان الوجوه)٠

واتا:(داوای چاکەبکەن لەلای ئەوکەسانەی کەرووپان جوانە)٠ (سەیرکردنی دیمەن وروالەت بەلگەیە لەسەرچاکبوونی هەناویان ، چونکە هەناووکردارلەدیمەن وروالەت دا رەنگدەداتەوە٠) ، هەروەها فەرموویەتی :(ایاکم والزنی ، فان فیه اربع خصال :

یذهب البهاء عن الوجه ، ویقطع الرزق ، ویسخط الرحمن ویسبب الخلودفي النار) ، هەروەهافەرموویەتی : (یامعشرالمسلمین اتقواالزنا فان فیه ست خصال : ثلاث في الدنیا وثلاث في الاخرة ، فاما التي في الدنیا ، فذهاب بهاء الوجه ، وقصرالعمر، ودوام الفقر، واما في الاخرة فسخط الله تبارك وتعالی ، وسؤالحساب والعذاب باالنار) ، کەواتە ئەوکەسەی گوناه وتاوان ئەنجام دەدات لەروخساری رەنگدەداتەوە ، چونکەدەم وچاوجوانی وناشیرینی ئەخلاق نیشان دەدات٠سیمای مرۆڤ ئاوێنەوپێوەرێکەبۆرەنگدانەوەی کەسێتی ، ئەرستۆ دەڵێ : (پەیوەندییەکی بەتین هەیەلەنێوان کەسێتی مرۆڤ وشێوەکانی روخساری)٠ئەوشتەی لەسیمادیارەبەهۆی کردەوەی مرۆڤ کاری خوای پەروەردگارە٠ (دوام الفقر) واتابەهەدەرچوونی توانای ئابوری٠

٦ - (سبحان من زین الرجال بااللعی والنساء بالذوائب)

واتا : (فریشتەکان بەردەوام یادی خوادەکەن ، دەڵێن :( پاکە خودایەك کەپیاوی بەردێن وژنانی بەکەزی رازاندەوە)(ردێن لەرووی زمانەوەلەدوو وشەپێکهاتووە : رێی دین ، وەهێشتنەوەی ریش لەپێش ولەدوای ئیسلامیش لەناوگەلان باوبووە ، لەسەردە می هاتنی ئاینی ئیسلامیش موسوڵمانەکان ریشیان دەهێشتەوە ، لەهەمان کاتدا کافروبێباوەرەکانیش ریشیان دەهێشتەوە ، تەنا نەت (ئەبوجەهل)یش ریشی هێشتۆتەوە)٠

٧ - (ان اللهجمیل یحب الجمال)رواه مسلم٠واتا : (خواجوانەوجوانی خۆش دەوێ)٠واتاخوای گەورەسیفات ورەوشت وخوی جوانی خۆش دەوێ٠

**(پێوەر)لەجوانیدا :**

**ڕووبەپلەی یەکەم دێ لەجوانیدا ، نوسەرێکی ئیسپانی بەم جۆرە لێکی داوەتەوە:**

**١ - سپیەتی: ((پێست ، ددان))**

**٢ - ڕەشی: ((چاو ، برۆ ، برژانگ))**

**٣ - درێژی: ((بالاْ ، گەردن ، پرچ))**

**٤ - کورتی: ((گوێچکە ، ددان ، پێ))**

**٥ - پانی: ((سینگ ، ناوچەوان))**

**٦ - باریکی: ((کەمەر))**

**٧ - نەرمی: ((قژ))**

**مرۆڤ وخواست وئارەزووەکانی :**

**ئیبن جوزی بەغدادی(٣) ، دەڵێ :(جائەگەرمرۆڤ لەخواپاڕایەوە داوای گەیشتن بەخواستەکانی کرد ، ئەگەرخواستەکەشی جێبەجێ نەبوو ، ئەوائەوپاڕانەوەیە بەپەرستش بۆی ئەژماردەکرێت ومرۆڤ بۆتاقیکرد نەوەدانراوە ، بۆیەدەبێ ئارام بگرێ ، پاشان بادڵی خۆی خۆش بکات کەڕێگری کردن لەخواستەکانی وپێنەبەخشین لەبەربەرژەوەندییەکە کەخۆی نایزانێ ، بۆیە با ئارام بگرێ وڕازی بێ بەبڕیارەکانی خوای گەورە ، بەڵکومەبەستەکەی پاشەکەوت کرابێ٠٠٠)**

## بەشی چوارەم

نیوەی ژیانی ئادەمیزادپەیوەندی بەژنەوەهەیە٠ژن خۆشی نیوەی ئادەمییە٠وتراوە : (ژنیش هەیە ، ژانیش هەیە) ئەم پەندە هەروالەگۆترە نەوتراوە ، بەڵکوبەسەرهات وچیرۆکێکی هەیە٠لەبەرئەوەیە شاعیری ئەڵمانی گۆتە(١٧٤٩ — ١٨٣٢) ، وتوویەتی : ( کامەرا نترین مرۆڤ لەژیاندا ئەوکەسەیەکەلەماڵدائاسوودەبێت)ناشیرینی ماڵ وادەکات پیاوتەنیالەکاتی خواردن ونوستن لەماڵەوەدابنیشێ هەندێك هۆکاری دیکەش هەیەپیاوماڵ بەجێبێڵێ وەکوژنان لەماڵەوەسەردانی یەکتردەکەن لەوکاتەش دەبێ پیاوماڵەکەبەجێبێڵێ بۆئەوەی ئازادی ئەوان تێکنەدات٠هەروەهاقەرەبالغی وبچووکی خانووپیاوناچارەهێمنی وحەوانەوەلەدەرەوەبدۆزێتەوە ، هەروەهائەگەرهاتووماڵ هۆکاری پشوودان وڕازاوەیی وشەی تێدانەبووتاپیاوبۆمانەوەڕابکێشێ لەفەرمووەدەیەکداهاتووە : ((رحم الله من جعل فی بیته جنته))واتا ((ڕەحمەتی خوا(جل جلاله)بۆئەوکەسەدەبێ کەماڵەکەی خۆی دەکات بەشوێنێکی وەك بەهەشت))٠(زەینەب ئەلغەزالی) چوارئامۆژگاری گرینگی بۆئەوئافرەتانەداناوە ، کەتازەپێیان خستۆتەماڵی مێردوژیانی هاوسەرییەوە ، کەهەرئافرەتێك پەیڕەوییان لێبکات ئەوابێگومان تووشی گێروگرفت وئاڵۆزی ونائارامی نابێت :

١ — دەبێت نهێنی ماڵ وپەیوەندی بەمێردەکەیەوەبپارێزێت ، بۆهیچ کەسێك لەهاوڕێ وخزم وکەس وکاری باس نەکات تەنانەت بۆدایك وباوك وخوشك وبراکانیشی٠خۆئەگەرهەرگێروگرفتێك هەبوو ، ئەوادەشێت لەنێوان خۆیان ودوورلەدەست تێوەردانی دەوروبەرچارەسەربکرێن ، ژنیش دەبێت بزانێت لەهەموماڵێك گێروگرفت هەیە جاگەورەبێت یان بچووك٠

٢ — گومانی تێدانییەهەریەکەلەپیاووژن خونەریتی تایبەت بەخۆیان هەیە ، هەردوولاپێویستیان بەئارام گرتنەتاکوتەبیعەت ومیزاجی هەردووکیان لێك نزیك دەبێتەوە بۆئەمەش پێویستیان بەکاتە ، ئەم کاتەش لەوانەیەشەش مانگ یان ساڵێك یان زیاتربخایەنێت بەوپێیەش گونجان ولێك تێگەیشتنی تەواوبەدی دێت ، بەڵام تابەدی هاتنی پێویستەزۆرئارام ولەسەرخۆبن وڕێزی تەواولەیەکتری بگرن٠

٣ — لەسەرژن پێویستەگوێڕایەڵی مێردەکەی بکات وماڵ وناموسی بۆبپارێزێت (بێگومان گوێڕایەڵی کردن لەکارێکدانابێت کەسەرپێچی لەشەرعی خوای گەورەتێدابێت)٠

٤ — گرینگترین ئامۆژگاری ئەم خاڵانەی خوارەوەن :

١ — ماڵ بەخاوێنی ڕابگرێت٠

٢ — ئامادەکردنی خواردەمەنی وژەمەکان بەڕێك وپێکی٠

٣ — بەپیرەوەچوونی مێردەکەی بەڕووی خۆش وجل وبەرگی پاك وخاوێن٠

٤ – هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەس وکاری مێردەکەی باش بێ٠

٥ – نارەزایی دەرنەبڕین لەبەرامبەرئەوەی پارەبۆدایك وباوکی خۆی خەرج دەکات ، ئەوابێگومان زیاترخۆشەویستی ژنەکەی لەدڵدادەچەسپێت٠لەکۆتاییدادەڵێم دروستکردنی خێزان بۆرۆژێك ودوورۆژوساڵێك ودووساڵ نییە ، بەڵکوتاکۆتایی ژیان وماڵئاوایی کردن لەدنیایەبەشی زۆری بەختیاری مرۆڤیش بەخێزانەوەبەستراوەتەوە٠

بۆپاراستنی ژیانی خێزانی کەنەشێوێت دەبێ بزانی کەمێردەکەت ئادە میزادەو ، ئادەمیزادیش بەبێ هەڵەوبەبێ عەیب نابێ،ژن خۆشی بەبێ هەڵەوکەمووکوڕی نییەهەمو وئادەمیزادێك هەڵەدەکات و دەبێ چاوپۆشی لەشتی بچووك بکرێ مرۆڤ کاتێ کەمناڵە خەمی خواردنییەتی ، کەهەندێك گەورەبوو خەمی خوێندنییەتی ، کە پێی نایەتەمەنی لاوییەوە دەکەوێتەبیر کردنەوەلە ژنهێنان ، لە پاشان خەمی منداڵەوردیلە کانییەتی کە بەخێویان٠هەرگیزمرۆڤنابێ چاوەڕێی سەداسەدی ڕێککەوتن وگونجان بکات لەگەڵ هاوسەرەکەی ، چونکەهەرگیزدوومرۆڤ سەداسەدهزرەحەزوئارەزوویان وەك یەك نابێت ، لەبەرئەوەشتێکی ئاساییەئەگەرلەسەرهەندێك شت هاوڕاوموتتەفیق نەبن٠ هاوسەرگیری : بریتییەلەپێکەوەبوونێکی ڕەسمی لەنێوان پیاووئافرەت٠ (ئیدواردمارك) دەڵێ : ((هاوسەرگیری دیاردەیەکی ئەزەلییە ولەگەڵ دروستبوونی ڕەگەزی مرۆییداهاتۆتەئاراوە))٠

## سوودەکانی ژنهێنان :

١-نزای بەخێری منداڵ بۆدایك وباوك دێتە دی٠

٢-دەبتە هۆی زۆربوونی ئوممەت لەم سەردەمەش داهۆی سەرەکی گەشەکردنی ئیسلام ژنهێنان ومنداڵی زۆرە٠

٣-کەمنداڵ بەرلەدایك وباوکی بمرێ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ، فەرموویەتی : (بەساوادەڵێن بڕۆنێوبەهەشتەوە بەتوندی وتوڕ ەییەوەپەلپ دەگرێ ودەڵێ: قەت بەبێ دایك وباوکم ناڕۆم) ، هەروە ها(درودی خوای لەسەربێ) بەرگی یەکێکی گرتبووڕایدەکێشاودەیفەر موو: بەم چەشنەی من تۆڕادەکێشم ساوادایك وباوکی بۆبەهەشت ڕا دەکێشێ) موسلیم ڕیوایەتی کردووە ،هەروەها (ئیبن ماجە)ڕیوایەتی کردووەئەومنداڵەی کەلەپێش دایك وباوکییەوە دەمرێت دایك وباو کی ڕادەکێشێت بەرەوبەهەشت٠

٤-بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە(پیاوپاداشت وەردەگر ێتەوە لەلایەن پەروەردگارییەوەلەبەرامبەرئەوپارووە نانەی کەبەرزی دەکا تەوەبۆدەمی خۆی یان دەیخاتەناودەمی خێزا نەکەیەوە)٠

٥-بەهۆیەوە ئاینی دەپارێزێت،چونکە(درودی خوای لەسەربێ)فەرموو یەتی : (ئەوەی نیکاحی کردنیوەی دینی خۆی تەواوکرد)٠

٦ – منداڵ دەبێتەمایەی سوکنایی بۆدایك وباوك ولەکاتی پیریشدایارمەتییان دەدەن٠

٨– زۆرجارخێزان دروست کردن دەوڵەمەندی بەدواوەدێت هەندێك کەس لەترسی نەبوونی ومەعیشەت ژن ناهێنن ، بەلاَم خوای گەورەدەفەرمووێ : (ان یکون فقراء یغنیهم الله من فضله) بۆیەئەم ترسەجێگای ئیعتیبارنییە ، یەکێك لەهاوەلاَن وتوویەتی : بەشوێن دەوڵەمەندی دابگەڕێن لەوئایەتە٠

## زیانەکانی ژنهێنان :

١ - پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(ان الولد: مبخلة، مجبنة، مجهلة،محزنة)رواه ابن ماجه واحمدوحاکم وطبرانی واتا:(منداڵ مایەی: ڕەزیلی ، ترسنۆکی ، نەزانی ، وخەمبارییە)٠

"ڕود یارد کەپلنگ" لەبابەت ژیانی(کابتن جادس)ەوە دەدوێ دەڵێ:(ئەم پیاوە ئەفسەرێك بوولەجەنگ دا یەکجارئازا بوو،بەلاَم کەژنی هێنابووە ئەفسەرێکی ناتەواوودواکەوتوو ، ئەمەش سەبا رەت بەوەبووکەزۆربەتەنگ ئەوەبووکەنەکوژرێ نەوەك ژن وکوڕەکەی بکەونە تەنگانەوە لەبەرئەوە لەشەڕداوەك پێشووئازایەتی نەدەنواند)٠

٢ – لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی دەریخستووە ئەوکەسانەی کەڕەبەنن هەست بەشادی وخۆشی وخۆشحالی دەکەن٠ئەولێکۆڵینەوەیەلەماوەی بیست ساڵ لەسەرچل هەزارخێزانی بەڕیتانی ئەنجام دراوە ، دەرکەوتووەکەئەوکەسانەی کەهێشتانەچوونەتەناوژیانی هاوسەرییەوە زۆرهەست بەخۆشی وئاسودەیی دەکەن٠

## لەبارەی کێشەی قەیرەیی :

قەیرە ئەوئافرەتانەن کەماونەتەوە و تاکوتەمەنێکی زۆرشویان نەکردووە٠یاخودقەیرەیی واتادواکەوتنی پڕۆسەی هاوسەرگیری٠ پزیشکێك دەڵێ: هەرکچێك تەمەنی تێپەڕاندبێ وشوی نەکردبێ هەمووکاتێك لەبارێکی دەروونی زۆرناخۆش دەژی بۆنموونە:

١ - هەرکاتێك هاوڕێیەکی شوبکات ئەوئازاردەخوات و واهەست دەکاتً ئەوماوەتەوەهەمووهاوڕێکانی شوویان کردووە٠

٢ – هەرکاتێك لەخانەوادەکەی منداڵێك لەدایك ببێ هەستی دایکایەتی دەبزوێ وواهەست دەکات ئەولەسۆزی منداڵ بێبەشە٠

٣- هەرکاتێك ساڵێك لەتەمەنی دەڕوات دەڵێ ساڵێکی تریش گەو رەبووم وشوم نەکرد٠

٤- ڕاگەیاندنەکان کەباسی کێشەی قەیرەیی دەکەن ئەوئازاری پێ دەخوات٠

**هۆكارەكانی قەیرەیی :**

١ - گەڕان بەدوای كەسێكی بۆنموونە دەوڵەمەند ، چەندین داواكاری دێت ڕەتی دەكاتەوە، لەخەیاڵی خۆی دا كەسێكی وێنا كردووە ، چەندین كەسی بۆدەدۆزنەوەبەدڵی نابێت بۆیەكاتێك خەبەری دەبێتەوە تەمەنی زۆربووە ، هەموو كەسێك حەزدەكات ئەوكەسەی دەبێت بەهاوسەری بەدڵی خۆی بێت وخۆی بڕیاری لەسەربدات بۆئەم مەبەستەش ئەوخەونەی لەخەیاڵیدایە بەهەمووتوانای خۆی هەوڵی بۆدەدات زۆرلەوشتانەی تێدابێت كەئەودەیەوێت ، بەڵام مەرج نییەئەوكەسەی دەست بكەوێت بۆیە دەبێت هەندێ لەومەرجانەی دایناوە فەرامۆش بكات ، ئەگینا تەمەنێكی زۆری لێ دەڕوات ، وەكووتوویانە:(ئەوەی بەرزبفڕێت نزم دەنیشێتەوە)٠

٢ - داواكاری زۆر: بۆنموونە داوای مارەییەكی زۆردەكات ، یان داوایماڵێكی زۆردەكات كەوادەزانێت ئەگەرمارەیی زۆربێت یان زێڕێكی زۆری بۆبكرێ قیمەتی ئافرەت بەمارەیی زۆرە، بەڵام ئایاقیمەتی ژن بەمارەیی زۆرە؟زێڕنرخی مرۆڤ بەرزناكاتەوە ، نرخی مرۆڤ بەبیروهۆش وڕۆشنبیری پێوانەدەكرێ نەك بەزێڕئەگەرپیاوەكەتێگەیشتووبێ وئەوتۆی بوێت وتۆش ئەوت بوێت ، وردەوردەدەتوانن زێڕیش پەیدابكەن ، زێڕی زۆریش زۆرجاربۆشانازی وخۆدەرخستنە٠ڕاستەزێڕبۆئافرەت دروستكراوە ، كچ هەرلەمنداڵییەوەگوێی كوندەكرێت ئەم گوێ بۆكونكردنەش دەلالەت لەگوارەی زێڕدەكات هەرچەندە هەندێ جاریش گوارەی دیكە بێجگەلەزێڕلەگوێ دەكرێت٠

هەندێ جارپێداگری ئافرەت لەزێڕی زۆرهۆكاری قەیرەیی ومانەوەی ئافرەتە٠(ك) لەگۆڤاری زنار ، ژمارە (١٨)ی ساڵی (٢٠٠٨) دەڵێ : ((لەبەرداخوازی ئاڵتوون زۆربەی خوازبینییەكانم هەموویان پەشیمان دەبوونەوە))٠(ب) دەڵێ : ((من خۆم دەستم هەبوولەقەیرەبوونی خۆم دا ، كەپێیان دەگوتم فلاّن كچ ئەوندەئاڵتوونەی بۆكڕاوە منیش دەمگووت داوای ئەوەندەدەكەم ، زۆرداواكاریم هاتن لەبەرداواكردنی زێڕی زۆروازیان دە هێنا٠تاوای لێهات زۆربەی كوڕان شارەزای من بووبوون كەچەندە داوای زێڕدەكەم بۆیەكەس خۆی لێ نەدەدام))٠(س)دە لێ : (( مانەوەی من هەرئاڵتوون نەبوو ، بەڵكوخانووی تایبەتیش بوو لەم زروفەكەس هەیە هەمووشتێ هەرلەسەرەتاوە دابین بكات))٠لەبارەی دیاریكردنی زێڕ لەئاین ویاسادا ڕێژەیەك دیارینەكراوە ، بەپێی ڕەزامەندی هەردوولایە٠ئەوكچ وكوڕە كاتێ بەویستی خۆیان ڕێكدەكەون لەسەرڕێژەی ئاڵتوون كەمی وزۆری بەندە بەڕەزامەندی خۆیان ، بەڵام لەدیدی هەندێ كەس بڕی ئاڵتوون كەئافرەت داوای دەكات ئەوەندەنەبێ كەزەكاتی لێ بكەوێ٠ئاڵتونیش پێشەكی وپاشەكی هەیە هەندێ جارپێشەكی كەمترە لەپاشەكی هۆكاری ئەمەش ئەوئافرەتانە ئاڵتوون بەكاردەینن وەك چەكێك تامێردەكەی بەئاسانی تەلاقی نەدات٠

بوخاری ڕیوایەتی کردووە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بە پیاوێکی فەرموو : ژن بێنە ئەگەربەمارەیی ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ ، هەروەها "تیرمذی" گێڕاویەتییەوەئافرەتێك لەتیرەی(بەنی خزارە)لەسەرجووتەنەعلێك مارەبڕا بوو ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)پێی فەرموو: ئایابۆنەفس ومالی خۆت بەجووتەنەعلێك ڕازی بووی؟ئەویش وتی : بەڵێ ، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)ڕێی دا، هەروەهادایکی ئیمانداران(خەدیجە)(خوای لێ ڕازی بێ) مارەییە کەی دوونێرەوشتر)بوو ، یان دەڵێن: (١٠)دەئۆقیەبوو(ئۆقیەچل درهەمی زیوبووە ، دەئۆقیەواتاچوراسەددرهەمی زیو) (ئیبن عە بباس)(خوای لێ ڕازی بێ)وتویەتی: (لەوکاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب(خوای لێ ڕازی بێ)فاتیمەی کچی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)مارەکرد ، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەعەلی فەرموو: شتێك بدەبە فاتیمە (خوای لێ ڕازی بێ)علی(خوای لێ ڕازی بێ) ، گوتی: هیچ شتێکم نییە (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : ئەی زرێ(قەلغان)ەکەت لەکوێیە؟بیدە بەفاتیمە ٠پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ فەرمانی کردبەپێشەواعەلی کەواقەلغانەکەی بفرۆشێت وبەپارەکەی ژیانی نوێ دەست پێبکات٠ فاتیمەبەفەرموودەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) یەکێکەلەچوارکەسایەتییە گەورەکانی ژنان لەمێژووی مرۆڤایەتیدا کە : مەریەم وئاسیاوخەدیجەوفاتیمەیە) هەروەها(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (لەبەرەکە وخێرداری ئافرەت کەزووبدرێ بە شوو ، مارەییەکەشی سوك وئاسان بێ) هەروەها(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (خوای گەورە فەرمانی پێکردم کە فاتیمە بدەمە عەلی(خوایان لێ ڕازی بێ)ئێوەبەشایەد بن من فاتیمەم مارەکردلەعەلی(خوایان لێ ڕازی بێ) لەسەر(٤٠٠)چوارسەدمیسقال زیو(پاشەکی) ئەگەرڕازی بێ وەزۆردوعای خێری بۆکردن)٠(سەعیدی کوڕی موسەیب)کچەکەی خۆی مارەکردلە(ئەبوهوڕەیرە) لەسەر(دوودرهەم)٠(ئەوکات مەڕێکی چاکت دەکڕی بە(٥)پێنج درهەم)٠زۆرجارداوای زێڕی زۆروەك بیانوێکەکەڕازی نەبن کچەکەی پێبدەن٠

٣ - سوودمەندبوونی دایك وباوك لەکچەکەیان : هەندێك دایك وباوك کەدەبینن کچەکەیان مووچەی هەیە لەبەرمووچەکەی هەرداوایەکی دێت بەبیانوێك ڕەتی دەکەنەوە٠

٤ - ناوزڕان : واتائەوئافرەتانەی بەدناون٠کچ وکوڕجیاوازییان هەیەلەڕووی ڕابردووکاریگەری لەسەرداهاتوویان لێکدانەوەی دەوروبەربۆبۆئەوهەڵەیەی کەکردویەتی بەتایبەتی کاریگەری ڕابردوولەسەرکچ زۆرترە،چونکەکاریگەری هەردووڕەگەزەکەوەکویەکنییە بۆکوڕزیاترلەوکاتەوەیەکەتێیدایە٠

٥ - قەدەغەکردنی فرەژنی (زۆری هاوسەران کارێکی باشە نەك حراپ ، ئەگەرمەبەست لەفرەژنی چێژ وەرگرتن بێت ، ئە واحەلالەوڕێگەپێدراوە ، ئەگەربۆداوێنپاکڕاگرتنی خۆی بێت ، ئەوەخواپەرستییە٠ هۆکاری فرەژنیش جیاوازی ڕێژەی نێو ان ژن وپیاوە ، هەروەهافرەژنی بەهاوسەربوونی هەمووئافرە تێکە٠لەتوێژینەوەیەکدا کە فوتابی ماستەر (تواناعوسمان محمدامین ) لەبەشی کۆمەڵناسی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلا حەددین بەناونیشانی : (ڕۆڵی بەهاکۆمەلایەتییەکان لە ڕێکخستنی کۆمەڵگا) لەساڵی (٢٠١٧)

ئەنجامی داوە ، ڕێژەی( ٩, ٥٨٪) لەگەڵ ئەوبۆچوونەدان کەپیاولەژنێك زیاتری هە بێت ، بەڵام دادپەروەری بکات ، ڕێژەی( ٤ ,٣٠٪ ) پێیان وایە نابێت پیاولەژنێك زیاتری هەبێت ، دەبینین زۆربەی ئەندا مانی نموونەی توێژینەوەکەلەگەڵ ئەوبۆچوونەدان کەپیاولە ژنێکی تری هەبێت ، بەمەرجێك دادپەروەری بکات٠هەرکەسێك بیەوێت ژنی دووەم بێنێت دەبێت توانای بەخێوکردنی زیاترلەژنێکی هەبێت ، پاشانیش دەبێت پیاوەکەمرۆڤێکی دا دپەروەربێت واتاجیاوازی لەنێوانیاندانەکات ، زۆرجاریش فر ەژنی وەکوخەیاڵێکەمەرج نییەئەنجام بدرێت٠بەپێی ئامارێکی دادگای باری کەسی هەولێرلەساڵی (٢٠٠٨)لەکۆی (٨٢٨٠) حالەتی مارەبڕین (٦٥)شەست وپێنج ژنهێنانی دووەم بووە٠وەدەبێ جیاوازی بکرێ لەنێوان لایەنی تێۆری ولایەنی کرداری فرەژنی ، واتالەڕووی کردارەوەئایاتاچەندتوانراوە پابەندی ئەومەرجانەبن کەقورئانی پیرۆزداینناوە : (م٠ن) هاوسەرەکەی ژنی دووەمی هێناوە وپەیوەندی پێیانەوەنەماوە ناچارەلەوبازاڕەی پێیدەوترێ : (بازاڕی پیرەژنان) پارچەقوماشی کۆن بفرۆشێت بۆئەوەی بژێوی خۆی وپێنج منداڵەکەی دابین بکات٠(ز٠ش) یەکێکەلەوژنەبەساڵاچووانەی هاوسەرەکەی ژنی دووەمی هێناوەولای ئەونییە ناچارلەوبازاڕەکاردەکات٠(م)ژنی دووەمی هێناوە دەڵێ : من هیچ کێشەیەکم لەگەڵ هاوسەرەکەم نییە ، بەڵام حەزم لەژنی دووەم بوو هاوسەرەکەشم ڕازیبوو٠(گۆڤاری وارڤین ، ژ(٢٩) ، (٢٠١٠) بێگومان قەدە غەکردنی فرەژنی زیان بەوئافرەتانەدەگەیەنێ کەهێشتانە چوونەتەناوپرۆسەی هاوسەرگیرییەوە وتەمەنیان لەهەڵکشان دایە٠ (ئا)و(کا)دووهاوسەری پیاوێکن نێوانیان زۆرخۆشەوەك دووهاوڕێ مامەڵەدەکەن وهەمیشەتەبان ، (م)کەهاوسەری ئەودووژنەیەهۆکاری تەبایی خێزانەکانی بۆخۆی دەگەڕێنێتەوەدەڵێ : چونکەمن بەیەك چاوسەیریان دەکەم٠هەندێ جارژنهێنانی دووەم لەپێناوی منداڵە ، (نا)یەکێکەلەونموونانە دەڵێ : پاش ئەوەی پێنج ساڵ چاوەڕێی منداڵ بووم لەوپێناوەداپارەیەکی زۆرم لای دکتۆرسەرف کردناچاربووم بەڕەزامەندی خێزانەکەم ژنێکی دیکەبێنم ، ئەودەڵێ : هاوسەرەکەم نەك بۆئەوکارەپێی ناخۆش نەبوو ، بەڵکوخۆی سۆراخی ژنێکی گونجاوی بۆدەکردم دواجارهەرئەویش بۆی دۆزیمەوە٠ (ع)دەڵێ : پیاوان ئاینی ئیسلامیان کردۆتەبەهانەبۆفرەژنی ، بەڵام ئەگەروردبینەوەئەوانەی ژنی دووەم وسێیەم دێنن پیادەی ئەوڕێنماییانەناکەن کەقورئانی پیرۆزوەك مەرجێك بۆی دیاریکردوون٠(ك)دەڵێ : هەندێ کەسیش نسبەی ئافرەتییان کردۆتەبەهانە ، بەڵام ئەوانەبۆئەومەبەستەژن ناهێنن٠(ع ت)دەڵێ : من بەشتێکی باشی نازانم ، چونکەدەبێتەهۆی شەڕوئاژاوەهێنان بۆناومال٠

٦ - بێکاری وگرانی : بەتایبەتی گرانی خانوو ، جاچ بەکرین بێ یان بەکرێ کۆسپی سەرەکییە لەبەردەم پرۆسەی هاوسەرگیری٠یاخودجیاکردنەوەی ماڵ گرفتێکی دیاروبەرچاوە کەهەرلەسەرەتای ژیانی هاوسەرێتی زۆرجاروەکومەرج دادەنرێت ، کەئەگەربۆی جیابکاتەوەدەرامەتی کەمە وەئەگەربۆشی

جیانەکاتەوەکێشەیەکی زۆرڕوودەدات کەهەندێك جادەگاتەحالەتی جیابوونەوەوزیزبوون ، ڕۆژانەئەم دیاردەیەدەبینرێ٠

٧ - هۆکاری عەشیرەت : هەندێ عەشیرەتیش عادەت ونەریتیان وایە ئەگەرلەهۆزێکی تربێت کچی خۆیانی نادەنێ٠

٨ - لەهەندێ خێزان شوکردن بەنۆرەیە٠

لەکۆتاییدادەڵێم : گوناهی دواکەوتن لەشووکردن زۆرجارگوناهەکەی دەکەوێتەئەستۆی کچ خۆی کەهەندێکیان بڕوبیانووی زۆردەگرن٠

### ئایائافرەت تەبیحەتی کوڕانی بێ قازانجە یان زیان ؟

زۆربەی زانایان دەڵێن لەنێوشانەکانی لەشی مرۆڤ دالەڕەگەزی پیاوان دارێژەیەکی (مێینە یی) هەیە ، هەروەهالەنێوڕەگەزی ئافرەتیش دا لەخانەکانی لەشی دا ڕێژەیەکی (نێرینەیی) هەیە ، خۆئەگەرپیاوبە رەولایەنی مێینەیی دابەزی ولاسایی ئافرەتی کردەوەوچەندسیفا تێکی ئافرەتانەی پەیڕەوکردپیاوەکی ژنانی دەردەچێت وبەچاوی سووکەوەسەیردەکرێت بەهەمان شێوەئەگەرئافرەت بەرەولایەنی نێرینەیی ملی نالاسایی پیاوانی کردەوە ، وەکوپیاوتوندبووئەم جۆرەئافرەتانە ژیان وگوزەران تاڵ دەکەن بۆیەئافرەت ئافرەتەو پیاوپیاوە ، ژنیان وتوەوپیاویان وتوە،هەروەهاژنی زەلامانی حەزی کۆنترۆڵ کردن وبەرزەفت کردنی مێردەکەی دەخوازێ بەردەوام حەزدەکات قسەی ئەوبڕوات پیاویش وەکودیکۆربێ بەومانایەی مێردەکەی دەخاتە ژێردەستی خۆی ئەگەرلەکۆبوونەوەودانیشتنێکی خێزانی دابن هەوڵی ئەوەدەدات کۆنترۆڵ کردنی خۆی بەسەرمێردە کەی پیشان بدات قسەی ڕەتدەکاتەوەکاتێ مێردەکەی قسە دەکات قسەی پێ دەبڕێ ودژی بۆچوونەکانی دەوەستێتەوەهەوڵ دەدات گرینگی ورێزی مێردەکەی کەم بکاتەوە وحەزبەدیارخستنی کەم وکوڕیەکانی مێردەکەی دەکات ، بەردەوام بەهۆی بچوکترین هەڵەو ەڕەخنەلەمێردەکەی دەگرێ ، هەروەهاوتراوە (ئاوریشم) بۆیە لەسەرپیاوان حەرامکراوە ، چونکە کاتێ بەرجەستە دەکەوێت مێیەتی بوون دروست دەکات٠لەکۆتاییدادەڵێم کچی کوڕانی ماڵ دەکات بەدۆزەخ ولەخزمەتی ماڵەوەداپشتگوێخەرە٠

### ئافرەت وبەکاربردنی ڕواڵەتی :

بەکاربردنی ڕواڵەتی بریتییەلەکڕینی ئەوشتانەی کەپێداویستی سەرەکی نین بۆژیان بەتایبەتی شتی گرانبەها،دەگێڕنەوە هەواڵ گەیشت بە خەلیفە(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)کەکوڕەکەی ئە نگوستیلەیەکی بەهەزاردرهەم کڕیوە ، (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) بۆی نووسی : هەواڵم پێگەیشتووە ئەنگوستیلەیەکت بەهەزار درهەم کڕیوە ، کەئەم نووسینەی منت پێگەیشت ئەنگوستیلەکەبفر ۆشەوهەزارسکی برسی پێ تێربکە،بۆخۆت ئەنگوستیلەیەك بەنرخی دوودرهەم بکڕەلەئاسنی چینی دروست بکرێت٠

هەندێ کەس بەکڕینی کەل وپەلی گرانبەهاوخەرجکردنی پارەی زۆرشانازی بەخۆی دەکات وپیشانی خەڵکی دەدات کەشتی گرانبەهای کڕیوە ، هەندێ کەسیش ساڵانە ئۆتۆمبیلەکەیان دەگۆڕن هەندێ جاربۆخۆدەرخستن وبەرزکردنەوەی پێگەی خۆیانە لەناوکۆمەڵدا ، زۆرلەخێزانەکان لەکاتی هەبوونی ساڵانە کەل وپەلی ناوماڵ دەگۆڕن بۆنموونە: جل شۆر، تەلەفزیۆن ، ڕایەخ ، کەل وپەلی تردەگۆڕن٠بەشێکی زۆرلەوشتانەی کەئێمەڕۆژانە بەجێیان دەهێنین لەژیاندا لەپێناوخەڵکیدایە نەك بۆخۆمان کاتێك مۆبیلیاتی ماڵەکەت دروست دەکەی بەتایبەتی ژووری میوان خەرجی زۆردەکەی بۆجوانکردنی وگرینگی پێدەدەی بۆئەوەیەکاتێك خەڵکی سەیری دەکەن سەرنجیان ڕابکێشی کەمتربۆئەوەیەسەرنجی خۆت ڕابکێشی بەوبەڵگەیەی کەتۆگرینگی بەژووری میوان دەدەی زیاترلەژووروهۆڵی ناوەوە٠

## لەبارەی پاشەکەوت کردن :

بڕێ لەپارەوسامان کۆبکرێتەوپاشەکەوت بکرێ بۆکاتی تەنگانەو بۆپێویستیەکی کتوپڕ ، ئەوەبێئاگاییەکی تەواوە ئەوەی دەستت دەکەوێ خەرجی بکەیت ، چونکەدوورنییەڕۆژێ بێت وپێویستت پێبێ وبکەویتەدەست پانکردنەوە٠ ئەوەبێ سەخاوەت نییە بکەویتە خەرجکردنی بێبەرنامەوبەم لاوبەولادا ماڵەکەت پەرش وبلاوبکەی٠ مرۆڤ دەبێ بەرنامەی هەبێ لەخەرج وبژێودا ، وتراوە : دراوی سپی بۆڕۆژی ڕەش٠ (فرانکلین) وتوویەتی : (لەژیان دا ئەوکەسە بەختیار ە کەبتوانێ کەمترخەرج بکالەوەی بەدەستی دەکەوێ)٠کەواتە پێویستەبڕێك داهات پاشەکەوت بکرێ بۆنەخۆشی وسەفەرولێقەومان٠لێرەداپرسیارێکی گرینگ هەیە ، ئایامەسرەفی ماڵ کێ بیکات ؟ بەبڕوای من ئەگەرژنەکەزۆربەمەسرەف بێت پیاوبیکات باشترە٠لەبەرئەوەی ژن بەعام بایەخ بەجوانکاری وشتی زیادەی ناوماڵ دەدات ئەوشتانەی پێویست نین وڕواڵەتین ، هەروەهالەبەرئەوەی خۆی پارەکەپەیداناکات وپێوەی ماندوونەبووە ، بۆیەبەئارەزووی خۆی سەرفی دەکات ، وەئەوپیاوانەی دەوڵەمەندبوون زۆرجارژن هۆکاربووە٠

## لەبارەی مارەبڕینی کاتی (سیغە) :

سیغە بریتییە لەوزەواجەی ماوەیەکی دیاری کراوی بۆدانرابێ٠

بەڵگەکانی حەرام کردنی سیغە:

١-سەبرە(ڕەزای خوای لێ بێ)دەڵێ:(لەبەینی گۆشەی (حجرالاسو د) ، پێخەمبەرم دی لەوێ ڕاوەستابوولەکاتی حەجی ماڵئاوا وایی دەیفەر موو: خەڵکینە، ئەی موسوڵمانینەلەمەوپێش ڕێگەم بەئێوەدابووکەژ ژن سیغە بکەن (واتاژن بۆماوەیەکی کاتی دیاریکراومارەبکەن)بەلأم لەئێستاوەهەتاڕۆژی دوایی خودائەوەی حەرام کردووە )موسلیم وئەبوداودونەسائی ڕیوایەتیان کردووە٠

٢ – عەلی کوڕی ئەبی تالب (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ : (پێخەمبەری خوا(درودی خوای لەسەربێ) ڕۆژی غەزای (خەیبەر) ژنهێنانی کاتی وخواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەرام کرد) ئیمامی بوخاری ڕیوا یەتی کردووە٠

( )لەبارەی سیغەکەکچان بۆماوەی چەندرۆژێك مارەبڕی پیاوێك بێت دوای تێرکردنی ئارەزووی جنسی ژنەکەتەلاق بدات دەڵێ : دەبێ ئەم کارەچ ناوێکی لێبنرێت جگەلەبەتاڵکردنەوەی حەزووئارەزوونەبێت٠

## چۆن هاوسەری ژیانمان هەڵبژێرین ؟

لەفەیلەسوفێکیان پرسی چۆن ژن هەڵدەبژێری؟ وتی : دەمەوێ زۆرجوان نەبێ خەڵك چاوی تێببڕی ، زۆرناشیرین نەبێ کەخۆم دڵم نەتوانی تەماشای کەئەوەندە درێژنەبێ کەخۆمی بۆهەڵبڕم ، ئەوەند ەکورتیش نەبێ کەخۆمی بۆدانەوێنم ، ئەوەندە نەزان نەبێ کەلێم تێ نەگا ، ئەوەندەش بلیمەت نەبێ کە لەهەمووشتێك بکۆڵێتەوە ، ئەوەندە دەوڵەمەندنەبێ بڵێ پارەوماڵی خۆم ئەوەندەش هەژارنەبێ ، پاش مردنم منداڵەکانم سەرگەردان بن٠نوسەری میسری (سەلامەموسا)دەنوسێت ودەڵێت : ئەگەرویستت هاوسەرێك بۆخۆت هەڵبژێری ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوەبکە :-

١ – کچێکی ئاقل بێت٠

٢ – لەخێزانێکی ڕێزدار(محترم)بێت٠

٣ – تاڕاددەیەك جوان بێت٠

٤ – ڕۆشنبیربێت٠

کەسانێك وتوویانە: خانوێکی تەنگ وتاریك لەگەڵ ژنێکی ڕووخۆش وئیشکەروگورج وگۆڵ خۆشترە لەکۆشك وخانوێکی گەورە لەگەڵ ژنێکی ڕووگرژوتەمەڵ٠

(فان کرهتموهن فعسى ان تکرهوا شیئاویجعل الله فیه خیراكثیرا )النساء: ١٩

واتا:(ئەگەرخۆشتان نەویستن ولێیان بێزاربوون ئەوەدوورنییە دە شێت حەزتان لەشتێك نەبێت وخوابیکاتە مایەی خێروبێری زۆربۆتان)٠ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(باشترین ئافرەت ئەوەیەکاتێ تەماشای بکەیت دڵت خۆش بکات وەئەگەرفەرمانێکت پێدابەقسەت بکا وەئەگەرسوێندت خواردسوێندەکەت نەخات وەئەگەرلێی دوورکەوتیتەوە نامووس وماڵەکەت بپارێزێ)نسائی ڕیوایەتی کردووە هەروەهاتیرمذی گێڕاویەتییەوەکە(موغیرەی کوڕی شعبە)ئافرەتێکی خوازبینی کردپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەسەربێ)پێی فەرموو: برۆسەیری بکە ئەوەباشترە بۆبەینی خۆش وپێکەوەگونجانتان٠هەروەهاپیاوێکی قژتێکەڵ وقژدانەهاتوولەگەڵ ژنەکەی بەنیازی سکاڵاکردن چوونەلای خەلیفە(عومەری کوڕی

خەتتاب)(خوای لێ ڕازی بێ)ژنی پیاوەکە بەخەلیفەی وت: گەورەی بڕواداران من وئەوپیاوەیان نەوتووە(واتادیمەن وڕواڵەتی من ودیمەن وڕواڵەتی ئەو).

خەلیفەعومەر(خوای لێ ڕازی بێ)مێردی ژنەکەی ناردەوە تاخۆی ڕێکبخات وقژی کورت بکاتەوەونینۆکی پەنجەکانی بکات کاتێك پیاوەکە هاتەوە لای خەلیفە ژنەکە نەیناسییەوە بەلایەوەغەریب بووئیمامی عومەریش فەرمووی خۆتان بۆخێزانەکانتان ئاوالێبکەن.

هەروەها(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(اربح من السعادة:المراة الصالحة والمسكن الواسع والجارالصالح والمركب الهنیء واربع من الشقاء: الجارالسوءوامراة السوءوالمركب السوء والمسكن الضيق)هەروەهافەرموویەتی: الشوم فی الداروالمراةوالفرس)ئەسمای کچی عومەیس وتی: گوتم ئەی پێخەمبەری خوا شوم ونەگبەتی خانووچییە؟ فەرمووی: شوم ونەگبەتی خانووئەوەیە ڕووبەری بچوك بێ وتەسك بێ ودراوسێکەی خراپ بێ ، هەروەهابەپێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)گوترا شوم ونەگبەتی چوارپێ چییە؟فەرمووی : ولاغێك نەهێڵێ سواری ببی وبەخراپی هەڵسوکەوت بکات وبجولێتەوە.گوتراشوم ونەگبەتی ئافرەت چییە؟فەرمووی : ئافرەتێك کرداری خراپ بێ وبەخراپی ڕەفتاربکات. کەواتە نەگبەتی خانووئەوەنییە کاتێك خانوێك دەکڕی یاخودکاتێك ئافرەتێك مارەدەکەی لەوکاتەداڕووداوێك ڕووبدات وابزانی بەهۆی کڕینی ئەوخانووە یان مارەکردنی ئەوئافرەتە توشی بەلابووی.

لەبارەی هاوکوفی لەژنهێنان دا:

نوسەرێك دەنوسێت ودەڵێ:(هاوشانی(کفاءة)لەهەموورویێکی ژیانەوە :تەمەن،پلەی ڕۆشەنبیری ، پلەی کۆمەلایەتی... هتد)هەرهەمووی مەرجن ، ئەگەرلەنگی لەیەکێکیان دابوومارەبڕینەکەی دانامەزرێ) هاوکوفی خاڵێکی گرینگە پێویستەڕەچاوبکرێت ، ئەگەربێت ووەك یەکیش نەبن ، بەلام لەیەك نزیك بن ، لەوانەلەزانست وپلەی خو ێندەواری ، چونکە زۆرئەستەمە کەسێك پلەیەکی بەرزی خوێندەوار ی بڕیبێ لەگەڵ کەسێکی نەخوێندەواربتوانن ژیان بەیەکەوەبگوزەر ێنن ، ئەگەرلەیەکیش جودانەبنەوەئەواکێشەیان دەبێت وژیانیان لێ دەبێت بەدۆزەخ ، چونکەئەگەرزۆرلێك دووربن ژیانیان لێ دەبێت بەپرتەو بۆڵەوکێشەویەکێکیان خۆی بەخەساردەزانێ ، هاوکوفی واتالەیەك ئاست دابن ، لەخانەوادەولەجوانی ولەدین ولەعەقل ولەزانست وپلەی خوێندەواری. بێگومان کچی کابرایەکی دەوڵەمەند بەنازپەروەردەکراوە ، بەئۆتۆمبیل چووە بۆدەوام خزمەتکاروکارەکەریان لەماڵەوەهەیە ، قۆناغێکی بەرزی خوێندنی بڕیوە ، نەبوونی نەدیووە ، باش نییە بدرێتە کوڕی جوتیارێکی هەژار، چونکەئایائەوکچەدەتوانێ بەرگەی گڕوتینی گەرمای لادێ بگرێ؟ هاوشانی عەقل ومەنتیق بەڕاستی دەزانێ ، چونکەهاوشانی ژیانی هاوسەری بەچاکی ڕاگیردەکات.بەلام من لەگەڵ ئەوبەشەی قسەکانی ناکۆکم کەدەڵێ : ئەگەرلەنگی لەیەکێکیان بێ مارەیی دانەمەزرێ ، مارەیی دادەمەزرێ ، بەلام هاوشانی یەکتربن باشترە (موفتی پێنجوینی)ی شاعیرئامۆژگاری کچەکەی دەکا ، پێی دەڵێ:

**شوبكە بەكەسێ كە هاوشانت بێ**

**هاوعومروهاوژین هاوزمانت بێ**

**ئافرەت وچاولێكەری :**

**لەڕیپۆرتاژێكی گۆڤاری زنار ، ژمارە (١٧) ی ساڵی (٢٠٠٨) ئافرەتێك دەڵێ : (هاوسەرەكەم قەرزی دنیاشی كردبێ دەبێ كەل وپەلی ماڵەكەم لەسەرجوانترین شێوەبۆدابین بكات)٠(ه) دەڵێ : (حەزدەكەم ماڵەكەم ڕێك وپێك بێ ، ئەومیوان وخزمانەی هاتوچۆمان دەكەن حەزدەكەم جوانی ماڵەكەم ببینن ، دراوسێكەمان هاوسەرەكەی هەمووشتێكی بۆدابینكردووە ، چاوی دوژمن پێ كوێردەبێ بۆیەحەزدەكەم وەكوئەوانی ترشانازی بەماڵەوەبكەم ، چونكەئەوانەی دێنەماڵمان ڕاستەوخۆسەرنجی كەل وپەلەكان دەدەن٠لەكاتی گفتوگۆداباسی خۆهەڵكێشانی خۆیان دەكەن بۆیەهاوسەرەكەم قەرزی دنیاشی كردبێ دەبێ كەل وپەلی ماڵەكەم لەسەرجوانترین شێوەبۆدابین بكات)٠(پ)دەڵێ : (ئەگەربەقەرزیش بێ هاوسەرئەوەی پێویستی ماڵەوەیەبۆژن دابین بكات تاكولەوكاروانەجێنەمینێین كەدراوسێكەمان هەیەتی ، بوونی ماڵی ڕێك وپێك لەسەرمۆدیل حەزی منە ، ئینجاجل وبەرگ وئۆتۆمبیل وپارەی پێویستیش كەهەبێت هەمووئەوانەوادەكات ژیان بەشێوەیەكی تربگوزەرێت٠ئەودەڵێ : زۆرجارئەوانەی خزمی من ومێردەكەمن كەسەردانمان دەكەن بەچاوێكی ترەوەلێمان دەڕوانن باسی جوانی خانووباخەڵی پڕدەكەن٠خۆناكرێت تۆلەڕوودابمێنیت وباسی نەبوونی خۆتیان بۆبكەی٠ئەودەڵێ : من كێشەم ئەوەنییەهاوسەرەكەم پارەی هەیەیان نا ، هیلاك دەبێت یاخودماندوو ، گرینگ ئەوەیەبەقەرزاریش بێت ماڵی جوانت هەبێت ، خۆم عەیبداری كەس ناكەم)٠مامۆستا (أ) دەڵێ : (من تازەشووم كردووە مێردەكەم فەرمانبەرە ، بەهەردووكمان ئەوموچەیەی وەریدەگرین بەشمان ناكات كرێچیشین ، ناكرێت منێك مامۆستابم لەچاومامۆستاكانی تردراماڵەكەم شتومەكەكانی كۆن بێت ، ئەوانەی چەندساڵێكەكڕیومەدەیفرۆشمەوە هەرچەندەزەرەری زۆردەكەم ، بەلاَم شتی تازەلەماڵداجوانە٠ڕۆژانەدەیان ڕیكلام بۆشتی نوێ دەكرێ خۆمان بكوژین وژیانمان بەجوانی وبەختەوەری بەرێنەكەین)٠(ت)دەڵێ : (كاتێك ڕۆژانی چوارشەممەئۆتۆمبیلەكەدێتەگەڕەكەكەمان بەهۆڕن لێدان ئاگادارمان دەكاتەوە ، ئێمەش ئەوەی لەقاپ وقاچاغی نوێ هەیەخەڵێدەگرین ، خاوەنەكەشی لەدەفتەری قەرزدەینوسێت ئێمەش مانگانەقەرزەكەی دەدەینێ ، خۆئەگەرهاتولەماڵێ نەبووین ئەواژمارەی تەلەفۆنەكەی خۆمان داوەتێ تاوەكوپەیوەندیمان پێوەبكات ، وەئەوشتومەكەمان بەگران دەداتێ ، لەبەرئەوەی بەقەرزوەریدەگرین ومانگانەپارەیەكی كەمی دەدەینێ)٠سەبارەت بەوبابەتەمرۆڤ دەبێت بەقەدەربەرەكەی خۆی پێ ڕاكێشێت ، ژنیش دەبێ نەبوونی بزانێت٠لەڕاستیداسەردان ومیوانداری سیفەتێكی جوانە ، هەروەك ئاینی ئیسلامیش باسیكردووە بەبەجێگەیاندنی سیلەی ڕەحم(بەزەیی) بەلاَم میوانداری وسەردانیش نابێ باسی جوانی خانووئەوشتانەی تێدابكرێ بەتایبەتی ئەگەركەسەكەخانووی نەبێ وداهاتی كەم بێ ، چونكەزۆرجاردەبێتەهۆی ئەوەی ژنەكەلەگەڵ مێردی بكەوێتەدەمەقاڵێ لەگەڵ**

پیاوەکەی وکێشەی خێزانی لێبکەوێتەوە جاری وایەئەوناخۆشی ودەمەقالێیەدەبێتەهۆی شەڕکردن ومالّ بەجێهێشتنیش٠هەمووپیاووئافرەتێك حەزی لەوەیەئۆتۆمبیلی خۆی هەبێت وخانووی جوانی هەبێت٠(چەمکی سیلەی ڕەحم لەڕەحم ئافرەتەوە وەرگیراوە واتا لەڕەحمی ئافرەتەوە چەمکی خزمایەتی هەڵقولاوە)٠وە ئیمام ئەحمەدوئیبن ماجە وبوخاریش لەمەعازەوەدەگێڕنەوە کەوتویەتی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی پێکردم بە(دە)شت یەکێك لەوانە : (وأنفق علی عیالك من طولك) واتا:(بەئەندازەی توانای خۆت خەرجی مالّ ومندالّ بکێشە)٠هەروەهاخوای گەورەفەرموویەتی : (لینفق ذوسعة من سعته ومن قدرعليه رزقه فلينفق مماءا ته الله لايكلف الله نفسا الا ماءاتهاسيجعل الله بعدعسريسرا) الطلاق : ٧ واتا : ئەوکەسەی باری دارایی باشەودەوڵەمەندەوزۆری هەیە بابەگوێرەی پارەکەی ودەوڵەمەندییەکەی بژێوی بداتێ ، وەئەوەی دەستی کورتەوکەمی هەیەبابەپێی توانای بژێوی بداتێ ، چونکەخوای گەورە داواناکات لەکەسێك بەدانی بژێوی ژیان بەگوێرەی ئەوتوانایەنەبێ کەهە یەتی) جالەبەرئەوەدانی بژێوی بەگوێرەی باری دارایی دەبێ ، فەر ق ناکات ئەوئافرەتەلەلات بی یان تەلاقت دابی بەگوێرەی باری داراییە٠جائەوەی پێویستە چ پیاوچ ئافرەت بیزانێ بژێوی خێزان بەپێی تواناخواردن وخۆراك وپۆشاك وشوێنی حەوانەوە دابین بکات ڕەزیلی نەکات وزیادەڕەویش نەکات ، هەیەدەتوانێ هەفتەی دووسێ جارگۆشت ومیوەبۆمنداڵەکانی بکڕێ ، هەشەهەفتەی جارێك ، بەگو ێرەی زروف وباری دارایی پیاوەکە٠

لەبارەی دڵپیسی :

دڵپیسی وەکوگرفتێك لای مرۆڤ لەگومانەوەسەرچاوەدەگرێ ، بۆنموونەگومانکردنی پیاولەخێزانەکەی یان ئافرەت لەهاوسەرەکەی٠دڵپیسی وگومان یەکێکەلەکێشەترسناکەکانی نێوان ژن ومێرد کاتێك یەکێك لەهاوسەران ئەویتریان تاوانباردەکات بەناپاکی بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك متمانەیان بەیەکترنامێنێ٠زۆرجاریش پێش شوکردن کچان ڕەزیلی ودڵپیسی بەمەرجێکی گرینگی هاوسەرێتی دادەنێن ، دەپرسێت ئەوکەسەدڵپیس نییە ؟ ڕەزیل نییە ؟ ئەعرابییێك کوڕێکی ڕەشپێستییان بووئەم باوکەگومانی هەبوولەوەی ئەم کوڕەلەوبێت ، بەپێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وت : کوڕێکی ڕەشمان بووە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) پرسیارێکی ئاڕاستەکرد : ئایاحوشترت هەیە ؟ عەرەبەدەشتەکییەکەلەوەلامداوتی : بەڵێ٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) پرسی ڕەنگیان چۆنە ؟ وتی : سوورە٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : ئایاڕەنگی خۆڵەمێشییان تێدایە ؟ وتی : بەڵێ٠درودی خوای لەسەربێ فەرمووی : ئەمەچۆن دەبێ ؟ پیاوەکەوتی لەوانەیەبۆماوەیی بێت٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : ڕەشپێستی کوڕەکەی تۆش لەباب وباپیرانەوەپێیگەیشتبێ٠لێرەداپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) قەناعەتی پێیهێناوکابرای دەشتەکی دڵپیسیی وگومانەکەی لەدڵی

چووەدەرێ٠خۆدەکراپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمووبای گومان گوناهە٠بەلاّم پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەلگەی عەقلی بۆهێنایەوە٠ (ش) ناوی ئەوپیاوەیەکەبەهۆی مۆبایل ودلّپیسییەوەبووەهۆکاری خۆسوتاندنی ژنەکەی وگیانلەدەستدانی٠(ش)دراوسێیەکیان دەبێت پێنج شەش کوڕی بەرەللاّیان دەبێت ، ئەوپیاوەدەلّێت : (چ)ی ژنم کەدەیدی ژنی خەلّکی مۆبایلیان هەیە داوای لێکردم مۆبایلی بۆبکڕم،منیش مۆبایلێکی جوانم بۆکڕی٠٠٠ڕۆژێکیان کەمن لەمالّ نەبووم کچێکی ئەومالّەدراوسێیەمان کەچەندبرایەکی خراپی هەبوو هاتبووە مالّمان وداوای مۆبایلەکەی لە (چ)ی ژنم کردبوو گوتبووی کارێکی زۆرم بەبراکەم هەیە٠جادوای ئەوەی تەلەفۆنی پێ بۆبراکەی کردبوو کە (ه)ی ناوبوو ، (ه)یش یەکسەرژمارەی مۆبایلی (چ)ی لەمۆبایلەکەی خۆی خەزن کردبوو ، ئیترڕۆژانەکەمن لەمالّ نەبووم چەندجارتەلەفۆنی بۆ(چ)کردبوو ، بەلاّم (چ)هەرلەسەری داخستبوو تاڕۆژێکیان کەخۆم لەمالّ بووم نانی نیوەڕۆمان دەخوارد لەناکاوزەنگی مۆبایلەکەی (چ)لێیدا ، (چ)یش زۆرترساوپەشۆکاوگوتی : (ش) ئەوەچەندڕۆژێکەئەورەقەمەتەلەفۆنم بۆدەکات لێم ناگەڕێ ، منیش گوتم ئەگەرڕاست دەکەی بۆزوترقسەت نەکرد ؟ گوتی : نەمدەوێرا٠دواتربۆم دەرکەوت ئەوەی تەلەفۆنی بۆدەکات (ه)ی دراوسێمانە کەتابلّێی بێ ئەخلاق بوو ، من ئەوکات واگومانم دەبرد کە(چ) خۆی ژمارەکەی خۆی بەئەنقەست داوەتەئەم کوڕە ، بۆیەزۆرقسەی ناشیرینم بە(چ)وتومۆبایلەکەشیم لێ پارچەپارچەکرد بۆشەوهەندێکیشم لێداوهەڕەشەی تەلا قدانیشم لێکرد ، ئەویش زۆرگریاونێوانمان تێکچوو ، بۆسبەینەکەی کەچووم بۆکارهێشتانوستبوو ، کاتژمێریازدەوهەشت دەقیقە کەسێك هات بۆلام گوتی : (چ) نەوتی بەخۆداکردووە وخۆی سوتاندووە بۆیەلەهەمان کات گیانی لەدەستداودوومندالّی جێهێشت ، لەوڕۆژەوەهەمووساتێکم مردنەودەستم ئیشی ناگری٠(جیهانێك لەتاوان ، بەرگی یەکەم)٠

ئافرەت وکارکردن :

ئەوقۆناغەیەلەدوای تەواوکردنی خوێندن دێت ، زۆربەی خەلّکی پێیانوایەکارکردنی ئافرەت لەکەرتی گشتیدائاساییە ، بەلاّم ئەوەی ئاسایی نییەکارکردنی ئافرەت لەکۆمپانیاوئوتێل وکافتریاوواتا جۆری کارەکەوکاتی کارکردنەکە٠پیاوێك دەلّێ : حەزدەکەم کچەکەم ببێتەمامۆستا٠ئافرەتێك دەلّێ : کارکردنی ئافرەت لەدەرەوەی مالّ شتێکی ئاساییە ، بەلاّم هەمووجۆرەکارێك ئاسایی نییە ئەوەش لەبەردین وقسەی خەلّك٠پیاوێك دەلّێ : پێم ئیعتیادییەببێ بەفەرمانبەر ، بەلاّم پێم ئیعتیادی نییەببێ بەبێژەر(موزیع)٠ئافرەتێك دەلّێ : کچەکەم زۆرحەزی لێبووبچێتەکولیەی شوڕتە ، بەلاّم لێنەگەڕام چونکەئەوکچانەهەمووی دەمینێنەوە٠پیاوێك دەلّێ : ئیشی قورس بۆئافرەت نابێمەسەلەن ئافرەت لەکۆمپانیائیش بکات پێم ئیعتیادی نییە ، چونکەپێ لەکەداردەبی٠پیاوێك دەلّێ : پێم شتێکی ئیعتیادییەکچ بخوێنێ وتەعین بێ ، چونکەئەگەرئەمن خێزانم نەخۆش بی لەجیاتی ئەوەی بیبەمەلای

دکتۆری پیاودەیبەمەلای دکتۆری ئافرەت٠(بڕوانە : نادیەوەلی جەبار ، کاریگەری پرۆسەی بەمەدەنیبوون لەسەردانیشتوانی شاری هەولێر ، نامەی ماستەر(٢٠١٤) ، بەشی کۆمەڵناسی ، کۆلیژی ئەدەبیات ، زانکۆی سەلاحەددین ، هەولێر)٠

(ز خ)دەڵێ:ئافرەت لەنێوان دەوامی فەرمی وکاریماڵەوەدازۆرزەحمەتە ، کاتێك لەدەوام دێمەوەدەبێت بەکاروباری ماڵەوەومنداڵ خەریك بم ، بۆنموونەکاتێك دەوامم ئێوارانەپێویستەمنداڵەکەم ببەمەماڵی باوکم وئەوان بەخێوی بکەن ، ڕۆژهەیەدەیبەمەماڵی خەزورم ئەوان بەخێوی دەکەن ئەمەش کاریگەری بەسەرمەوەهەیە ، چونکەجاری وایەلەبەرزۆرگریانی منداڵەکەم تەلەفۆنم بۆدەکەن منیش نازانم چی بکەم ، بەلام دڵم هەرلەلایەتی ، خۆزگەلەفوتابخانەکان شوێنێك بۆبەخێوکردنی منداڵەکان هەبوایە٠

(س ق) فەرمانبەرەباس لەکارەکانی دەکات ، دەڵێ : من شانازی بەخۆم دەکەم کەخاوەن منداڵم ئەرکی خۆم جێبەجێ دەکەم٠لەهەمان کاتدادەوامی فەرمی ڕێگرەلەبەردەم هەمووشتێك ، چونکەدەواممان تاکاتژمێرسێیە نەبوونی دایەنگەلەفەرمانگەکان کێشەیەکی ترەچۆن دەتوانین پێڕابگەین بۆخزمەتکردنی منداڵەکانمان ، دوومنداڵم هەیەلەکاتێکدامنداڵێکم لەماڵی خەزورمە ، منداڵەکەی ترم لەماڵی باوانمە٠

### پەیوەندی نێوان بووك وخەسوو :

هەرلەکۆنەوە واباوەپەیوەندی نێوان بووك وخەسووخراپە٠(ب هـ) دەڵێ : خەسووم لەگەڵم زۆرباش بووە هیچ کات گلەیی لێم نەبوو ، چونکەمن زۆرخزمەتم کردووە هەرگیزنەمهێشتووە دڵی لێم بشکێ ، چونکەبەبڕوای من ئەگەربووك بەچاوی دایك سەیری خەسووی بکات ، خەسووش بەچاوی کچی سەیری بووك بکات ئەواهیچ کێشەوگرفتێك لەنێوانیاندانابێ٠(م)دەڵێ : زوولەخەوهەڵنەستان وزوونان ئامادەنەکردن کێشەیەکی زۆری نێوان بووك وخەسووە لەسەرزۆرنوستن ودرەنگ لەخەوهەڵسان٠

### لەبارەی خزمایەتی :

خزمایەتی پەیوەندییەکی کۆمەلایەتییەدووجۆرە خوێنی وبەهۆی ژن وژنخوازییەوە٠لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا‌خزمایەتی کەوتۆتەبەرکاریگەری گەلێك هۆکاری جۆراوجۆر ، وەك : سەرقالی وململانێ و٠٠هتد٠تاکەکانیش زیاترئیرەیی بەوکەسانەدەبەن کەدەیانناسن ولێیانەوەنزیکن ، بۆیەپەندیکی عەرەبی هەیە دەڵێ : (ألاقارب کاالعقارب)واتا : (خزم وکەس وەك دووپشك وان)٠

پلەکانی خزمایەتی :

پلەیەك : (دایك ، باوك ، کوڕ ، کچ)دەگرێتەوە٠

پلەدوو : (خوشك ، برا ، کوڕی کوڕ ، کچی کوڕ ، باپیر ، داپیر)٠

پلەسێ : (مام ، پلك)٠

پلەچوار : (ئامۆزا واتامندالآنی مام ، پلك زاواتامندالآنی پلك)٠

**کچان وژنان لەهاتوچۆکردن بەتەکسیدا :**

سەبارەت بەهەڵسوکەوتی خراپی هەندێك لەشوفێرەکان (ڕ)دەڵێ : هەمووی چەند دەقیقەیەك نەبووسواری تەکسییەك بووم ، شوفێرەکەبەدەنگێکی هێواشەوە وتی : کچی باش لەوەدەچێت ئەوگۆرانییەت بەدڵ بێت بۆیەواخەیاڵت ڕۆیشتووە ، منیش وتم : بەڵێ٠وتی:دەڵێم ماشەللاً زۆرجوانی ، (ڕ)دەڵێ : زانیم کەسێکی زۆربێ مستەوایەبۆیەبێ دەنگ بووم٠شوفێرەکەوتی : کچی باش بڕوابکەخۆشم دەوێی لەتاوان ناتوانم لێبخورم ، بەلآم هەرلێی بێ دەنگ بووم وخۆم کرکرد٠ئەوجارەکەمێك بەدەنگی بەرزوتی : ئەرێ خانم لەگەڵ تۆمەخۆکەڕنی ، شووم پێدەکەی ؟! (ڕ)دەڵێ : منیش بەتوندی وەلآمم دایەوە وتم : ئەرێ عەیب ناکەی کوێڕامنت خۆش ویست ؟! داوای شووم لێ دەکەی ، من دایکی منالێکم ، تۆنازانی ژنی کێم ؟! بۆیەیەکسەرمۆبایلەکەم دەرهێناولەبەرخۆمەوەگوایەقسەدەکەم وتم : فلان ٠٠٠ئەوەتاکسییەك منی فڕاندووەلەفلاًن جێگام ، قسەکەم تەواونەکرد شوفێرەکەوەستاو وتی : دابەزە٠

(ئە)دەڵێ : ڕاستەهەندێك شوفێرهەیەخەڵك بێزاردەکات وهەڵسوکەوتی نابەجێ دەکات ، بەلآم هەمووشوفێرەکان وەك یەك نین٠(ت)دەڵێ : بۆخۆم تەنیالەگەڵ بەتەمەنەکان سواردەبم ، چونکە هەرچۆنێك بێ ئەوان باشترن٠(ڕ)کەشوفێری تەکسییەدەڵێ:چەم بێ چەقەل نابێ ، هەمووشتێك دەبێ٠(گۆڤاری ئاوێزە ، ژمارە (١٣) ، ٢٠١٠)٠

**لەبارەی بێوەژنکەوتنی ئافرەت :**

بێوەژن بەوژنانەدەوترێت کەواهاوسەرەکانیان لەدەستدەدەن چ بەمردن بێت یاخودجیابوونەوە٠بێوەژن لەئاینی ئیسلامداکەسێکی ئاسایی ناوکۆمەڵگایەمافی شوکردنی پێدراوە وەك کچێك سەربەستەلەبڕیاردانی مافی هاوسەرگیری بەحەزوخواستی خۆی٠

لەکۆنداله (هیندستان) پیشەی هەندێ هۆزوابوو ، کە ئەگەرژنێك مێردەکەی بمردبابەزیندوویی خۆی ولاشەی مێردەکەی فڕێ دەدرانە ناوتەندووری ئاگرەوە،هەتاهەردووکیان دەبوون بەخۆڵەمێش ، لەپا شان ئەوخۆڵەمێشە دەدرابەدەم باوە ، بەلآم ئینگلیزەکان لەکاتی دا گیرکاری هیندستاندا توانیان دەستیان پێ لەم نەریتە هەلگرتن٠ لە (ئۆڕاگوا)ی ئەمریکای خواروو ، ژنێك کەمێردەکەی بمردبا دەبوایە (٦)شەش مانگ بمێنیتەوەلەوژوورەی کەمێردەکەی تیامردووە ، هەر گیزنەدەبووبچێتەدەرەوە ، خواردن وئاویشیان بۆدەبرد٠لە(ژاپۆن) کەژنێك مێردی بمردبا نەدەبووهەتاماوە جل وبەرگی تازە لەبەربکا ، بەڵکودەبووهەمیشە جلی کۆن ودڕاوی لەبەردابێت ، وەنەدەبووبۆخۆ شوشتن ، یان جل شوشتن صابوون بەکاربهێنێت٠لە(صین) دەبووبێوە ژن خۆی بکوژێت بەتەنیشت مێردەمردووەکەیەوە،وەئەگەربێوەژنێك

ئەمەی نە کردبا خۆی ومندالەکانیان دەبردبەکوەیلە دەیان فرۆشتن ،دواتردەستورێکی تریان دانابۆئەوەی نەفرۆشرێن پێویست بوولەسە ری بچووبایەکێك لەپەرستگاکان لەوێ ژیانی بەسەربردبا هەتادەمرد ،هەربێوەژنێکیش شوی بکردباوە، حوکم دەدرابەوەی(٨٠)هەشتازللەی لێبدرێ ، لە(کۆنغۆی) لەناوهۆزی(بنجالا)ژنێك کەپیاوەکەی بمردبا د ەبوایە خۆی لەدارستان بشاردباوە ، هەتا(٣)مانگ لەشیشی لەقوڕبگر ێت٠هەروەهامندالأنی بێ سەرپەرشت وبێ پارێزگارلەڕووی جل وبەرگ وبرسییەتی وپێداویستی ئەمەبۆخۆی مەسەلەی فرەژنی گرینگتردەکات لەبەرئەوەئامانجێکی پیرۆزی مرۆڤانەیە کەژن ومندالْ بێکەس وبێسەرپەرشت نەمێننەوەومندالّی بێباوکەکان لەئەستۆبگرن وئەوانەی کەبۆدووەم جارهاوسەرگیری دەکەن هەولّبدەن زیاترئەوژنانەمارە بکەن کەمندالّیان هەیە٠

**لەبارەی زیندەبەچالْکردنی کچان :**

دەبێ ئەوەبلّێین کەهەمووعەرەبەکان ئەم نەریتەیان ئەنجام نەداوە ، بەلّکوهەندێك لەتیرەکانی عەرەب بەبیانووی هەژاری وشەرمەزاری کچانی خۆیان زیندە بەچالْ دەکردبێجگەلەهەژاری هۆیەکی دیکەبۆ زیندەبەچالْکردنی کچان هەبوو، ئەویش بەدیلگرتنی کچان وژنان لە ئەنجامی شەڕوشۆڕەکان٠ڕۆژێکیان یەکێك لەهاوەلأن ئەم دیمەنەتراژ یدیەی سەردەمی نەفامی بۆپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)گێڕا یەوە ، وتی : ئێمەلەسەردەمی نەفامی کیژۆلّەکانی خۆمان زیندەبە چالْ دەکرد ، ئێمەش تازەکچێکمان بووبوو کچەکەمان مایەوەتازمانی پژا ، ڕۆژێك بەدایکیم وت : بیگۆڕە دەیبەم بۆمالّی خالّی ، کچەکەهە ربەڕاستی وایدەزانی بۆمالّی خالّی دەچێت ، بۆیەلەخۆشیدابازبازێنی دەکرد ، بەلأم شوێنی مەبەست مالّی خالّی نەبوو ئەوچالّەبووکە پێشتربۆی هەلّکەندرابوو ، کەگەیشتینەلێواری چالّەکە بەکچە کەم وت : تەماشایەکی ناوچالّەکەبکە ، ئیدی هەرکەسەری نوی کردەوە منیش کێشام بەپشتی داو لەناوچالّەکەگرمۆلّەم کرد ، کەچی ئەوهەرهەولّی دەدا بەقەراغی چالّەکەدا هەلّگەڕێت وبێتەدەرەوە ، لەلایەك پەلەقاژەی دەکردولەلایەکی تریشەوە دەیوت : بابەگیان تۆزاوی بوویت ، دەیویست بم تەکێنێ ، بەلأم من دانەیەکی ترم پیاکێشاولەوبیابانەچۆلّەدا بەزیندویی کردم بەژێرخاکەوە ! کاتێك ئەوپیاوەئەوڕووداوەی گێڕایەوە ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) وئەوهاوەلأنەی لەدەوری دانیشتبوون هەنسکی گریانیان پێ ڕانەگیرا٠

**لەبارەی ئافرەتەناودارەکان :**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی** :(اكمل من الرجال كثيرولم يكمل فى النساء الااسياامراة فرعون ومريم ابنت عمران وخديجة بنت خويلد وان فضل عائيشة على النساء كفضل الثريدعلى سائر الطحام)**رواە** البخارى ومسلم

**واتا:(خەلّکێکی زۆرلەپیاوان پێگەیشتن وکامل بوون کەچی لەژنان تەنیا ئەم چوارژنە گەیشتنە کەمال: ئاسیای ژنی فیرعەون،مەریەم ی کچی عیمران،خەدیجەی کچی خوەیلد ، وە فەزل وڕێزی عائیشە بە سەرژنانی تردا وەك فەزلی تەشریب وایە بەسەرتەواوی خواردنەکانی تردا (دیارە ئەوخواردنە لای**

عەرەبەكان زۆرخۆش بوو)٠بەپێی ئاماریكی ساڵی (٢٠٠٤)لەنێوان زیاترلە(١٨٥)دەوڵەتتەنیالە(١١)یانزەدەوڵەت ژن سەركردایەتی كردووەفەیلەسوفی ئەمریكی ئمرسۆن(١٨٠٣ —١٨٨٢)دەڵێ : ((مێژووبونی نییەئەوەی كەهەیەتەنیاپیاوانن)٠نوسەرومێژوونوس ورەخنەگری سەدەی هەژدەم (تۆماس كاریل)پێی وایەمێژووی ڕاستەقینەهەمان زانستی پیاوانە٠

لەمێژووی جیهاندا تەنیاهەندێك بەرپرس ئافرەت بوونە ، وەكو :

١ - عادیلەخانم

ساڵی(١٩٢٤)كۆچی دوایی كردووە،لەدوای مردنی مێردەكەی : (عوسمان پاشای جاف)بۆماوەی(١٥)پانزە ساڵ كاروباری عەشیرەتی جافی لەهەڵەبجە بەڕێوەبردووە٠

٢ - قەدەم خێر

ئەم ئافرەتە شۆڕشی(پشتكۆ)ی لەدژی شای ئێران هەڵگیرساند٠

٣ - خانزاد

هاوسەری میرسلێمان بەگی سۆران بوو،پاش مردنی مێردەكەی كارووباری میرنشینی سۆرانی خستە ژێردەسەڵاتی خۆی٠

٤ — بنازیربۆتۆ : توانی سەرۆكایەتی وەزیرانی پاكستان بگرێتە دەست٠

٥ — مارگرێت تاتشەر : سەرۆك وەزیرانی بەریتانیای گرتە ئەستۆ٠

٦ - ئەلیزابێتی دووەم : شاژنی ئیرلەندای باكوربوو٠

٧ — شاژن ئیرینی:لەسەردەمی(هارۆونەرەشید)دەسەڵاتی رۆمی لەبەردەست دابوولەگەڵ(هارۆونەرەشید)رێككەوتبوولەبەرامبەرداجزیەی دەدا٠

٨— كوندالیزاڕایس : ئەوئافرەتەبەرەگەزئەفریقییە بەهۆی زیرەكی ولێهاتویی خۆی توانی ببێتەوەزیری دەرەوەی ویلایەتەیەكگرتووەكانی ئەمریكا٠

هاوسەرەكانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) :

یەكەم : خدیجە بنت خویلد(خوای لێ ڕازی بێ)

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) تەمەنی بیست وپێنج ساڵ بوولە (مەككە) هاوسەرگیری لەگەڵ كرد٠

تایبەتمەندییەكانی :

١ — هەموومنداڵەكانی لەخەدیجەیە ، جگەلە ئیبراهیم كەلە(ماریەی قیبتی)بوو٠

٢ — هەرگیزپێغەمبەری تورەنەكردووە ، دڵنەوایی دەكرد٠

٣ — وەكاتێك خەدیجە كۆچی دوایی كرد ئەوساڵەی ناونا (عام الحزن) ، چونكە خەدیجە دڵی دەداوەودەچووبەدەمییەوە٠

دووەم : سودە بنت زمعە(خوای لێ رازی بێ)

کاتێك خەدیجەوەفاتی کرد ، (سودە)ی خواست٠

سێیەم : عائیشەی کچی ئیمامی ئەبوبەکر(خوای لێ ڕازی بێ)

دووساڵ بەرلەکۆچکردنی بۆمەدینە مارەی کردو لەمەدینە گواستییەوە٠ ساڵی (٥٨)ی کۆچی وەفاتی کردولە(بەقیع) نێژرا٠

تایبەتمەندییەکانی :

١ – تێگەیشتنی لەدین هەبووبەئوممەتی دەگەیاند٠عائیشە(خوای لێ ڕازی بێ) (٢٣٦٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە دەربارەی ئەحکامەشەرعییەکانی تایبەت بەئافرەتان٠

٢ – جگەلەوپێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) هیچ کچێکی نەهێناوە٠

٣ – خوای تەعالابەریکرد لەوتۆمەتەی درۆزنان دایانە پاڵی بۆپاکیزەیی وپاکی ئەووەحی دابەزی ، ئەودرۆوبوختانەی دەرهەق بەوکرا بۆی بووبە خێرێکی گەورە ، چونکە خوای گەورە وەحی دابەزاند بۆپاکیزەیی ئەو ، خودا مەرتەبەی زۆربەرزکردەوە٠

٤ – پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەماڵەکەی ئەودا وەفاتی کردو لەژوورەکەی ئەودا خرایە ژێرخاك٠

چوارەم : حەفسەی کچی ئیمامی عومەر(خوالەخۆی وباوکی ڕازی بێ)٠

پێنجەم : ام حبیبەی کچی ئەبوسفیان (خوالەخۆی وباوکی ڕازی بێ) ناوی (رملە بنت صخر)بوو ، لەگەڵ هاوسەرەکەی (عوبیدوڵای بن جحش) کۆچی کردبۆحەبەشە ، لەوێ مێردەکەی بووبە (نەصرانی) ، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) خواستی ، نەجاشی چوارسەددیناری مارەیی بۆدا (نەجاشی ناسناوی پاشای حەبەشەبوو) ، لەتەمەنی حەفتاساڵیداکۆچی دوایی کردولە (بەقیع) نێژرا٠

شەشەم : ام سەلەمە

ناوی (هند بنت ابی امیە بن المغیرە)یە ، پێشترهاوسەری (ابی سلمی) بوو ، ساڵی شەست ودووی کۆچی لەتەمەنی (٨٤)ساڵی وەفاتی کردولە (بەقیع) نێژرا٠

حەوتەم : زینب بنت جحش

ناوی خۆی (بەڕە)بوو ، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ناوی نا (زەینەب) کچی پوری پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بوو ، پێشترهاوسەری (زەیدی کوڕی حارسە) بوو ، ئەوتەلاقی داو خوای تەعالا لە پێغەمبەری مارەکرد ، لەمەدینە وەفاتی کردولە(بەقیع) نێژرا٠

تایبەتمەندییەکانی :

تایبەتمەندی (زەینەبی کچی جحش) ئەوەیە خودا (جل جلالە) مارەی بڕیوە٠

**هەشتەم : زینب بنت خزیمە**

**ساڵی سێیەمی کۆچی پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)هاوسەرگیر ی لەگەڵ کرد ،دوومانگ یان سێ مانگ لای مایەوە ، پاشان کۆچی دوایی کرد.**

**هەشتەم : ماریەی قیبتی**

**ناوی (ماریەی کچی شەمعون) ە ، لەباوکێکی قیبتی ودایکێکی نەصرانی ڕۆمی لەمیصرلەدایکبووە ، خوشکی (سیرن)ی هاوسەری حسان بن سابتی شاعیربوو. لەساڵی(١٦)ی کۆچی وەفاتی کردولەگۆ ڕستانی(بەقیع) نێژرا.**

**نۆیەم : جویریە بنت الحارث**

**ناوی خۆی (بەرە)بوو ، کچی حارسی سەرۆکی بەنی موستەلەقی جولەکەبوو پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ناوی نا(جویریە) لەغەزای (بنی مصطلق) بەدیل گیرابوو ، ئەوئافرەتە بووبەمو موسوڵمان ، بەهۆی ئەوەوە سەدکەسیان لە خانەوادەکەی ڕزگارکرد.**

**دەیەم : صەفیە**

**لەخەیبەروەك دیلی جەنگ گیرابوو ، ساڵی حەوتی کۆچی مارەی کرد.**

**یازدە : میمونە بنت الحارث**

**دواین ئافرەتە پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هێناویەتی. مەیموونە واتا پیرۆزناوی خۆی (بەرە)بوو ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ناوی نا(میمونە) ، چونکەلەڕۆژێکی پیرۆزی وەك (حەج) یەکتریان ناسی.**

## بەشی پێنجەم

**ژمارە :**

**لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆزوفەرموودەکانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) کۆمەڵێك ژمارەزۆردووبارەبوونەتەوە ، بەشێوەیەك سەر نجی زانایانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوەوتوویانە دووبارەکردنەوەی ئەو ژمارانە بێهودە نییە ، بەڵکونهێنی تایبەتی تێدایە ، هەشیانە دووبا رەبوونەوەی ژمارەکان بەحالەتێکی ئاسایی دادەنێت٠**

**یەکەم — ژمارە حەوت وحەوتا :**

**ئاسمانەکان حەوتن ، چینەکانی زەوی حەوتن ، ڕۆژەکان حەوتن ، خولقاندنی مرۆڤ بەحەوت قۆناغ تەواوبووە ، قۆناغەکانی تەمەن حەوتن:یەکەمجارمنداڵە ، پاشان نەوجەوانەتاچواردە ، پاشان هەرزە کارە ، پاشان لاوە ، پاشان پیاوێکی کاملە ، پاشان پیرە ، پاشان کەنە فتەوزۆرپیرە تاکۆتایی تەمەن٠(**طفل ، صبی ، غلام ، شاب ، کهل ، شیخ ، هرم)٠

**تەواف وسوڕانەوەبەدەوری کەعبەحەوت جارە ، ڕەجمکردنی** شیطان **حەوت جارە ، ئەگەردایك وباوك جیابوونەوە،منداڵەکەیان تەمەنی بووەحەوت ساڵ مافی هەڵبژاردنی پێدەدرێ لەنێوان دایك وباوکی دا هەرکا میانی هەڵبژاردلەگەڵ ئەویان دەچێت ، خوای تەعالاحەوت ڕۆژباکەی باڵا دەستکردبەسەرقەومی عاد ، خوای تەعالاسەبارەت بەوکەسانەی خێریان بۆزیاددەکات نموونەیەکی هێناوەتەوە بەتۆیەك بووبەحەوت گوڵەگەنم هەرگوڵێك سەدتۆوی تێدابووە٠لەم ئوممەتە داحەفتاهەزاردەچنەبەهەشت بەبێ حیساب ، ژمارەی کیشوەرەکان حەوتن ، وشەی** (رؤيا) **لەقورئانی پیرۆزدا لەحەوت شوێن دا هاتووە ، کەبەڵگەیەلەسەرخەونی ڕاستەقینە ، ڕوناکی بینراوحەوتە ، زەوی حەوت ئۆقیانووسە ، پێلوی چاوبریتییەلەحەوت تەبەقە ، واتا حەوت پێستی بەیەکەوەنووساو ، ژمارەی شتەسەرسوڕهێنەرەکانی دنیاحەوتن : (دیواری چین ، باخچەهەڵواسراوەکانی بابل ، ڕووباری نیل ، ئەهرامەکانی میصر ، ٠٠٠هتد)٠زیاترلە(٢٠٠٠)دووهەزارساڵ بەرلەئێستامێژووناسێکی ئیغریقی بەناوی (فیلۆن) کەزۆرلەوڵاتانی جیهان گەڕابووهەڵسابەدەستنیشانکردنی حەوت شوێنی سەرسوڕهێنە رلەجیهانداکەبەڕای ئەوئەم حەوت شوێنەسەرسوڕهێنەرترین شوێنەکانی جیهانن٠**

**دیوار(پەرژین)ی چین :**

**یەکێك لەحەوت سەرسوڕهێنەرەکەی جیهانە،هەندێك پێیان وایە درێژی ئەدیوارە (٧٠٠٠)کم درێژەوپانیەکەشی هیندەپانە کەشەست سواربەسواری ئەسپ دەتوانن بەتەنیشت یەکدابەسەردیوار ەکەدا**

برۆن ، چەندین ماددەوکەرەسەی جیاوازلەدروستکردنی ئەم دیوارە بەکارهاتووە ، کە بریتین لەبەردوخشت ، هەروەها لەنێوان بەردو خشتەکان قوڕولیتەوچیمەنتۆی قسل بەکارهاتووە هەندێك مێژووی دروستکردنی ئەم دیوارە دەگەڕێننەوە بۆسەدەی حەوتەمی پێش میلاد ، هەندێکی تریش پێیان وایە ئەم دیوارە لەسەدەی پێنجەمی میلادییەوە دەست پێدەکات٠مەبەستی سەرەکی لەدروستکردنی ئەم دیوارە پاراستنی چین بوولەهێرشی هۆزەبەربەرییەکان٠بێگومان ئەم ژمارەیە خاسیەت وتایبەتمەندییەکی تێدایە کەجگە لەم ژمارەیەبەدی ناکرێت،بێ حیکمەت نییە خوای گەورە ئەم ژمارەیەی لەم هەمووشتە داناوەسورەتی (قاف)کەژمارەی پیتی قا فەکانی (٥٧)قافن ، سورەتی (شوری)ژمارەی پیتی قافەکانی (٥٧)قافن ، ئەگەربێت وژمارەی پیتی قافەکانی هەردووسورەت کۆبکەینەوە (١١٤)سورەت لەقورئانی پیرۆزداهەیە ، هەروەهادڵی مرۆڤێکی ئاسایی لەخولەکێك دا(٧٠)حەفتاجارلێدەدات٠هەروەها (قورتبی) دەڵێ : بەهەشتەکان حەوتن : ( بەهەشتی مە ئوا، بەهەشتی فیردەوس ، مالی(الجلال) ، ماڵی هەمیشەبەردەوام ماڵی باخی چڕوپڕی عەدەن ، بەهەشتی خۆشگوزەرانی ، ماڵی سەلام) ، هەروەهاپاشای(میسر)لەخەودابینی: حەوت گای قەڵەووحەوت گای لەڕی دیوە حەوت گوڵەگەنمی سەوزوحەوت گوڵەگەنمی هیشك٠ حەزرەتی یوسف(سەلامی خوای لێ بی)بۆی تەعبیرکرد:(حەوت ساڵ هات وحەوت ساڵ نەهات دەبێت، حەوت ساڵان لەدوویەك بەرهەم زۆردەبێت ، ئێوە لەوبەرهەمەی دە دوورنەوە هەڵگرن پاشان حەوت ساڵ هیشك ودژواردەبی لەوساڵانە بەرهەمە هەڵگیراوەکە بخۆن٠ هە روەهایارانی ئەشکەوت حەوت کەس بوون: (یملیخا ، مکسیولینا ، مثیلنا ، مرحواس ، دبریوس ، سرابیون ، افلستیوس) ، ناوی سەگەکە ش(قتمیر)بوو ، ناوی پاشاکە (دقیانوو س)بوو ، ناوی ئەوشارەی لێوەی هەڵاتوون(ئەفسوس) ، ناوی ئەشکەوتەکە(ڕەقیم)بوو،سەبارەت بەوشەی ڕەقیم چەندبۆچونێك هەیە:

١-ڕەقیم لەوحەیە نەسەب وناوودینی خۆیان لێ نووسیووە ، وەبۆچی هەڵاتوون لێیان نووسیوە٠

٢-ناوی ئەوچیایەیەکەئەشکەوتەکەی لێبووە٠

٣-ناوی ئەوگوندەیە یان ئەوشارەیە کەلێی بوون (بڕوانە: یاقوت الحموی، محجم البلدان)٠

**ئایەتەکان :**

١-(بەڕاستی ئەی محمد(درودی خوای لەسەربێ)ئێمە ئەوحەوت ئایەتەمان پێبەخشی کەلەنوێژەکاندادووبارە دەکرێنەوەوتەواوی قورئانیشمان پێبەخشی)الفجر: ٨٧ (شێخ محەمەدی خاڵ ، دەڵێ : کاتێك قورئان هاتەخوارەوە حەوت شێوەی قسەکردن هەبوولەمە ککەودەوروبەری وەك شێوەی : قورەیش وقیس وتمیم وهزیل و اسدوخزاعە وکنانە)٠

٢-(استغفرلهم اولاتستغفرلهم ان تستغفرلهم سبعین مرة فلن یغفر الله لهم ) التوبة :٨٠

٣-(قال تزرعون سبع سنین دأبا الاقلیلا مما تأکلون) یوسف : ٤٧

٤-(وبنینا فوقکم سبعا شدادا ) نباء : ١٢ واتا : (ئایادروستمان نەکر دووە لەژوورسەرتانەوە حەوت ئەستیرەی قایمی بەهێز) ، شێخ محەمەدی خاڵ لە (تەفسیری خاڵ) جزمی سێیەم دەڵێ :(مەبەست لەم حەوتە ،

ئەوحەوت ئەستێرە گەڕۆكانەن كەبە دەوری ڕۆژدا دەسوڕێنەوە وەئاسمانن بۆزەوی ، وەك : مەریخ وموشتەری وزحل وئەورانووس ونبتۆن وپلۆتۆوئێكس ، كەئەم حەوتەلەسالی (١٩٥٣) دۆزرانەوە ، بەلاَم عەتاردوزوهرە بەرناكەون ، چونكە لەژوورزەو ییەوەنین ، بەڵكولەژێرزەوییەوەن ، ئەم ئە ستێرە گەڕۆكان بەهە موویان لەگەڵ ڕۆژومانگ وزەوی وعەتارد وزوهرە كۆمەڵەی ڕۆژی (مەجموعەی شەمسی) پێكدێنن٠

**فەرموودەكان :**

١-(ئەگەرسەگ دەمی خستە دەفری هەریەكێتانەوە ئەواپا كژییەكەی بەوەدەبێت كەحەوت جاربیشوات،یەكەمجاریش بەگڵ) ئیمامی مو سلیم ڕیوایەتی كردووە٠

لەبارەی پیسی سەگ دووڕاهەیە:

١-هەمووجەستەی سەگ پیسە كەڕای زۆرینەیە٠

٢-پیسی لەناودەم ولیكی دایە٠

ئەوكەرەستەوماددانەی ئەمڕۆلەبواری پاگژكردنەوە (تەعقیم)

بەكاردەهێنرێت لەوسەردەمەدانەبووە لەوسەردەمەدا(دروودی خوا ی لەسەربێ)بەمەبەستی پاكژكاری ودژەمیكرۆب بەزۆری ئامۆژگاری بەكارهێنانی گڵی دەكردوگڵێش هەروەكوئاوكرداری پاگژكردنەوە ئەنجام دەدات جاكاتێك(درودی خوای لەسەربێ)ڕێنمایی بەكارهێنانی گڵ دەكات بۆشوشتن مەبەستی ئەوەیە كەسەرەتا كەرەستەكە تە عقیم بكرێ٠

٣ - (یەك ڕكات نوێژی بەسیواكەوە ، چاكترە لەحەفتاڕكات)٠

٤ - (حەوت ساڵ یاری بكە لەگەڵ منداڵەكەت ، لەحەوت ساڵییەوەبۆچواردە ساڵی ئەدەبی فێركە)(مرۆڤ هەرحەوت ساڵ جارێك دەگۆڕێت،هەمووشانەیەكی لەشی مرۆڤ هەرحەوت ساڵ جارێك دەگۆڕێت وتازەدەبێتەوە ، لێكۆڵینەوەكان دەریان خستووە كە ئەم گۆڕانكاریانەنەك تەنیابە سەروسیاوەدەردەكەون ، بەڵكوكارێكی گرینگیش دەكەنە سەرلایەنی سۆزوبیروهەست وئەندامەكانی ناوەوە ی لەش٠ ئاگاداربوون وپشكنین زانایان دەربارەی ئەم گۆڕانەحەوت ساڵانەیەی مرۆڤ یارمەتییەكی زۆری پزیشك وپسپۆڕانی دا لەچارەكردن ولێكۆڵینەوەكانیان لەسەرمرۆڤ٠ حەوت ساڵی یەكەم (منداڵێتی) : ئەمەیان لەیەكەم ڕۆژی تەمەنەوەدەست پێدەكات ، واتائەوساتەی كەبزوتنەوەی منداڵ لەسكی دایكی دا دەست پێدە كات٠حەوت ساڵی دووەم (پێگەیشتنی هەستەكان) لەحەوت ساڵییەوە تاچواردە بەرەوهەرزەكاری دەڕوات)٠

٥ - عەبباسی كوڕی جولەیدی ، دەڵێ: گوێم لەعەبدوڵای كوڕی عومەر بوو ، دەیگووت : پیاوێك هاتە لای پێخەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ)،گوتی: ئەی پێخەمبەری خواچەندجارلەخزمەتكارمان ببورین؟ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بێدەنگ بوو ، پیاوەكەپرسیارەكەی دووبارەكردەوە ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ)بێدەنگ بوولەجاری سێیەمین پێخەمبەر(درودی خوای لەسە بێ)فەرمووی:

لەهەمووڕۆژێکداحەفتاجاربیبووره٠ (هەندێ لەزانایان دەڵێن : مە بەست ژماره نییه ، بەڵکومەبەست زۆرییە)٠

٦-(لەکاری خێرداپەلەبکەن پێش ئەوەی تووشی حەوت شت بن، تافەقیرنەبوون وخواتان لەبیرنەچۆتەوە، تازۆردەوڵەمەندنەبوون وتوغیانتان نەکردووە،تانەخۆش نەکەوتوون وپەکتان نەکەوتووە، تاپیرنەبوون وعەقلتان نەگۆڕاوە، تامردن لەناکاونەگەییوەتە سەرتان ، تادەجال نەهاتووەودنیاخراپ نەبووە، تاڕۆژی قیامەت وحیساب نەهاتووە کەلەهەموویان نارەحەتترە)٠

٧-(هەموومنداڵێك(کۆرپەلەیەك)بارمتەی هۆزەبانەکەیەتی کەلەڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی بۆی سەردەبڕدرێت ولەڕۆژی حەوتەم سەری دەتاشرێ وناوی لێ دەنرێ)٠(تێبینی: ئەگەرسەری منداڵەکە نەرم بووسەرتاشینەکە دوادەخرێ)٠

٨-(هەرکەس بەیانییان حەوت خورمای نێوان دوولابە(لابە دووپار چە زەوییە لە مەدینە)بخوات ژەهرزیانی پێناگەیەنێت تائێوارەی بەسەردادێت)٠

٩-(حەوت جۆرەکەس هەن لەڕۆژی قیامەتداخوای گەورە دەیانباتە بن سێبەری خۆیەوە کەبێجگەلەوسێبەرێ نابێ بۆحەوانەوە لەوڕۆ ژەدا: پێشەوایەکی دادگەر،لاوێك لەناوخواپەرستیدا پێگەیشتبێ ،د ووکەس لەبەرخواپێکەوەکۆببنەوەولەبەرخودالێك جیاببنەوە،پیاوێك هەمیشە دڵی بەمزگەوتەوەبەستڕابێ، پیاوێك لە چۆڵەوانی دا یادی خوابکات ولەبەرخودابگری ، پیاوێکیش ئافرەتێکی خاوەن حەسەب ونەسەب وجوان بانگی بکات بۆکاری ناشیرین کەچی خۆی نەدابەدە ستەوەوبڵێ: من لەترسی خواناوێرم پیاوێکیش خێروسەدەقە بەدە ستی ڕاستی بکات ئەوەندەبەنهێنی بیکات دەستی چەپی نەزانی٠

١٠-(شەهیدلەلایەن خوای گەورەوە ، حەوت خەڵات دەکرێت :

١- هەرلەگەڵ ڕژانی یەکەم دڵۆپی خوێنی خوای گەورەلەتەواوی گوناهەکانی دەبوورێ٠

٢- لەبەهەشتداپلەوپایەی خۆی دەبینێ٠

٣- لەسزای گۆڕپارێزراودەبێ٠

٤ — ترسی نەفخەی دووەمی نابێ٠

٥ — بەجوانی وزینەتی ئیمان دەڕازێنرێتەوە٠

٦- چەندین (حورولعەین)ی پێدەبەخشرێ٠

٧- بۆحەفتاکەس لەخزم وکەس وکاری خۆی شەفاعەت(تکا)دەکات٠

١١-(موسوڵمان خواردن دەکاتە ناویەك ڕیخۆڵە ، بەلاّم کافروخوانەناس دەیخاتەنێوحەوت ڕیخۆڵە)مەبەستی ئەوەیە کەئیماندارحەلال خۆرەو کافرگوێی لەحەلال وحەرام نییە٠

١٢-(ئەم ئاگرەی ئێرەبەشێکەلەحەفتابەشی گەرمای ئاگری دۆزەخ)بو خاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە٠

١٣-(ئافرەت لەژنانی خەڵکی بەهەشت سپیایی قاچەکانیان لەپشت حە فتابەرگ دەبینرێ)٠

١٤-(شەهیدەكان جگەلەوكەسەی لەپێناوی خودا شەهیددەكرێ حەو تن :
١- ئەوكەسەی بەتاعوون دەمرێ٠
٢-خنكان لەئاودا (خنكان لەئاودا یەكێكە لەوكارەساتانەی زۆردە بینرێ ودووبارەدەبێتەوە ودەبێتەهۆی گیان لەدەست دان٠ بەزۆری خنكان لەئەنجامی مەلەكردن لەگۆم وزێ دا ، بەتایبە تی لەوەرزی هاوین دا كەخەڵك دەچنەسەیران وگەشت خنكانی منداڵ ومێردمنداڵان لەئاودا زیاترە)٠
٣- ئەوەی بەنەخۆشی تەنیشت دەمرێ٠
٤- ئەوەی بەسك ئێشە دەمرێ٠
٥ - ئەوەی دەسووتێ (سوتان یەكێكەلەوكارەساتانەی كەڕۆژنییە چەندەها كەس لەجیهاندا نەبنە قوربانی ئەوكارەساتە ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : دەرگاكان دابخەن ، قاپەكان داپۆشن ، چراكان خامۆش كەن شەیتان ناتوا نێت دەرگا داخراوەكان بكاتەوە) مەبەستی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەوفەرموودەیە خۆپاراستنە لەمەترسییەكان لەنموونەی نەخۆشی كەبەهۆی خواردنی سەروالاً بلاًودەبێتەوە ، هەروەهاخۆپاراستن لەمەترسی ئاگركەوتنەوە٠
٦-ئەوكەسەی شتی بەسەردادەڕووخێ٠
٧ - ئافرەت بەمنداڵبوون بمرێ٠ ئیمام ئەحمەدونەسائی وئەبوداودلەئیمام مالیك یان گێڕاوەتەوە٠
١٥-(جاری وایە مرۆڤ وشەیەك دەڵێ كەزۆرگرینگ نییە بەلایەوە ، بەلاًم حەفتاجاردەیخاتە دۆزەخەوە) ، واتابۆماوەی حەفتاساڵ ڕێگەی چوونی بەهەشتی لێدەگرێ یان حەفتاساڵ زیاترلەدۆزەخ دەیهێڵێتەوە خواش زاناترە٠
١٦-(نوێژێك كەبەكۆمەڵ بكرێت چاكترەوخێری زیاترەلەنوێژێك بەتەنیابكرێت بەبیست وحەوت پلە)رواە الشیخان٠
١٧-(پێویستەلەسەرهەموموسوڵمانێك كەلەهەمووحە وت ڕۆژ یێك ڕۆژێك خۆی بشوات)بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان كردووە (حق كل مسلم ان یغتسل فی كل سبعة ایام یوما)
١٨-(التمس لاخیك سبعین عذرا) واتا:(هەمیشە بۆبرای دینی خۆت زۆرعوزربێنەوە ، حە فتاعوز روپاكانە)٠
١٩- (دۆزەخ دەهێنرێت حەفتاهەزارجلەوی هەیە ، لەگەڵ هەر جلەوێك داحەفتاهەزارفریشتە هەن ڕایدەكێشن)٠
٢٠-(ئەبووهوڕەیرِ(خوای لێ ڕازی بێ)دەڵێ : لەكاتێكدا ئێمەلەخزمەت پێخەمبەر(درودی خوای لێ بێ)دابوو ین ، گوێی لەگرمەیەك بووفەرمووی: دەزانن ئەوە چی بوو ؟ وتمان : خواوپێخەمبەری خوا زاناترن ، فەرمووی : ئەوەبەردێك بووفرێدرایەناودۆزەخەوە حەفتاپایزە ڕۆدەچێت ئێستادای لەبنەكەی)٠

**٢١-(ئیبن عومەر(خوای لێ ڕازی بێ)دەڵێ : پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : بگەڕێن بەشوێن دەشەوی کۆ تایی دا ئەگەرکەسێکتان بێ هێزبوویان نەیتوانی باحەوتەکەی کۆتایی لەدەست خۆی نەدات)٠**

**٢٢-(ئەگەرلەسەرڕێگەی شەقام ناکۆکیتان تێکەوت ، ئەواپانی ڕێگە کە بەحەوت باڵ مەزندە دەکرێ)٠**

**٢٣-(هەرکەسێ یەك بست زەوی بەزۆرلەیەکێ بستێنێ ، خوای گە ورەهەرحەوت تەبەقەی زەوی لەئەستۆدەکات)متفق علیه**

**٢٤-( ئەوەی حەج بکە بەپێ ڕۆیشتن بۆمەککە تالێی دەگەڕێتەوە بەهەرهەنگاوێ حەوسەدچاکەی بۆدەنوسرێ لەچاکەی مەککە چاکەی مەککە یەك بەسەدهەزارە)حاکم ڕیوایەتی کردووە٠**

**٢٥-(کەلەشاخ بکەن لەوچاڵەی کۆتایی کاسەی سەرداکەدەنووسێ بە ملەوەودەکەوێتەژێرڕژێنی نوخماوییەوە ، بۆحەفتاودوونەخۆشی شیفایە)٠کەلەشاخ(حیجامە) : بریتییەلە ڕاکێشان ودەرهێنانی خوێنی پیس بەچەندئالەتێکی تایبەتی ، بۆیەپێی وتراوە کەلەشاخ چونکەلەکۆندا شاخ یان قۆچی ئاژەڵیان بەکارهێناوە بۆکەلەشاخ کردن ، لەزمانی عەرەبیشدا پێی دەوترێ (حیجامە) کەدەڵێن لەوشەی (احتجم)وەرگیراوە ، واتا: بەرگری کرد، واتابەرگری دەدات بەلەش لەبەرامبەرنەخۆشی، لەبارەی مێژووی کەلەشاخ لە کتێبی(مواد طبیة) ، کەکۆنترین کتێبی پزیشکی چینییەکانە مێژووەکەی دەگەڕێتەوەبۆ(٢٠٠٠)دووهەزارساڵ پێش میلاد باسی کەلەشاخ کراوە هەروەهایۆنانییەکان وڕۆمانییەکان(٣٥٠٠)سێ هەزاروپێنجسەدساڵ پێش میلادکەلەشاخیان بەکارهێناوە، هەروەهامیسرپە کۆنەکانیش کەلەشاخیان بەکارهێناوە٠**

**ئەوکەسەی کەلەشاخ دەکات دەبێ ئەم خاڵانە جێبەجێ بکات:**

**١ - دەبێت لەخورینی بیکات،واتانابێت پێش کەلەشاخکردن خواردن بخوات٠**

**٢ - نابێت پێش کەلەشاخکردن خۆی بشوات،هەروەهانابێت دوای کەلەشاخکردنیش ڕاستەوخۆخۆی بشوات ، تاوەکوشوێنی برینەکە سارێژدەبێتەوە٠**

**٢ - نابێت لەپێش وپاش کەلەشاخکردن خۆی ماندووبکات ، بە ڵکودەبێت کەمێك پشوبدات٠**

**٤ - باشترەبەیانیان زووبکرێت٠**

**٥ - نابێت لەوەرزێکی زۆرگەرم، یان شوێنێکی زۆرگەرم بکرێت، باشترین وەرزوەرزی بەهاروپایزە٠**

**٦ - بۆکەسێك ناکرێت کەخوێنی بەخشیبێت تاکوماوەیەك بەسەریدا تێپەڕدەبێت٠**

**(کەلەشاخ پیشەیەکی پزیشکی میللییە وپێش هاتنی ئیسلامیش هەبووە ، ئیسلامیش بەشتێکی باشی زانییوە ، بۆیەهێشتویەتییەوەوهانی باوەڕدارانی داوە بۆئەنجام دانی٠)**

**٢٦-(کەدووبرواداردەستی یەکیان گوشی حەفتاپاداشتیان پێدەدرێ شەست ونۆی بۆئەوکەسەیە ڕووگەشتروزمان خۆشتربێ)٠**

**٢٧-ئەوەی خەمبارێك لەخەم دەربێنێ پەروەردگارحەفتاوسێ گوناحی لەکۆڵ دەخا)٠**

٢٨-(کەدووموسوڵمان بەیەکگەیشتن سەد پاداشتیان پێدەدرێ، نەوەدی بۆئەوکەسەیەسەرەتاسلاّوی کردووە دەی بۆئەوەی وەلاّمی دایەوە)٠

٢٩-(ئەوانەی بۆڕەزامەندی خوا یەکتریان خۆش دەوێ ئەستوونێك لەیاقووتی سووربۆیان هەڵدەدرێ کەحەفتاهەزارکۆشکی لەسەرە)٠

٣٠-(ئەوەی سەردانی نەخۆش بکا بێگومان لەبەهەشت دادەحەسێتەوە کەگەڕایەوەپەروەردگارحەفتاهەزارفریشتە تەرخان دەکات کەتاشەود رەنگان سەلاّواتی بەسەرداببارێنن)٠

٣١-(ئەگەرموسوڵمان سەلام لەموسڵمانێك بکات مەلائیکەت حەفتاجار داوای ڕەحمەتی خودای بۆدەکەن)٠

٣٢-(کردەوەی نهێنی خێری زیاترە بەحەفتاجارلەکردەوەیەك کەبەئاشکرابکرێت)٠

٣٣-(حەوت شت هەیەلەسەربەندە خێروپادا شتەکەی بەردەوام دەبێ، ئەمەش لەدوای مردنی لەناوگۆڕەکەیەتی: هەرکەسێك یەکێك فێری زانستێك بکات، یاخود ڕووبارێك بەکرێ بدات ، یاخود بیرێکی ئاوهە لێکەنێت، یاخوددارخورمایەك بچێنێت، یاخودمزگەوتێك دروستبکات، یاخودپەرتوکێکی بەسوودبە جێبهێڵێت ، یاخودمنداڵێکی چاك وئیما ندارەبەجێبهێڵێت لەدوای مردنی دوعای بۆبکات)٠

٣٤-(قورئان لەسەرحەوت شێوەزار(لهجە)دابەزیوە)

٣٥-ئەبوداودرپیوایەتی کردووە بەوتەی عەبدوڵای کوڕی عومەر(خوایا ن لێ ڕازی بێ) :

نوێژپەنجابوون ، خۆشوشتن بۆلەشگرانی حەوت جاربوو ، شوشتنی شتی میزاویش حەوت جاربوو ، بەردەوام پێخە مبەر(درودی خوای لەسەربێ) داوای دەکرد (داوای ئاسانکاری لەخوای تەعالادەکرد) ، هەتانوێژبوونەپێنج وخۆشوشتنی لەشگرانی بووەجارێك وشوشتنی میزاویش بووە جارێك)٠

٣٦-لەجابر(خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ : (لەگەڵ پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)حوشترێکمان لەجیاتی حەوت کەسان سەربڕی ، مانگایەکیشمان لەجیاتی حەوت کەسان سەربڕی)رواه مسلم٠

٣٧-(الایمان بضح وسبعون بابا ادناها اماطه الاذی عن الطریق) رواه الترمذی٠ واتا :(ئیمان حەفتاوئەوەندە دەرگایەی هەیە ، پلە نزمەکەیان ئەوەیەکۆسپ و نارەحەتی هەمووئەوەی ئازاربەخشە لەرێگەی خەڵك دا لاببەی)٠

٣٨-(فەرمانم پێدراوە کەلەسەرحەوت ئێسقان وئەندامی لەشم سوجد ەببەم وبەرگ وپۆشاکم نەپێچمەوە)متفق علیه

٣٩-(حەوت شت هەن لەنوێژدا سەرچاوەکەیان لەشەیتانەوەیە : خوێنپژانی لووت وخەوەنوچکەووەسوە سەوباویشکدان وخۆخوراندن ولاکردنەوەویاری وگەمەبەشت)٠

٤٠-(من اذن في مسجد سبع سنین وجبت له الجنة ، ومن اذن اربعین عاما دخل الجنة بغیرحساب)رواه الترمذی وابن ماجة واتا :(ئەوەی حەوت ساڵ لەمزگەوتێکدا بانگ بدات ئەوەدەچێتەبە هەشتەوە ، ئەوکەسەی کەچل ساڵ بانگ بدات ئەوەدەچێتەبەهە شتەوەبەبێ هیچ لێپرسینەوەیەك)٠

**٤١-(ئێوه حه‌فتا ئوممه‌ت ته‌واوده‌كه‌ن ، ئێوه له‌هه‌موویان خێر دارتروبه‌ڕێزترن به‌لای خوای گه‌وره)حه‌دیسێكی حه‌سه‌نه ئیمامی احمد و ئیبن ماجه وترمذی ڕیوایه‌تییان كردووه‌٠**

**٤٢-ئیبن عومه‌ر(خوای لێ ڕازی بێ) ده‌ڵێ : پێخه‌مبه‌ر(درودی خوای له‌سه‌ربێ)فه‌رموویه‌تی:(خه‌وی چاك به‌شێكه له‌حه‌فتا به‌شی پێخه مبه‌رایه‌تی) ئیمامی بوخاری ڕیوایه‌تی كردووه‌٠**

**٤٣-ئه‌بوهوڕه‌یره (خوای لێ ڕازی بێ) ده‌ڵێ : پێخه‌مبه‌ر(درودی خوای له‌سه‌ربێ) فه‌رموویه‌تی : (له‌ڕۆژی قیامه‌ت دا ئاره‌ق حه‌فتا باڵ ڕۆده چێت به‌زه‌وی دا وتاده‌می خه‌ڵكیش دێت یاخود تاگوێچكه‌یان ، دوود له‌ كامیانی فه‌رموو) ئیمامی بوخاری ڕیوایه‌تی كردووه‌٠**

٤٤-( مروا اولادكم بالصلاة وهم ابناء سبع واضربهم وهم ابناء عشروفرقوابينهم في المضاجع ) اخرجه ابوداود

**٤٥-له‌سه‌حیحی بوخاری دا هاتووه : ئه‌بوبه‌ڕای كوڕی عازب ، ده‌ڵێت : پێخه‌مبه‌ر(درودی خوای له‌سه‌ربێ) فه‌رمانی پێده‌كردین به‌كردنی حه‌وت شت وڕێگه‌ی لێ ده‌گرتین به‌نه‌كردنی حه‌وت شت : فه‌رمانی پێده‌كردین به‌سه‌ردانی كردنی نه‌خۆش وبه‌شوێنكه‌وتنی مردوو به‌نزاكردن بۆئه‌وانه‌ی كه‌ده‌پژمن وسوپاسی خوواده‌كه‌ن ، وه‌به‌ده‌م ده‌عوه‌ت وبانگكردنه‌وه‌بچین وسه‌لام بلاَوبكه‌نه‌وه‌ویارمه‌تی سته‌م لێكراوان بده‌ن وسوێندخۆرڕزگاربكه‌ن له‌سوێنده‌كه‌ی ، وه‌ڕێگه‌ی لێ ده‌گرتین له ئه‌نگوستیله‌ی ئاڵتوون ، وه‌له‌خواردنه‌وه‌له‌قاپ وقاچاغی زیو ، وه له‌به‌كارهێنانی سه‌رزینی ئاوریشمی (ژنان دروستییان ده‌كردله‌ئاوریشم بۆسه‌رزینی ولاغی پیاوه‌كانیان) ، هه‌روه‌ها ڕێگه‌ی لێده‌گرتین له‌به‌كارهێنانی قوماشی چینراویان تێكه لكراوبه‌ئاوریشم ، هه‌روه‌ها ڕێگه‌ی لێده‌گرتین له‌پۆشینی ئاوریشم ، هه‌روه‌هاله‌پۆشا كێك لێوه‌كه‌ی چینرابێت به‌ئاوریشم)٠**

**٤٦- قورئان له‌باره‌ی دۆزه‌خییان ده‌فه‌رمووێ :** (ثم في سلسلة ذرعها سبعون ذراعافاسلكوه ) الحاقة : ٣٢
**واتا : (پاشان له‌ناوزنجیرێكی حه‌فتاگه‌زی ڕه‌كێشكه‌ن)٠**

**٤٧-ئه‌وپیاوانه‌ی له‌گه‌ڵ حه‌زره‌تی مووسا بوون (سه‌لامی خوای لێ بێ) حه‌فتاكه‌س بوون (واختارموسى قومه سبعين رجلا لميقاتنا ) الاعراف : ٥٥ واتا : (ئه‌وساموسا(سه‌لامی خوای لێ بێ) حه‌فتاكه‌سی له‌هۆزه‌كه‌ی ده‌ست نیشانكرد كه‌بێنه‌دیده‌نی ئێمه)٠**

**دووه‌م- ژماره‌سێ :**

**ژماره (٣)سێ له‌قورئانی پیرۆزوفه‌رمووده‌ی پێخه‌مبه‌ر(درودی خوای له‌سه‌ربێ) زۆردووباره‌بۆته‌وه ، ئاوخواردنه‌وه به‌سێ قوم ، سێ جار له‌ده‌رگادان بۆمۆڵه‌ت وه‌رگرتن وچوونه‌ژووره‌وه‌، یان له‌سه‌رسێ كه‌س تاوان نییه : خه‌وتووتاخه‌به‌ری ده‌بێته‌وه ، منداڵ تابالغ ده‌بێت ، شێت تاچاك ده‌بێته‌وه‌٠ له‌كورده‌واریش ده‌ڵێن : ئه‌گه‌رجارێك خه‌له تاندمت خوابتگرێت ، ئه‌گه‌ردووجار خه‌ڵه‌تاندمت خوابتگرێت ، ئه‌گه‌رسێ جارخه‌ڵه‌تاندمت خواخۆم بگرێت‌٠ هه‌روه‌هادكتۆره‌كان گوێیان كردۆته سێ به‌ش ، مۆخی مرۆڤ سێ په‌رده‌ی**

هەیە ، گلێنەی چاوبریتییەلەسێ تەبەقەوتە ڕایی•هەروەهاهەموومرۆڤێك لەپاش مردن وناشتنی لەنێوگۆڕداسێ پرسیاری لێدەكرێ : من ربك ؟ ومادینك ؟ ومن نبیك ؟ واتا : كێ خواتە ؟ ئاینت چییە ؟ كێ پێخەمبەرتە ؟

١-پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ:(سێ كەس ناچنە بەهەشتەوە : كەسێ هەمیشە عارەق بخواتەوە ، كەسێ ئازاری دایك وباوكی بدات ، كەسێكیش شت ببەخشێ وبیداتەوەبەڕوودا)•

٢-(نیشانەی دووڕووسیانە : كاتێك قسەی كرد درۆدەكات ، كەپەیمانی دا نایباتەسەر، كەبەدەستپاك دانرا ناپاكی لێ دەكات) ئیمامی بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان كردووە• (وشەی دووڕوو ، وەسفی ئەوكەسانەی پێدەكرێت كەلەڕوڵەت دا خۆیان بەموسو ڵمان نیشان دەدەن لەنا خیشەوە دژی ئیسلامن یاخود كافرن• پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەڕاشكاوی ڕووبەڕووی دووڕووەكان نەبۆتەوە ، پێیان بڵێت : تۆدووڕووی)•

٣-پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:(اذا خرج ثلاثة في سفرفليؤمروا احدهم)•

٤-ابی سلمی ، دەڵێ : من خەوی وام دەبینی نەخۆشی دەخستم تاگەیشتم بە(ئەبوقتادە)،ئەویش وتی:منیش خەوم دەبینی نەخۆشی دەخستم ، هەتا بیستم لەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)دەیفەر موو : بەڕاستی خەوی چاك لەخواوەیە ، هەركەسێك لەئێوە خەو یكی بینی پێی خۆش بووباسی نەكات لای كەسێ نەبێ كەخۆشی دەوێ ، ئەگەرشتێكی بینی بەلایەوە ناخۆش بوو ، باسێ جارتف بكات بەلای چەپیدا وپەنابگرێت بەخوا لەخراپەی شەیتان وخراپەی ئەوخەوە بۆكەسیش نەگێڕیتە وە، ئیترئەوخەوەزیانی بۆی نابێ• ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی كردووە•

٥-پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : شیفاوچارەسەر لەسێ شت دا یە : خواردنی هەنگوین وگرتنی كەلەشاخ وسوتاندنی برینەكە ، بەلاّم من ڕێگاتان پێنادەم بەسووتاندن)•

٦-پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:(من فەرمانتان پێدەكەم بەسێ شت وڕێگەتان لێ دەگرم لەسێ شت فەرمانتان پێدە كەم : هاوەڵ بۆخودا بڕیارمەدەن وەدەست بەپەرتووكەكەی خواوە بگرن ، وەگوێڕایەلی تەواوی خودابكەن هەتا مردن دێتەسەرتان ، وەداواتان لێدەكەم ئامۆژگاری كاربەدەستان بكەن وەگوێڕایەل بن لەوشتانەی دەیدەن بەسەرتان ، وەڕێگەتان لێدەگرم لە : وتی وتی ، وەلەپرسیاری زۆر،وەلەبەفیڕۆدانی ماڵ وسەروەت وسامان•

٧– پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:(اعلموا اولادكم الرماية والسباحة وركوب الخيل) واتا : (منداڵەكانتان فێری ڕم هاویشتن ومەلەوانی وسوارچاكی بكەن)•سێ جموجۆل وچالاكی هەڵبژاردووە• (چونكەمرۆڤ بەدرێژایی ژیانی سوودی لێ دەبینێت ، بۆنموونە كاتێك جەستەی مرۆڤ جوولەدەكات بۆهاویشتنی تیرێك ئەواجەستەی بەهێزدەكات•هەروەهامەلەكردن لەش ولارڕێكدەخات وجوانی پێدەبەخشێت ، حالەتێكی فریاگوزاریشە لەهەمان كاتدا دەتوانێ سوودی هەبێت بۆخەڵك،یەكێك ئازادبكەیت

لەمردن٠هەروەهاسوارچاکی کەسەردەمێك سوودی لێ دەبینرالەحالەتی جەنگ ، هەروەهابۆسەفەروبازرگانی)٠

٨– پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (ثلاثة لاتردعوتهم : الصائم حتى يفطر، والامام العادل ، ودعوة المظلوم يرفعهاالله فوق العظام ويفتح لهاأبواب السماء ويقول الرب : وعزتي لانصرنك ولوبعدحين ) رواه احمد واتا : (سێ تاقم وکۆمەڵ دوعاونزایان گیرادەبێت ورەت ناکرێتەوە :

١ – ڕۆژووەوان تاکوڕۆژووەکەی دەشکێنێت

٢ – پێشەوای دادپەروەرلەگەڵ گەلەکەی

٣ – نزاوپاڕانەوەی ستەم لێکراو

٩ – فەرموودەیەك هەیەدەفەرمووێ : (ثلاثة لايدخلون الجنة : مد من الخمر ، ومصدق بالسحر ، وقاطع الرحم ) واتا : سێ گروپ ناچنەبەهەشت : ئەوانەی بەردەوام مەشروب خۆرن (هەرگیزتۆبەی لێ ناکەن وهەرلەسەرئەوحالەتیادەچن) ، ئەوانەی کەتەسدیقی جادووسحردەکەن ، ئەوانەش کەقەتعی سیلەی ڕەحم دەکەن٠)

١٠ – لەڕیوایەتێکدا : ئەی پێخەمبەری خوا(درودی خوای لەسەربێ) کێ لەپێشترەلەگەڵی باشبین ؟ فەرمووی : (أمك ثم أمك ثم أمك ثم أباك ، ثم أدناك ثم أدناك) واتا : (دایکت پاشان دایکت پاشان دایکت پاشان باوکت ، پاش ئەوخزمی نزیك وپاشان دورتر)٠

١١ – (ثلاثة لاينظرالله اليهم يوم القيامة : العاق لوالديه والمرأة المترجلة المتشبه بالرجال والديوث ، وثلاثة لايدخلون الجنة : العاق لوالديه والمدمن الخمروالمنان بماأعطى) رواه احمد والنسائی٠واتا : (لەڕۆژی دواییداخوای گەورەسەیری سێ کەس ناکات : ئەوەی ئازاری دایك وباوکی دەدات ، ئەوئافرەتەی خۆی دەچوێنێ بەپیاوان ، وەکەسێك داوێنپیسی لەماڵ ومنداڵی دەبینێت لێی بێدەنگ دەبێ٠وەسێ کەس ناچنەبەهەشت : کەسێك ئازاری دایك وباوکی دەدات ، کەسێك ئالودەی خواردنەوەبووەوکەسێك شتێك ببەخشێ ومنەت بکابەسەریا)٠

سێیەم- ژمارە شەست :

مرۆڤ کەتەمەنی گەیشتە شەست ساڵی لەسەرپەتی مردنە ، پێخە مبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : خوا(جل جلاله)بە هانەلەخەڵك وەردەگرێ ، هەتاتەنەنیان دەگاتەشەست ساڵ٠

چوارەم- ژمارە چل :

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەتەمەنی چل ساڵی نیگای بۆهات،حەزرەتی مووسا(سەلامی خوای لێ بێ) چل شەولەکێوی (طور) مایەوە بۆدیداری پەروەردگاری (فتم میقات ربه اربعين ليلة ) الاعراف:١٤٢ ، مرۆڤ لەچل ساڵی تەمەنی کامل دەبێت وتەواوبیردە کاتەوەبەخۆی دادەچتەوە ، وەکولەئایەتی (١٥)و(١٦)ی

**سورەتی (الاحقاف)داهاتووە٠هەروەهابۆزۆرڕووداوچل ڕۆژیان داناوە کەدەوترێ (چلە) کەلەدوای چل ڕۆژلەڕووداوەکە یادی دەکەنەوە٠ هەروەهاچلە لەکەلتوری کوردیدازۆرباوە ، وەکوچلەی زستان ، چلەی هاوین ،چل ڕۆژپاش مندالّبوون٠هەروەها پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (هەرکەسێك بڕواتەلای فالّچییەك (عرا ف) نوێژی چل ڕۆژی لێ وەرناگیرێ) ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە٠(عراف ئەوکەسەیە قسەلەڕابردوودەکات ، دەلّێ : من شتی ونبوودەدۆزمەوە دەزانم کێ دزیویەتی ولە کوێی داناوە ، کهانەش قسەلەداهاتوودەکات)**

**پێنجەم – ژمارە (٩٩) و(١٠٠) :**

**کاتێك دەست بەژماردنی هەرشتێك دەکەین دەگەینەژمارە(١٠٠) واهەست دەکەی کۆتاییەك تەواوبووەودەبێ خۆمان بۆسەرەتایەکی نوێ ئامادەبکەین ، هەروەهاهەرسەدسالّ پێی دەوترێ سەدە٠**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دوای هەموونوێژێکی فەرز (٣٣) جار**سبحان الله و(٣٣)جار(الحمدلله)و(٣٣) جار(الله اكبر) **کەدەبنە (٩٩) وبەوتنی** (لااله الاالله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيءقدير) **دەیانگەیەنێتەژمارە(١٠٠) ، یان ئەودووفریشتەیەی دێن بۆلای حەزرەتی داود (علیه السلام) وتاقیدەکەنەوە ، یەکێکیان دەلّێ : ئەوەبرامە نەوەدونۆمەڕی هەیە ، من دانەیەکم هەیە ، کەچی داوادەکات من ئەویشی بدەمێ ، تابیکاتە سەد** (ان هذا اخي له تسع وتسعون نعجة ولي نعجة واحدة فقال اكفلنيها وعزني في الخطاب ) **ص : ٢٣ هەروەهاپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرمویەتی:**(يبعث الله لهذه الامة من يجددلهادينهاكل مائة سنة) **واتا : (خوای گەورەهەرسەدسالّ جارێك کەسێك دەنێرێت بۆئەم ئوممەتە تائاینەکەی نوێبکاتەوە)٠نوێکردنەوەبەواتای کەلەکەبوون یان کاریگەری دەرەکی لەسەرئاین لابرێت یان ئەوشتانەی داهێنراون٠هەروەهاچاکەکردن وهەلّوێست وکرداری خۆمان وگرینگی بدرێ بەکرۆکی بەهاکانی ئیسلام وڕاستگۆیی ودەستپاکی و٠٠٠هتد٠**

## بەشی شەشەم

**لەبارەی توڕەبوون وزیانەكانی :**

**وتراوەهەرشەڕێ كەتووشی مرۆڤ دەبێ ، یان لەحەزوئارەزووی نەفسەوەیە یان لەڕق هەستانەوەیە٠زۆرجیاوازی لەجۆرەكانی توڕەبوونداهەیە ، هەیەتوڕەدەبێ ناتوانێ كۆنترۆڵی خۆی بكات شت ڕادەوەشێنێ یاخودخۆی دەسوتێنێ ، جاری واشەكەسەكەتوڕەدەبێ بەلاَم دوای چەنددەقیقەیەك دەگەڕێتەوەباری ئاسایی خۆی٠زۆرجاربابەتی ئازایەتی كورتكراوەتەوە لەئازایەتی ڕووبەڕووبوونەوەوشەڕكردن وزەبروەشاندن وئەم جۆرە شتانە٠كاتێك باسی ئازایەتی دەكرێت خەڵك تێگەیشتنی بچووك دەبێتەوەوتەنیائەولایەنەدەبینێ ، لایان وایەهەركەسێك خەڵك لێی بترسێ ولەشەڕدائازابێت ئەوەبەئازاناودەردەكات ، بەلاَم ئازایەتی زۆرمانالەخۆدەگرێ بەتایبەتی مەسەلەی ناوناخی مرۆڤ٠هەندێك وتوویانە : (ئازایەتی بریتییەلەتوانای ئارامگرتن وخۆگرتن)٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (**ليس الشديدبالصرعة وانماالذي يملك نفسه عندالغضب)**٠واتا : (ئازایەتی بەزۆرانبازی نییە ، بەڵكوئەوەیەكەمرۆڤێك لەكاتی توڕەییدا بتوانێت خۆی بگرێ)٠هەندێكی تروای بۆدەچن ئازایەتی بریتییەلەتوانای هەلگرتنی نهێنی ، كاتێك یەكێك قسەیەكت لاباس دەكات نەیدركێنیت لای خەڵك ، باسی نەكەی)٠هەندێكی ترلایان وایەئازایەتی بریتییەلەتوانای وتنی وشەی حەق٠**

**زیانەكانی هەڵچوون :**

**١-پەستانی خوێن بەرزدەبێتەوە٠**

**٢-لێدانی دڵ بەرەوزیادبوون دەڕوات٠**

**٣-ئاستی شەكرلەناوخوێن دابەرزدەبێتەوە٠**

**٤ – زۆرجارلەكاتی توڕەبووندا چەندین ڕستەودەستەواژەدەوترێ وەك : ئیمانم نەماوە٠هەروەهالەكاتی توڕەبووندا ناشیرینترین وبێ ئەدەبترین ڕستەبەكاردێ٠توڕەییش تائاستی شت شكاندن وجل وبەرگ لەبەرخۆدادڕین وتەنانەت خۆسوتاندنیش٠**

**تاوان :**

**تاوان دیاردەیەكی ترسناكە ، كەهەرلەسەرەتای مرۆڤایەتییەوەبوونی هەبووە٠یەكەم تاوانیش لەمێژووی مرۆڤایەتیدا كوشتنی هابیلەبەدەستی براكەی كەقابیل بوو٠كەسیش تاوانی بۆناچێتەسەر،چونكەخوایەك هەیەچاودێری دەكات٠ئەوكەسەی تاوان دەكات پیاوێكی ژیرنییە٠پیاوێكی بەدڕەوشتە ، ئەم ئەكوژێ ،**

بەویترجنێودەدات ، ۰۰۰هتد ئەنجام ڕۆژێك توشی یەكێكی لەخۆی بەهێزتردەبێ تۆڵەی هەمووكەسێكی لێ دەكاتەوە۰

تاوان لەڕووی یاساییەوە ، بریتییەلەوهەڵسوكەوتەی كەیاساڕێگەی پێنادات وسزای ئەوكەسە دەدرێت كەپێی هەڵدەستێت،بەپێی جۆری تاوانەكەوقەبارەی زیانەكەئەوەی كەنوسراوێكی یاسایی ئاماژەی پێد ەكات ۰(ئیبن جوزی بەغدادی) ، دەڵێ : بیرم كردەوەلەهۆكاری چوو نە نێودۆزەخ ، ئەوەم بۆدەركەوت ، كە هەمووی بەهۆی گوناه وتاوا نەوەیە ، سەرنجم دایەتاوانەكانیش بۆم ڕوون بۆوە كەلەبەرئەنجامی خواستنی چێژولەزەتەوەیە)۰ڕیشەی تاوان چوارن :-

١ – پلەوپایە ٢ – ژن ٣ – زەوی ٤ – پارەوپوول۰

(گۆنسۆن) وتوویەتی : (عەیب وەكوئاژەڵە قەلەودەبێ تاكوكاتی سەر بڕینی دێ) واتا ئاژەڵ تاقەلەوبێ بۆسەربڕین باشترە ، كوردیش وتوویەتی : (هەمووشتێك لەباریكی دەپچڕێ ، بەلاَم زوڵم لەئەستووری) تاوانباریش تاڕۆبچێ لەتاوان خوای تەعالا زیاترعەزابی دەدات۰ ئەگەرسەیربكەین خوای گەورەلەقورئانی پیرۆزدادووجۆرە گوناه باس دەكات : (ذنوب) لەگەڵ (سيئات) ذنوب ئەوگوناهەیەلەنێوان خۆت وخودایە ئەگەریەكێك لەڕەمەزاندا بەبێ (عوزر) ڕۆژووەكەی بشكێنێ یان توانای حەجی هەبێ نەیكات ئەوەزەنبێكی كردووە هەڵەیەكی كردووە بەرامبەرخوای خۆی كاریگەری بۆخەڵك نییە ، هەرچی (سيئات)ە ئەوگوناهەیەلەنێوان مرۆڤ ودەوروبەرەكەیدایە ، وەكودەڵێن : (حق الله)هەیەو(حق الناس)هەیە۰(فرانسیس تی ماك ئەندرۆ) پێیوایەئاووهەواكاریگەری زۆری لەسەرڕەفتاری تاك هەیە بۆنموونەپێیوایەپلەی گەرماكاردەكاتەسەرزیادبوونی ئارەزووی توندوتیژی وتاوانكاری۰

ئاشكرابوونی نهێنی :

ئاشكرابوونی تاوان بەڕێكەوت نییە ، بەڵكونەخشەوبەرنامەی خوایەڕووداوی ئەم چیرۆكەلەبەرگی یەكەمی كتێبی (جیهانێك لەتاوان)داهاتووە ، باس لەپاسەوانی گۆڕستانێك دەكات كەبێ ویژدانانە هەرچی كچێك بمرێت كاری داوێنپیسی لەگەڵدادەكات۰بێگومان هەموونهێنییەك چەندقوول بێت ڕۆژی خۆی دێت ئاشكرادەبێت۰ڕۆژێك ژن ومێردێك خاوەنی دوومنداڵن ، ژنەكەبەنەخۆشییەكی كت وپڕدڵی لەلێدان دەكەوێت وگیان لەدەست دەدات دەیبەن بۆگۆڕستان وپاش ناشتنی تەرمەكەی وەكودەڵێن هەموونهێنییەك خوا(جل جلا لە)هەڵیدەماڵێ وئاشكرای دەكات ، ئەوڕۆژە بۆدەرخستنی نهێنییەكەپیاوەكەكۆمەڵێك كلیل ومۆبایلی پێیە لەپاش ئەوەی خەڵكەكەوردەوردەچۆڵی دەكات كاتی ڕۆیشتنی ئەویش ئەوشتانەی لەبیردەچێ دەڕۆنەوەماڵەوە ، لەوكاتەداسەرقاڵی گفتوگۆو وتووێژكردنەبیری دەكەوێتەوەكلیل ومۆبایلەكەی لەبیرچووە لەوێ لێی كەوتووە لەسەرگۆڕی خێزانەكەی لەگەڵ یەكێك لەهاوڕێكانی دەچێت بۆگۆڕستان بۆگەڕانەوەی شتەكانی ، كاتێك دەگەنەگۆڕستان زۆرلەدەرگای پاسەوانەكەدەدات پاسەوانەكەدەرگاكەدەكاتەوە ئەوانیش دەڵێن هەندێك شتمان لەبیرچووە هاتوین بیبەینەوە ، پاسەوانەكەدەڵێ ئەوەوەختەئێوەهاتوونە بڕۆن سبەی

وەرنەوە ناتوانم ئێستابتانکەمەژوورەوە،کابراش وەك دڵی خەبەری دابێت بەسەردیوارەکەسەردەکەوێت وەدەچێتەناوگۆڕستانەکەزۆربەهێواشی دەڕوات دەبینێ واپاسەوان زینالەگەڵ تەرمەکەدەکات کەئەمەدەبینێ زۆربەخێرایی ئاسایشی لێ ئاگاداردەکاتەوە کابرای پاسەوان دەستگیرکراودانی بەتاوانەکەی داناوگوتویەتی ماوەی بیست ساڵەئەوکارەدەکەم هەرکچێك دەمرێت زینای لەگەڵ دەکەم وەدەیخەمەوەناوقەبرەکەی!!!

نموونەیەکی تر :

(س)و(ش)دووهاوسەربوون (س)ئەوپیاوەلەگەڵ ماڵی دایکی دەژیادوای ئەوەی کە(س)و(ش)بڕیاردەدەن کەلەوکۆڵان وگەڕەکەنەمێنن پرس وڕابەپورە(س)دایکی پیاوەکەدەکەن دەڵێن : ئەم خانووە زۆرگەورەیەوکۆنەبابیفرۆشین وخانوێکی تازەی لێ دروست بکەین پاشماوەی پارەکەش ئۆتۆمبیلێکی باشی پێدەکڕین ، دوای ئەوەی کەوەڵامی پورە(س)بەنەخێرونەفرۆشتن دەبێت (س)وژنەکەی بڕیاری کوشتنی پورە(س)دەدەن ونەخشەی کوشتنەکەی بەم جۆرە دادەڕێژن : دوای کوشتنی پورە(س)بەدەمانچەیەکی بێدەنگ بڕیاردەدەن کەواجەستەکەشی بسوتێنن بۆئەوەی سەرلەلێکۆڵەرەوەکان بشێوێنن ، لەدوای ئەوەی بەدەمانچەیەکی بێدەنگ پورە(س)دەکوژن ئاگرلەجەستەی بەردەدەن وەدەیکەن بەخەڵووز ، دوای بەخەڵووزبوونی ئاودەکەن بەشوێنەکەیداودەیکەنەهاوارهاواروخەڵکی بەخەبەردێنن بۆبەهاناوەچوونیان بەمەبەستی کوژاندنەوەی ئاگرەکە ، دوای گەیاندنی جەستەی پورە (س)بۆپزیشکی دادوەری لێکۆڵینەوەی وردەکرێت دەردەکەوێت شوێنەواری بەجێماوی گوللەیەك لەبڕبڕەی پشتی دایە ، بۆیەکاتێك هەردووتاوانبار(س)و(ش)بۆلێکۆڵینەوەبانگدەکرێن هەردووتاوانباردانیان بەتاوانەکەناوخرانەزیندانەوە٠

## سوودی سزاوتۆڵەسەندن :

- پاراستنی ژیانی خەڵکی ، چونکە ئەگەرکەسێك بزانی یەکێکی کوشت دەکوژرێتەوە ناوێرێ وەك کەسێك موتتەقییە لەبەرئەوەی دەزانی جەهەننەم هەیە ناوێرێ گوناه بکات ، هەروەکوخوای گەورە فەرموویەتی : (ولكم في القصاص حيوة يأولى الالباب)البقرة : ١٧٩ واتا : لەتۆڵەداژیان هەیە٠

- لەتۆڵەکردنەوە خاوەن کوژراوەکەشیفای بۆدێت،چونکە ئەوئازارەی لەناودڵی دروستبووە نامینێ وخەم وخەفەت وتوڕ ەییەکەی هێوردە بێتەوە٠ لەتوێژینەوەیەکدا کەقوتابی ماستەر(نادیەوەلی جەبار)بەناونیشانی (کاریگەری پڕۆسەی بەمەدەنیبوون لەسەردانیشتوانی شاری هەولێر) ئەنجامیداوە ، پیاوێك دەڵێت : تۆڵەسەندنەوەدەکەوێتەسەردەرەجەی ئەوزوڵمەی کەلێت دەکرێت٠ئافرەتێك دەڵێ : بڕوام بەتۆڵەسەندنەوەنییەتەنیامەحکەمە٠پیاوێکی تردەڵێ : ئەگەرکەسێك مامێکم یان برایکم بکوژێت هەردەیکوژمەوە ئەگەرکوشتنەکەبەغەدربێ٠ئافرەتێك دەڵێ : بەتەئکیدتۆڵەدەستێنم بەس ئەگەرنەمتوانی بەخوای دەسپێرم٠ئافرەتێکی تردەڵێ : بیدەیەدەست خوای گەورە٠بێگومان ئەگەرعەدالەت هەبێ

تۆڵەسەندنەوەباش نییە ، چونکەلەدووی دێت جاری وایەدوژمنداری نێوان چەندبنەماڵەیەك بۆچەندپشتێك ڕۆیشتووە وپێنج شەش خێزان لێی تێکدەچێ.

**لەبارەی پەنجەمۆر :**

لەکۆندابۆدۆزینەوەی تاوانبار(شوون هەڵگر) هەبوو ،واتاچوونەدوای جێ شوێنی پێ یان دەست کەشوێنی لەدوای خۆی بەجێبێلێ لەسەر زەوی یان لەچواردەوری خۆی ، لەسەرەتادالەکاتی (ڕاو) بۆدۆزینەوەی ئاژەڵی کێوی بەکارهاتووە ، شوونهەلگری کارێکی وردوبەسەلیقەوزانا یی بوو ، لەسەردەمەکۆنەکاندافەیلەسوفی یۆنانی (ئەرستۆ) لێدانی دڵی کردبووە بەلگە بۆلێکۆڵینەوەوئاشکراکردنی تاوانباران ، ئەمەش لەوەوەهاتبووکەتێبینیان کردبووکاتێ کەسێك تاوانێك ئەنجام دەدات لێدانی دڵی خێراتردەبێت ولەباری ئاسایی خۆی دا نابێت،لەسەدەی حەوتەمی میلادی لە(چین) یاسایەك بەناوی(یونگ هوای)دەرچوو ، کەفەرمانی دەدابەدانیشتوانی چین لەوانەی نەخوێندەوارن،لەلای خوارەوەی (بۆندی لێکجیابوونەوە- تەلاق) پەنجەمۆربکەن ، لەسا ڵی(١٨٨٦)لەئینگلتەرا (فرەنسیس گاڵتۆن)بیرۆکەی پەنجەمۆری لە چینییەکان وەرگرت ، لەساڵی(١٩٠٠) "ڕیتشاردهنری" بەردەوام بوولەسەرلێکۆڵینەوەکانی گاڵتۆن وزۆرگۆڕانکاری بەسەرداهێنا ، کە دواتربووبەبنەمای پەیڕەوکراوبۆناسینەوەی پەنجەمۆر، ئینجالەلایەن توێژەری ئیتاڵی (ماڵپێچی)لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم توێژینەوەیە کی ترکرالەسەرپەنجەمۆر، ئەم زانایەزانستیانەلەشوێنەواری پەنجەو هێل ولۆچەکانی دەستی کۆڵییەوە. یەکەم کەسیش کەپەیڕەوی پە نجەمۆری کرد(سێرولیام هەرشل) بووبەحاکمی سیاسی هەرێمی (بەنگال)ی هیندستان لەسەردەمی داگیرکاری بەریتانیا بۆئەم وڵاتە. لەناسینەوەوبەدواداچوونی تاوانی دزی وکەتنی ترشوێنی پێ زۆرگرینگ بووبۆناسینەوەودۆزینەوەی تاوانبار، بەتێڕامانی وردلەشوێنی پێیەکان دەیانزانی کابراقەڵەوەیان لاوازە،یان جۆری پێیەکەی گەورەیە یان بچووکە ، پێلاوی لەپێ بووەیان نا؟ ئایابەڕاستەڕێ داڕۆیشتووە یان بەناوهەرەت ولاڕێ دا؟ ئایاکەسەکەبەتەنهابووە یان چەندکەسانێك؟ ئایاولاغی پێبووە یان نا؟ لەپاشماوەی ولاغەکانیش دەیانزانی ولاغەکە ئێستریان ئەسپ یان گوێدرێژە؟ (مام برایم حەسەن شێروانی)لەساڵی(٢٠٠٤)داگێڕاویەتییەوە ، دەڵێ : لەسا ڵی(١٩٥٦) لەگوندی(بەحرکە) دووئێستردزرابوون،بەڕێوەبەری پۆلیس داوای لە(عەلی عەبدولاَ- عەلی شونهەڵگر)کردتالەگەڵ پۆلیسەکان بچن بۆدۆزینەوەی دزەکان ، بەپارچەڕاستەیەك کەلای بووپێوانەی جێسمی ئێسترەکانی گرت، بەناوئەوئاقارەدا تاسەرئاوی زێی بادینان، لەگوندی (ئیفراز) لەوێ دوای گەڕانێکی زۆرگوتی : ئێسترەکان پەڕیونەتەوەلە ڕووبارەکە،ئیترپەڕینەوەلەودیوهەربەدەوڕووبارەکە ئێسترەکانیان بەناوداروزەلی ڕۆخ ڕووبارەکە گێڕابوو، ئینجا دیسان لەڕووبارەکە پەڕاندبوویانەوە دووبارەبۆبەری (ئیفراز) ، ئینجالەو بەرەش جێشوونەکەمان

هەڵگرت ورۆیشتین تاچووینه گوندی(          ) ئێسترەكانیان لای(          ) ی گوندی (          ) ئاشكرابوو ، ئێسترەكانیان هێنایەوە٠ (عەلی شونهەلگرلەدایكبووی ساڵی (١٩٠٢)ی گوندی گردیشە٠

جۆرەكانی هەڵەلەیاسای تاوانكاری :

یەكەم : بریتییەلەوهەڵەیەی‌كەتاوانبارهەرگیزلەبیرومێشكیدانەبووەكەئەم جۆرەئەنجامەی لێبكەوێتەوە٠

دووەم : بریتییەلەوهەڵەیەی كەتاوانباردەیتوانی پێشبینی ڕوودانی بكات لەگەڵ ئەمەشدابەردەوام دەبێت لەئەنجامدانی ، بۆنموونە : شوفێرێك ئۆتۆمبیلەكەی بەخێرایییەكی زۆرلێدەخوڕێ لەكۆڵان یان ڕێگایەكی قەلەبالەغ ، كاتێك لەكەسێك دەدات ودەیكوژێ ئەم شوفێرە ئەم زانیارییەی هەبووكەبۆی هەیەببێتەڕوودانی ئەم كارەساتە ، بەڵام بەردەوام بوولەخێراهاژووشتنی ، یاخود كەمتەرخەمی وەك ئەوەی ئامێرێكی تیژلەبەردەست وپێیان دادەنێت بێئەوەی لەشوێنی مەبەستی خۆی هەڵگرێ كەبۆی هەیەببێتەهۆی بریندار‌بوونی كەسێك یان ئازاردانی٠

## بەشی حەوتەم

### لەبارەی بەکارهێنانی لای ڕاست :

لەزمانی کوردیدادەربڕینی قسەی بەجێ بەوشەی ڕاست گوزارشتی لێ دەکرێ ، وەك : ڕاستگۆ، ڕاستەقینە ، ۰۰۰هتد۰عائیشە(خوای لێ ڕازی بێ)،وتوویەتی:(پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)هەمووکات بەکارهێنانی لای ڕاستی لاپەسندبوو ، لە لە پێکردنی دا،لەقژداهێنانی دا ، لەخۆخاوێنکردنەوەولەهەمووکارە کانی دا) بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە۰وشەی لەهەموو(کلە)گشتییە ، بەلاّم چوونەسەرئاوودەرچوون لەمز گەوت وهاوشێوەی ئەوانەی لێ دەردەکرێ،چونکەئەوانە بەلای چەپ ئەنجام دەدرێ۰پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ)کاتێ( شیر)ی دەخواردەوە ، ئیمامی ئەبوبەکرلای چەپیەوەبووعەرەبێکی دەشتەکیش لای ڕا ستییەوەبوو ، ئیمامی عومەریش لەلایەکی دیکەبوو ، ئیمامی عومەر(خوای لێ ڕازی بێ) وتی: بیدەبە ئەبوبەکر، بەلاّم پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)لەپێشدا دای بەعەرەبە دەشتەکییەکەوفەر مووی:(الایمن فاالایمن)بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە۰

### لەبارەی حیکمەت :

ئیبن خەلدوون لە(مقدمە) ، دەڵێ : (ئەبیکرات کەبەباوکی پزیشکی ناسراوە قوتابی(لوقمانی حەکیم) بووە،هەروەها(ئیبن خەلدوون) وای ڕیزکردووە : ئەڕستۆقوتابی ئەفلاّتوون بووە ، ئەفلاّتوون قوتابی سو قرات بووە،سوکرات قوتابی فیساگۆڕس بووە ، فیساگۆڕس قوتابی تا لیس بووە ، تالیسیش فەلسەفەکەی لە (لوقمانی حەکیم) وەرگرتووە هەروەهالەقورئانی پیرۆزسورەتێك بەناوی لوقمان هەیە ، کەمەبەست لوقمانی حەکیمە۰هەروەها(ئیبن قوتەیبە)پێی وایە هەندێ فەیلەسوفی پێش ئەڕستۆگەشتیان بۆولاّتی شام کردووە پاشماوەی ئاینی لوقمانی حەکیمیان وەرگرتووە۰لەبارەی بیروباوەڕی سوقراتەوە ویل دیورانت دەڵێ : (سوقرات بڕوای هەبووبەیەك خوا ، بڕوای هەبووبەوەی کەمەرگ بەتەواوی لەناوی نابات ، ڕوحی دوای مردن بەنەمروهەمیشەیی دەمێنێتەوە)۰(ولقداتینالقمان الحکمة)لقمان: ١٢ لوقمانی حەکیم کێیە؟

ئیبن عەبباس(خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێت : (لوقمان بەندەیەکی حەبە شی بووە ، ئەنەسی کوڕی مالیك(خوای لێ ڕازی بێ)دەڵێ: لوقمان لای داودپێخەمبەر زرێ(قەلغان-دەرع)ی دروستدەکرد۰ نەشزانراوەباوکی ناوی چییە؟یاخودکوڕەکەی ناوی چی بووە؟

هەندێك لەئامۆژگارییەکانی لوقمانی حەکیم:

١-ئەی کوڕی شیرینم ئەوەندە کاربۆدنیابکەتیایدا دەمێنیتەوە ، ئەوە ندەش کاربۆقیامەت بکە تیایدادەمێنیتەوە۰

٢-وتراوەئەوکەسەگەورەی کە (لوقمانی حەکیم) کاری دەکردلای ، ڕۆ ژێکیان بەلوقمانی گوت : بڕۆبەرخێکم بۆسەرببڕەلەپاکترین وچاکتر ینم بۆبێنە،ئەویش زمان ودڵی بۆهێنا،ڕۆژێکی ترپێی وت : بڕۆبەر خێکم بۆسەربیڕە ودووپارچەم لەپیسترین وخرا پترین لەشی بۆفڕێ بدە ئەویش زمان ودڵی فڕێدا،گەورەکەی سەری سوڕمالێی ، لوقمانی حەکیم پێی وت : هیچ نییە پاکتر وچاکتربێت لەزمان ودڵ ، ئەگەر پاکبوون وچاك بەکارهێنران هیچ شتێکیش نییە پیستروخراپتربێت لەزمان ودڵ ئەگەر خراپبوون وخراپ بەکارهێنران٠

٣-ئەی کوڕی شیرینم حیکمەت هەژارەکان دەباتە کۆڕی پاشاکان ودا یدەنیشێنێت٠

ئەم وشەیە(دانایی)بەچەندین واتادێت:

١-بەواتای دانانی شتەکان لەشوێنی گونجاوی خۆیان٠ (ئیمامی غەزالی دەڵێ : خوای گەورە ئەندامی جۆراوجۆری بەجەستە ی مرۆڤ بە خشیوە : دەست وپێ وچاوولووت وگوێ  هتد ، کاتێك ئەندامەکانی ڕێکخستووە لەشوێنی خۆی دایناوە ، بۆ نمونە :  لکاندنی دوودەستی مرۆڤ بەشانەوە گەربەسەرەوە یان بەقورگەوە یان بەئەژنۆوەلکاندبا چ ناتەواوی وناشیرینیە ك دەهاتەئاراوە ؟ هەمووئەندامەکانی جە ستەی لەشوێنی خۆ ی داناوە ، کەباشترین وشیاوترین شوێنەبۆمرۆڤ ، وەك چۆن لەناوەڕاستی ڕوخساردانراوە ، ئەگەرلەنێوچاوان یان شو ێنێکی تردانرابا ، ئەواچ ناتەواوی و زیانەك دەبوو ؟)

٢-خوای گەورە فەرموویەتی:(ادع الى سبيل ربك باالحكمة والموعظة الحسنة)النحل: ١٢٥ئەوە مەشورە لەمێژووی ئیسلامدا گەنجێك هاتە لای پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ، وتی: ئەی پێخەمبەری خوا من نوێژ دەکەم ، زەکات دەدەم ، بەلأم حەزدەکەم زینابکەم ، ئیتربووبە مقۆمقۆلەمزگەوت خەریك بوو لێی بدەن پێخەمبەر(درودی خوا ی لەسەربێ) فەرمووی : وازی لێبێنن ، بانگی گەنجەکەی کردوئە ویش نزیکبۆوەلێی وپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەهێوا شی قسەی لەگەڵ کردوفەرمووی : حەزدەکەی دایکت زینابکات؟

گەنجەکە وتی : نەخێر

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرمووی: خەڵکیش حەزناکە ن دایکیان زینابکات٠

ئەی حەزدەکەی خوشکت زینابکات؟

گەنجەکەوتی : نەخێر

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرمووی: خەڵکیش حەزناکە ن خوشکیان زینابکات٠

ئایاحەزدەکەی پورت زینابکات؟

گەنجەکەوتی: نەخێر

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرمووی: خەڵکیش حەزناکە ن پوریان زینا بکات واتاکەتۆزینادەکەی لەگەڵ ئافرەتێك ئەوئافر ەتە یان ژنی یەکێکە،یان کچی کەسێکە ، یان خوشکی کەسێکە ،

ئەوانیش حەزناکەن،هەروەکوتۆحەزناکەی گەنجەکە هاتەوەهۆش خۆی وئەوشتە لەدڵی چووە دەرێ٠
پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(الحكمة ضالة المؤمن انى وجدهاحق الناس بها) واتا:(حیکمەت ونبووی ئیما نداره ، لەهەرچ جێگایەك بیدۆزێتەوە لەهەمووخەڵك زیاترمافی ئەوی پێوەیە)٠

**چەند نموونەیەك :**

١ - ژنێك بەسوکرات دەڵێ : دەزانی زۆرڕەزاقەرس وناشیرینی ؟ سوکرات دەڵێ : ئەگەرتۆئاوێنەیەکی پاکوبێگەردوبێخەوش بوای ، ئەواباوەڕم پێدەکردی ، بەلاّم تۆجۆرە ڕەنگدانەوەیە کی کەناتوانی حوسن وجەمالی من وەك خۆی نیشان بدەی،هەربۆیەمن گلەییت لێناکەم٠

٢-سوکرات ژنێك دەبینێ کەوابەدرەختێکەوە خۆی لەملەوە هەڵو اسیوە ، واتاخۆی خنکاندووە ئەویش لەڕێگای پەتێکەوە ، کاتێ ئەم دیمەنەدەبینێ دەڵێ : خۆزگەهەموودرەختێك بیتوانیبایە بەری ئاوابگرێت٠

٣-کەسێك ژنێك دەبینێ بەجل وبەرگێکی قەشەنگ وجوانەوە لەمەیدانی شاردێت ودەچێت،پێی دەڵێ : هێی ژنێ تۆبۆئەوە نەهاتوویتە ئێرەسەیری شتان بکەیت ، بەڵکوهاتویت تاسەیر بکرێیت٠

٤-ئەفلاّتوون گوتوویەتی: بەدووشت جاهیل دەست نیشان دەکرێت :

یەکەم : کاتێك کەسێ زۆربڵێ بێت لەقسەگەڵێ کەهیچ سوودێ نابەخشیتەوە٠

دووەم : کاتێ لەبارەی شتێکەوەپرسیاری دەدوێت ، کەئەسڵەن لەوبابەتەپرسیاری لێنەکراوە٠

٥ - لەفەیلەسوفێکیان پرسی : بەهێزترین کەس کێیە؟ فەیلەسووفەکەوتی: ئەوپیاوەی کەدەتوانێت چاوەکانی بنوقێنێت لەبەرامبەرجوانترین کچانی هیندستان٠

٦-پیاوێك کەسێك دەبینێت بەئاشکراشت دەبەخشیتەوە بەبێنە وایان ، پیاوەکەپێی وت : ئەگەردەتەوێت گەنجینەیەك بۆخۆت کۆبکەیتەوە ، بەئاشکرائەم کارە مەکە،چونکە خەڵك شوێنی گەنجینەکەت پێدەزانن ، پاشان لێت دەدزن٠

٧-کابرایەك ڕێگەی دەکەوێتەنێوکۆمەڵێك سەرخۆش ، ئەوانیش بەهەمووان دەیگرن ولێی دەدەن ، پاشان قوتاری دەبێت ، دەدەچێتەوەماڵ وژنەکەی دەڵێ : باشەبۆجنێوبارانت نەکرد ؟ئەویش دەڵێ : دەمتوانی ، بەلاّم ئەوان سەرخۆش بوون ئاگایان لەهیچ نەبوو ، منیش ترسام کەجنێووقسەکانم بەهەدەربچێت٠

**لەبارەی عەقل وجۆرەکانی :**

عەقل بریتییە لەتوانای مرۆڤ لەنێوان زانین ونەزانینندا ، ژیانی مرۆ ڤیش دەرەنجامی بیرکردنەوەکانیەتی واتا بیرکردنەوەکانی مرۆڤ بڕیا رلەسەرجۆری ژیان دەدەن٠عەقل هێزێکی گەورەیەهەمووشتێکیش لەسەرەتادالەبیردروست دەکرێت٠لەپێش ئەوەی خانوێك دروست بکەی لەبیرتادروستی دەکەی ، پاشان

بیرەکەدەخەیتەسەرکاغەز،واتانەخشەی خانووەکەدەکێشیت ، ئینجاوەستابانگدەکەی لەسەرئەونەخشەیەخانوەکەت بۆدروست دەکات٠هەروەهاهەرئاواتێکیشت هەبێ دەبێ لەسەرەتادابیری لێ بکەیتەوە نەخشەی سەرکەوتنی بۆدروست بکەی واتابیرلەپێکهێنانی بکەیتەوە ، بیرلەسەرکەوتنی کارەکەبکەیتەوە،ئینجالەخوداداوابکەی بۆپێکهێنانی ئەوئاواتەوسەرکەوتنی کارەکەت ڕێگات پیشان بدات ویارمەتیت بدات٠ناصری سوبحانی لەکتێبەکەیدا : (وانەکانی خواناسی) دەڵێ : ((وشەی عەقل لەزماندابەمانای بەستنەوەیە ، وەك حەیوانێك دەیبەستنەوە بۆئەوەی نەچێتەناوکشتوکاڵ وزیانی لێنەدات ، ئینسانیش بۆنموونە ئەوەسوودبەخشەئەوەزیانبەخشە بەگوێرەی ئەوەخۆی کۆنترۆڵ دەکات ، لەوزەمینەیەی کەسوودبەخشە خۆی دەبەستێتەوە ئەوەی کەزیانبەخشەخۆی لێ دووردەگرێ))٠

(الکسیس کارل) دەڵێت : ((ئەقل وەك لایتی ئۆتۆمبیل وایە کەڕێگەڕۆشن دەکاتەوە))٠سەیارەیەك بێ لایت مەترسیدارە کارەسات ومەرگ بەدوای خۆی دەهێنێت٠

**عاقل کێیە ؟**

بۆوەلامی ئەوپرسیارە پێویستە وەلا مێکی ڕاست بدەینەوە، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (عاقل ئە وکەسەیە بڕوای بەخواهەبێت وبڕوای بەپێخەمبەرەکەی هەبێت وبەگوێڕایەلی ئەوەوەکاری کردبێت)٠ عەقلی مرۆڤیش لەکا تێکەوەبۆکاتێکی تردەگۆڕێت ، بۆنموونە عەقل بەگۆڕانی تەمەن دەگۆڕێت ، بەجیاوازی ئەوزانیارییانەش کەهەیەتی٠

**واتای زمان وزاراوەیی وشەی عەقل :**

وشەی عەقل لەڕووی زمانەوە بەمانای ڕێگەگرتن یان بەندکردن دێت هەروەك بەبەندکراودەوترێت(معتقل)،هەروەهابەواتای زانین وبیرکردنەوەوتێگەیشتن دێت ، وشەی(لب)یش بەواتای عەقل دێت ( الالباب)یش کۆی وشەی(لب)ە واتاناخی شتەکان یان جەوهەری شتەکان،وشەی(اولوالالباب)یش کەلەقورئانی پیرۆزداهاتووە واتا: خاوەن عەقلەکان٠

**جۆرەکانی عەقل :**

یەکەم : عەقلی ئەفسانەیی وخوڕافی٠

واتابڕوابوون بەشتێك کەهیچ کاریگەری لە ژیان نییە٠

دووەم: عەقلی چاولێکەری

سێیەم: عەقلی جامدووشك ئامادەنییە شت لەکەس فێرببێ وقسەلەکەس وەرگرێ٠

**لەبارەی خوێندنەوە :**

ئاشکرایە هەمووکەسێك لەسەرئەم زەوییە،بەبێ جیاوازی ئاین وڕەگەزوقەوم وڕەنگیانەوە دەزانن کەخوێندنەوە گرینگە،کەس نییەنکۆڵی لەمەبکات،سێیەم سەرۆکی ئەمریکا،جیفرسۆن (١٧٤٣ — ١٨٢٨)

وتوویەتی:(خوێندنەوە هۆکاری نەهێشتنی نەفامییە)،هەروەها مێژوونووسی بەریتانی ئارنۆلد توینبی (١٨٨٩ – ١٩٧٥) وتوویەتی : (بەرزبوونەوەی ڕێژەی خوێنەرانی وشە چاپکراوەکان ، بنەمایەکی شارستانییە بۆپۆلێنکردنی ولاَتانی جیهان بۆ ولاَتی دواکەوتوو پێشکەوتوو) وەخوێندنەوە تەنیا خولیانییە ، بەلْکو پێویستیشە ، هەندێك کەس لەساڵێك دا کتێبێك دەخوێنێتەوە هەندێکیش مانگی دەیان کتێب دەخوێننەوە ، هەندێکیش کتێب دەکرن ، بەلاَم نایخو ێننەوە؟ هەروەها دەبێ ئەوەبخوێنینەوە کەئا رەزووی لێدەکەین و چێژمان پێدەبەخشێت،چونکە چێژوەرگرتن پالْنەرە بۆئەوەی بەر دەوام بی لەسەرخوێندنەوە ، کتێبیش بەگەورەیی نییە٠کتێبخانەی گشتی سلێمانی لەژمارە (١١)ی گۆڤاری ڕۆژی نوێ سالْی (١٩٦١) بلاَویکردۆتەوە : (ئێستاخوێندەواران زۆرهاتوچۆی کتێبخانەدەکەن وهیچ مانگێك نییەپترلە (٢٠٠٠)دووهەزارکتێب نەخوێندرێتەوە٠لەماوەی سالْی (١٩٦٠)دا زیاترلە (١٨٠٠٠)هەژدەهەزارخوێندەوارهاتوچۆی کتێبخانەیان کردووە (٧٣١٤)کتێب لەناوەوەی کتێبخانەخوێندراوەتەوەو(٧٤١٥)کتێب براوەبۆدەرەوە٠(ئەوژمارەیەبۆئەوکات یەکجارزۆربووە ، چونکەژمارەی مرۆڤ ئەوکات ئەوەندەزۆرنەبووە٠بەپێی سەرژمێری سالْی ١٩٥٧ ژمارەی دانیشتوانی عیراق شەش ملیۆن ونیوکەس بووە)٠ئاشکرایەکەپێشترئینتەرنیت ومۆبایل نەبووە ، زۆربەی گەنجان خۆیان بەخوێندنەوەی کتێب وگۆڤارورۆژنامەخەریك دەکرد٠بەلاَم زۆرتەماشاکردنی تەلەفزیۆن خەلْك لەخوێندنەوە دووردەخاتەوە ، لەکۆنداچونکەتەلەفزیۆن کەمتربووخوێندنەوەی کتێب زۆربوو ، بەلاَم ئێستاش ئەوەی خولیای خوێندنەوەی هەبێ ، خوێندنەوەی خۆی دەکات ، ژنان بەڕێژەیەکی زیاترتەماشای تەلەفزیۆن دەکەن ، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوەبۆئەوەی کەزیاترلەمالْەوەن ودەرفەتی تەماشاکردنیان زیاترە٠شاعیردەلْێ :

من کان صدیق القلم

لبث اسمه بالکرم

واتا : هەرکەسێ دۆستی قەلەم بێ

بەردەوام ناوی بەرێزەوەدەمینێ

مەرج نییەمرۆڤ حیسابی کاتژمێربۆخوێندنەوەبکات ، بەلْکوهەردەرفەتێکی بۆڕەخسادەست بداتەکتێب وبیخوێنێتەوە وخۆی بەخوێندنەوەخەریك بکات باشترەلەفەیسبووك وئینتەرنێت،بەرلەنووستنیش زیکرەکان بخوێنێ٠

سوودەکانی خوێندنەوە :

١ – فێری وشەی نوێ ونامۆدەبی٠

٢ – زمانت پاراودەکات ولەقسەکردن پەکت ناکەوێ٠

٣ – هەلْەی زمانەوانی ونووسینت کەمدەکاتەوە٠

٤ – غەم وپەژارەلادەبات کاتێك هەست دەکەی بابەت ورِستەی وای تیایەدڵخۆشت دەکات یان بەسوودەیان سەرسورِهێنەرە و سەرنج رِا کێشە٠

٥ – خوێنەربەرەوئەوەدەبات بتوانێت ببێتەنووسەرودانەری کتێب٠

٦ – ئەگەرکۆمەڵێك کتێبی هەمان بواربخوێنینەوە بەرەوپسپۆرِی ئەوبوارەدەچین ، ئەگەریش کۆمەڵێك کتێبی بواری جیاجیابخوێنینەوەئاستی رِۆشەنبیریمان زیاتردەبێت٠

٧– خوێندنەوە والەخوێنەردەکات پێشکەوتنی بیرو کردار وگوفتاری پێوەدیاربێت٠

٨ – پاڵەپەستۆی ژیان ونائارامی دەروون کەم دەکاتەوە٠

جۆرەکانی کتێب :

یەکەم – کتێبەئاسانەکان :

ئەوکتێبانەی کەبەزمانێکی سادەوئاسان نوسراون خوێندەوارونیمچەخوێندەوارتێیان دەگات٠

دووەم – کتێبەقورس وئاڵۆزەکان :

ئەوکتێبانەی کەبەزمانێکی قورس وئاڵۆزنوسراون نوخبەك تێیان دەگات وەکوکتێبی فەلسەفی وهزری و٠٠٠هتد٠

## چۆن کتێب دەنوسین ؟

گۆڤاری پەروەردەوزانست لەژمارە (١٨)ی ساڵی (١٩٨١) بلاّویکردۆتەوە : (لێژنەیەك لەسەدپیاوی زاناوداناوبەهرەمەند دروستکرا بۆپشکنینی دیوانی شیعری ونوسراوی پیاوانی ناودار ، تەماشایانکردلەهەموودیوانی (متنبی)دا ، تەنیاپێنج شیعری تیایە کەزادەی بیری خۆی بێ (شاعیرهۆنراوەی زۆرلەبەرە ، ئەوهۆنراوانە کارلێك دەکەن) ولەپێش ئەودانەوترابێ ، لەسەدنوسراوی (جاحظ) یەك قسەی دۆزرایەوەکەزادەی بیری خۆی بێ ، هەمووهەروتنەوەی قسەی ئەم وئەوە لەهەزارکتێب قسەیەك نییە کەنەکرابێ٠بۆنموونە حاجی قادری کۆیی کاتێك لەگەڵ حاجی مەلاعەبدولاّجەلی زادەی باوکی مەلای گەورەی کۆیەبۆتەواوکردنی خوێندن گەلێك شوێن وناوچەگەرِاون لەوانەش بۆناوچەی باڵەکایەتی وکوردستانی ئێران چووینە ، حاجی کاتێك لەئەستەمبۆڵ دەبێت غەریبی هەڵدەستێت ونامەیەکی شیعری بۆ(حاجی مەلاعەبدولاّ) دەنێرێ لەنامەکەیدایادی ئەورِۆژانەی ئەوگەشتەی بەبیرحاجی مەلاعەبدولاّ دێنێتەوە کەلەسەردەمی فەقێیەتی ئەنجامیاندابووبۆئەمەش ئەویادگارییەلەودێرەدادەخاتەوەیادحاجی مەلاعەبدولاّ ، تیایدا دەڵێ :

بەفیکرت دێ زەمانێ کەچووینەباڵەك

بەپێ خاوسی نەکەوشم بوو نەکاڵەك

ئەم وێنەیەدەبێتەسەرچاوەوکەرەسەی شیعری بۆ(میهری)ی شاعیرمیهریش بەسودوەرگرتن لەو وشەوڕستانە وێنەیەکی نزیك لەوبیرۆکەیەی داڕشتووە کاتێك مامۆستادەبێ لە(قەرەداغ) بیری یادگارییەکانی ڕۆژگاری دەکات کاتێك لەگەڵ (مەلاڕەشید)ی هاوڕێی بردوویانەتەسەر ، ئەمەش بووەبەهۆی ئەوەی کەبەهەمان شێوەی حاجی قادری کۆیی نامەیەکی شیعری بۆمەلاڕەشیدی هاوڕێی بنێرێت وتیایدا یادی ڕۆژانی زووی دێنێتەوەیادودەڵێ :

بەفیکرت دێ لەمزگەوت دائەنیشتین لەسەربان

چەندحیکایەتی خۆش خۆش دەستت دەکردبەگێڕان

بێخود(١٨٧٥ – ١٩٥٥) لەچوارینێکدا دەڵێ :

لەوڕۆژەوەڕۆیشتووەتۆراوەدڵی من

هەرچەندئەگەڕێم بێسەروشوێن ماوەدڵی من

ئاخۆ بەچ شاخێکەوە گیرساوە دڵی من

یاخۆبەچ داخێکەوە سوتاوە دڵی من

(میهری)ش لەسەرهەمان بیر دەڵێ :

لەوڕۆژەوەڕۆیشتووە تالأنەدڵی من

پڕدەردوغەم وقەهرەوحەیرانەدڵی من

مەدهۆش وپڕئەفغان وبریندارەدڵی من

سوتاوی مووژەی تۆیەوبریانەدڵی من

کانی (١٨٩٧ – ١٩٥٧) لەشیعرێکدادەڵێ :

خزمینەوەرن تاکوبەقوربانی وەتەن بین

قوربانی چیاودەشت وبیابانی وەتەن بین

ئەم شیعرەی (کانی) دەبێتەسەرچاوەیەکی شیعری بۆ(میهری) ئەم دووشاعیرەهەردووکیان لەیەك سەردەم ولەیەك گەڕەك ولەیەك شارژیاون بێگومان ئاگاداری یەکتربوونەوشتیان لەیەکتروەرگرتووە وسوودوکاریگەرییان بەسەریەکەوەهەبووە ، لێرەدا میهری لەژێرڕۆشنایی ئەم شیعرە شیعرێك بەرجەستەدەکات ودەڵێ :

لاوینەوەرن باهەمووحەیرانی وەتەن بین

حەیرانی گوڵ وسونبول وڕەیحانی وەتەن بین

هەروەهاپەندێکی پێشینان (ئیشی ئەمڕۆمەخەرەبەیانی) کەپەندێکی پێشینانەمەبەستی ئەوەیە کەزووبەزووئیش وکاربەگەرماوگەرمی ئەنجام بدرێ دواکەوتنی کارنیشانەی تەمبەڵییە ، چونکەنازانی

بەیانی دەرفەتت دەبێ یان نا ، میهریش لەدێرێکدا ئەوبیرۆکەیەی لەم پەندەوەرگرتووە وێنەیەکی شیعری پێ چنیووە دەڵێت :

مەبەتەمبەڵ بەتوندی تێبکۆشە

مەکەئیشت لەبۆسوبحت حەواڵە

هەروەهائەم پەندە (گورگەولەپێستی مەڕدایە) ، ئەم پەندەکاتێك دەوترێت کەکەسێك لەپێش چاوان خۆی بەباش دادەنێ لەپێش چاوان کەسێکی بەزەییە (هەروەك سەددام حوسێن بۆمنداڵێك دادەهاتەوەوماچی دەکردلەپێش چاوان خۆی بەکەسێکی بەزەیی دادەنا ، ئەووێنەشی لەهەمووقوتابخانەسەرەتاییەکان دەدادەبووەهۆی ئەوەی هەموومنداڵێك خۆشی بوێ) ئەم بیرۆکەیەبۆتەسەرچاوەی شیعری میهری دەڵێ :

چونکەنایبینێ وەفاجارێ لەزادەی بەشەردا

هەرچی ئەیبینی ئەڵێی گورگەلەناوپێستی مەڕە

وتەیەك هەیەدەڵێ:(نوسینێك ناژی ئەگەرخاوەنەکەی بۆئەوەنووسیبێتی پێی بژی) لەنموونەی ئەم جۆرەکەسانە(جان جاك ڕۆسۆ)یەکەنەچووبەدەم داوەتنامەیەکی فەرەنساتاخەلاتی بکەن وموچەیەکی بۆببڕنەوە٠ڕۆسۆدەڵێ : ئەگەرئەمووچەیەم وەرگرتبائەوسادەبوویان مەرایی بکەم یان بێ دەنگ بم٠

## بەشی هەشتەم

### لەبارەی پاك وخاوێنی :

پاكوخاوێنی ئەوەیەمرۆڤ لەش وجل وبەرگی وخواردەمەنی وناومالّی ودەروونی پاك وخاوێن بی ، كۆمەلّگەی تەندروستیش بەهۆی پاكوخاوێنییەوەلەزۆرنەخۆشی ڕزگاری دەبێ ، پاكوخاوێنی نەخۆشی كەم دەكاتەوە زۆرنەخۆشی هەیەدەتوانی خۆی لێ بپارێزی بەهۆی پاكوخاوێنییەوە٠زۆرجاربابەتی پاكوخاوێنی كورتكراوەتەوەلەپاكوخاوێنی لەجل وبەرگ ولاشە ، بەلاّم پاكوخاوێنی واتائەومرۆڤەزمانی پاك بێ ، داوێنی پاك بێ ، دەستی پاك بێ٠

### پاك وخاوێنی دەم وددان :

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی: (ئەگەرلەبەرئەوەنە نەبوایە كەبارگرانی دەخەمە سەرشانی ئوممەتەكەم ، ئەوا فەرمانم پێدەدان پێش هەموونوێژێك سیواك بكەن)ئیمامی بوخاری گێڕاویە تییەوە٠

### كولێرا (ڕەشەڕشانەوە) :

بریتییەلەنەخۆشییەكی كتوپڕكەبەڕشانەوەوسكچوون دەستپێدەكات كەدەبێ نەخۆشەكەلەماوەیەكی كورتدا ، لەماوەی (٢٤)بیست چواركا تژمێربگەیەنرێتە نەخۆشخانە ، جاخۆپاراستن لەم نەخۆشییە بە جێبەجێكردنی پاكوخاوێنی دەبێ٠

١ - ئامادەكردنی ئاوی پاك بۆخواردنەوە، ستیلەركردنی ئاوبۆبیرەكان وچاوگەكانی ئاو٠

٢ - چاودێریكردنی خواردنگەكان بەتایبەتی لەوەرزی هاویندا٠

٣ - لەناوبردنی مێش ومەگەزكەوەك گوێزەرەوەیەك كاردەكەن بۆگواستنەوەی میكرۆب٠

لەسالّی (١٨٨٤)، زانا"ڕۆبەرت كۆخ"بەكتریای ئەم نەخۆشییەی دۆزییەوە، گواستنەوەی ئەم نەخۆشییە بەهۆی پیسبوونی ئاوی خواردنەوە،یان لەڕێگای دەستی پیس، یان بەهۆی مێش ومەگە زەوەدەبێ، لەنیشانەكانی ئەم نەخۆشییە، نەخۆشەكە تووشی سكچوون دەبێت، لەپاشان دەستدەكات بەڕشانەوە وسكچوونەكە تایبەتمەندییەكی تێدایە، ئەویش ئەوەیە لەئاوی برنج دەچێت، نەخۆشییەكەتووشی گەورەوبچووك دەبێت ، بەلاّم مندالاّن زۆربەتووندی دەیگرن، خۆپاراستن لەنەخۆشی كولێرابەڕاگرتنی پاكو خاوێنی لەلەشی ئادەمیزادوبەكارهێنانی ئاوی پاك بۆخواردنەوەوسەرداپۆشینی خۆراك وقەلاّچۆكردنی مێش ومەگەزودەست شو شتن پاش بەكارهێنانی ئاودەست٠

### ئەم هەلّسوكەوتانە دەبێ خۆمانی لێ بپارێزین :

١ - دەست لەلووت وەردان یان فنكردن٠

٢ - پژمین بەبێ ئەوەی لووت ودەممان بگرین٠

٣ - قسەکردن لەوکاتەی دەممان پڕیەتی لەخواردن٠

لەبارەی سەفەرکردن :

وشەی سەفەرمانای پەردە لەسەرلابردن ، دەرخستن وئاشکراکردن ، بۆنموونەدەڵێن ئافرەتی سافیرە، واتا: ئافرەتێك پەردەی جل وبەرگی لەسەرلاشەی لابردووەوخۆی دەرخستووە ، عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێ)، گوێی لەکەسێك بووشایەتی لەسەرچاکەی کەسێکی تردەدا، بۆیە پرسیاری لێکرد: سەفەرت لەگەڵی کردووە؟

نەخێر

مامەڵەوکڕین وفرۆشتنت لەگەڵ کردووە؟

نەخێر

لێرەدا، ئیمامی عومەر(خوای لێ ڕازی بێ) ، دووپێوەری بۆناسینی ناوەڕۆکی مرۆڤ داناوە :

یەکەم : سەفەر

دووەم : مامەڵەوکڕین وفرۆشتن ، چونکە مامەڵەوکڕین وفرۆ شتن پەردە لەسەردرۆودزی ودەستپاکی کەسەکە لادەدات٠

(مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس)،لەکتێبەکەی دا:(سەرچاوەی ئاین) دەڵێ : گرینگترین هۆکاری عیبرەت وەرگرتن سێ شتە :

١ - گیرۆدەبوون بەزەحمەت٠

٢ - لێکۆڵینەوەلەتاریخی ڕابردووان٠

٣ - سیاحەت وگەڕان بەدنیا٠

نوسەری گەورەی عەرەب (جاعظ) ، دەڵێ:(سێ شت هەن مرۆڤ فێردەکەن : (سەفەر ، ئینجا سەفەر ، ئینجا سەفەر)٠

ئەدەب :

ئەدەب دەکرێت بەدووبەش :

یەکەم : شیعر

دووەم : پەخشان

وشەی شیعرگەلێك بۆچوونی جۆربەجۆری لەسەردەربڕاوە ، عەلائەددین سەجادی دەڵێت:(شیعرلەشعورەوەهاتووە ، هۆنراوەش لەهۆنینەوەهاتووە) لەوانەیە بگوترێت ئەی بۆچی هەمووکەسێك شاعیرنەبێت لەکاتێکدا هەمووکەسێك شعوری پێبەخشراوە ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە:ئەی بۆچی

هەمووکەسێك مفکر(بیرمەند) نەبێت لەکاتێکدا هەمووکەسێك فکری پێبەخشراوە ؟ لەبارەی پێناسەی شیعر ، ڕیتشاردهێرد ، دەڵێ:(شیعرهونەرێکە مەبەستی ئەنجامدانی چێژبەخشینە بەگوێگر)٠

(ستیوارمیل) ، دەڵێ : (شیعردەربڕینی سۆزە) قوددامەی کوڕی جەعفەر، دەڵێ: (شیعرئاخاوتنێکی کێشداروسەرواداروواتادارە)٠

کێش : بریتییەلەژمارەی بڕگە٠

سەروا : وشەی کۆتایی دێرە شیعرە٠بۆنموونە : گۆران ، دەڵێ :

کۆشکی ئاغاگەچکارییە ، ئاوێنەبەندە

کەس نازانێ بەژمارە پەنجەرەی چەندە

(کەواتەهەژارێکی ئەوسەردەمەزۆردەوڵەمەندەبەگوێرەی ئەومرۆڤەی جاران دەژیا)٠

وشەکانی : بەندە ، چەندە سەروان٠

دەڵێن کاتێ ڕۆمانەکان ئیتاڵیایان گرت،(نیرۆن) فەرمانیدا هەرچی دژی ڕۆمان هەبووبیکوژن،بەڵام تەنیادەستکاری یەك شاعیرمەکەن کەبەنیشتیمان پەروەرودڵسۆزناوی دەرکردبوو ، فەرماندەی لەشکر ەکەی ئەوەی بەلاوە زۆرسەیربوو ، وتی : ئەم شاعیرە کەدوژمنی ئێمەیەوخەڵکی هاندەدات،چۆن ئێمەلەپێش هەموویان نەیکوژین؟ (نیرۆن) ، وتی : ئێوە نازانن من دەمەوێت بەدەردێکی وابیکوژم کەڕیسوای بکەم،نەك سبەینێ ببێتەپاڵەوان،لەبەرئەوەیارمەتی بدەن وڕێزی لێبگرن،هەتا خەڵکەکەگومان لەتێکۆشان وڕابردووشی دەکات وبەبەکرێگیراوی ئێمەی تێبگەن،بەم جۆرە ئاواتەکەی نیرۆن هاتەدی وخەڵکی ئیتاڵیائەوشاعیرە نیشتیمان پەروەرەیان بەتاوانی ناپاکی کوشت ! ( بڕوانە : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ژ(٢٠١) ، ١٩٧٤ ) (مونیرشەفیق) دەڵێ :(پێویستەلەم سەردەمەدابەرپەرچی شیعربە شیعروڕۆشنبیری بەڕۆشنبیری وچیرۆك بەچیرۆك وزانست بەزانست وشانۆگەری بەشانۆگەری وتەلەفزیۆن بەتەلەفزیۆن بدەینەوە)٠

(هیندی کچی عوتبە)و(قەتیلەکچی حارس) ، ئەم دووئافرەتەشاعیرە لەشەڕەکانی (ئوحد)و(خەندەق)دا، بەشیعرەکانیان هانی بێباوەڕەکا نیان دەدا، (مەیموونە کچی عەبدوڵا)و(هیندی کچی ئەساسە)ش بەشیعرەکانیان بەرگرییان لەئیسلام دەکردوبەرپەرچی شاعیرە ئافرەتەبێباوەڕەکانیان دەدایەوە ، هەروەها(حەسسان کوڕی سابت) کەشاعیرێکی موسوڵمان بوولەگەڵ شاعیرانی قوڕەیش : (ئەبوعزە) و(ئیبن ونەعبەری) بەردەوام لەشەڕەشیعردابوو٠خوای گەورەلەسوڕەتی (یس)ئایەتی (٦٩)دەفەرموێ : (وماعلمناه الشعروماینبغی له)واتا : (پێخەمبەرمان فێری شیعرنەکردووەوشیعریش لەوقەدەغەیە)٠بەکورتی ئەوشیعرانەی کەلەڕوانگەی ئاینی ئیسلامەوەدروستن بریتین لەوجۆرەشیعرانەی کەبۆدین وژین وخەڵك وکۆمەڵگابەسوودن وەکوشیعری ئامۆژگاری وشیعری فێرکردن ، بەڵام ئاینی ئیسلام ئەوشیعرانەی ڕەتکردۆتەوەکەدەبنەهۆی تێکچوونی ڕەوشتی کۆمەڵگابەتایبەتی ئەوشیعرانەی لەسەرئارەزووشەهوەت وداوێنپیسی وپیاهەڵدانی مەی وئافرەت ئەگەرنائەوشیعرانەی لەسەرڕەوشت وئیمان و٠٠هتد

ڕێگەپێدراون٠بەتایبەتی لەسەردەمی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)کۆمەڵێك شاعیری ئیماندارهەبوون کەبەشیعرەکانیان وەڵامی شیعری شاعیرەبێبڕواکانیان دەدایەوە وەك:(حەسانی کوڕی سابت وعەبدوڵای کوڕی ڕەواحە) بەکورتی بیروباوەڕی ئیسلام لەسەرشیعروشاعیران ئەوەیەکەباشترین شاعیرئەوەیەکەئیمانی هەبێت وشیعری خراپیش ڕەتدەکاتەوە ، هەروەکوخوای گەورەلەسوڕەتی (الشعراء)شاعیران دەکات بەدووبەشەوە ، بەشێوەیەکی گشتی شیعری ڕەتنەکردۆتەوە٠

شاعیرانی عەرەب دەبنە سێ بەش :

یەکەم : شاعیرانی پێش ئیسلام (جاهیلی)

دووەم : شاعیرانی (مخضرم) ، ئەوانەی هەم سەردەمی پێش ئیسلام وسەردەمی ئیسلام٠

سێیەم : شاعیرانی (موەللید) واتاشاعیرانی دوای سەرەتاکانی ئیسلام٠

سەبارەت بەپەخشانیش واتا(ناشیعر) ، واتاهەرقسەیەك وەیانو وەیانوسینێك شیعرنەبێت پەخشانە٠

جیاوازی چیرۆك لەقورئان وچیرۆك لای ئەدیبان:

چیرۆك لەقورئان جیایە لەگەڵ چیرۆك لای ئەدیبان،چونکە چیرۆك لای ئەدیبان بەزۆری خەیاڵی تێداکراوە ، واتا ڕووداوێك ڕوودەدات دوای ماوەیەك چیرۆکبێژێك دێت بۆئەوەی چیرۆکەکە بەتام وچێژ بێت خەیاڵ وئەفسانەی تێدەکات ، بەڵام لەقورئانی پیرۆزڕووداوەکە بەوجۆرەی ڕووی داوە دەگێڕێتەوە ، هەروەهالەقورئانی پیرۆزدا تەنهاچیرۆکی بەکەڵك وسوودی باسکردووە،هەرچی ئەدیبانن چاك وخراپیان باسکردووە، ڕۆمانێك هەیە ناوەکەیم لەیادنییە،زۆرکەس لەژێرکاریگەری ئەم ڕۆمانە خۆیان کوشتووە٠جۆرەکانی چیرۆك هەندێکی باس دەکەم :

١ – چیرۆکی ڕووداو :

ئەم جۆرە چیرۆکە بریتییەلەوچیرۆکانەی لەمێژووڕوویانداوە٠

٢ – چیرۆکی ئەفسانە :

ئەم جۆرە چیرۆکانە هەموویان دەستکردی خەیاڵن ، بۆنموونە : چیرۆکی (دێوودرنج) ، کارێکی خراپ دەکەنەسەرمنداڵ ، چونکەترس لای منداڵ دروستدەکات٠

٣ – چیرۆکی پاڵەوان :

ئەم جۆرە چیرۆکانە وەکو : قەلای دمدم ، ٠٠٠هتد٠

٤ – چیرۆکی دڵداری :

ئەم جۆرەچیرۆکانە کارێکی خراپ دەکەنەسەرلاوان٠خۆشەویستی بە

دوو واتادێت :

١ – من خۆشیەکانم لەتۆدەست دەکەوێت٠

٢ – من خۆشییەکانی تۆم دەوێت٠بەواتای یەکەم دێت٠لەهەواڵێکی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٤٤٨٨) هاتووە : کوڕێك خۆشەویستە کەی خۆی کوشت ! هەروەهالەهەواڵێکی ڕۆژنامەی ئاوێنەدا هاتووە : لەسەرخۆشەویستی کوڕوکچێك دەکوژرێن٠هەروەهالەهەواڵیکی ڕۆژنامەی ئاسۆدا هاتووە : ئەوخۆشەویستی بەرەوخۆکوشتنی برد٠زۆرجاریش ڕوویداوە کچێك لەگەڵ کوڕێك پەیوەندی هەبووە لەماڵێ ژوانیان کردووە کەکوڕەکەبەتەنیالەماڵ بووە میواندراری خۆشەویستەکەی کردووە ، بۆچەندین کاتژمێربەیەکەوەماونەتەوە!!!

نموونە :

کچێك کەقوتابی زانکۆبوولەبەشی (       )کۆلیجی (       ) دەیخوێندئەم کچەباس لەبەسەرهاتی خۆی دەکات،دەڵێ ڕۆژێك لەدەوامی زانکۆتەواوبووم لەدەرگای کۆلیژەکەم هاتمەدەرەوە کوڕێك لەبەردەرگای کۆلیژەکەمان وەستابووچاوەڕوانی هاتنەدەرەوەی منی دەکرد ، هەرکەمنی دی یەکسەربەرەوڕووی من هات من یەکەم جاربووئەوکوڕەم دەدی نەمدەناسی ، بەڵام ئەومنی دەناسی منیش هیچ گرینگییەکی ئەوتۆم بۆدانەنالەڕۆیشتنی خۆم بەردەوام بووم تادەهات لێم نزیك دەبۆوە ، منیش هەنگاوەکانی ڕۆیشتنم خێراترکرد بۆئەوەی زووتربگەمەوەماڵەوە ترسێکی زۆریشم لەدڵ دروست بوو ئیترهەرئەوەندەم زانی کوڕەکەکەگەیشتەتەنیشت منەوە بەدەنگێکی نزم پێی وتم : من تۆم زۆرخۆش دەوێ دەمەوێت ببیت بەهاوسەرم ، منیش لەترسان ڕۆیشتنەکەم خێراترکرد هەرچۆنێك بێ گەیشتمەبەردەم دەرگای ماڵەوەوخۆم کردبەژوورەوە ، ڕۆژی دواتریش لەوکاتەی لەدەرگای کۆلیژەکەدەرکەوتم هەمان ڕووداوی ڕۆژی پێشتردووبارەبۆوە کەگەیشتمەبەردەرگای ماڵەکەم بەرلەوەی بچمەژوورەوەکوڕەکەنامەیەکی لەبەردەمم فڕێداوڕۆیشت ، منیش لەوەدوودڵ بووم ئاخۆنامەکەهەڵبگرمەوەیان نا ؟ ئیترنامەکەم هەڵگرتەوە دوای خوێندنەوەی پچڕپچڕم کردوفڕێمداوچوومەژوورەوە ، دوای چەندکاتژمێرێك گوێبیستی زەنگی تەلەفۆنەکەم بووم منیش کەتەلەفۆنەکەم هەڵگرت دەنگی کوڕەکەکەوتەبەرگوێم وپێی وتم : ئازیزەکەم نامەکەت خوێندەوە ؟ منیش لەوەڵامداپێم وت : تۆتاکەی بەدرەوشتی خۆت فرێنادەی ؟ ئەگەروازم لێ نەهێی کەس وکاری خۆمت لێ ئاگاداردەکەمەوە ، تەلەفۆنەکەم داخست٠لەدوای چەندکاتژمێرێکی تردووبارەزەنگی تەلەفۆنەکەلێیدایەوە منیش دووبارە تەلەفۆنەکەم هەڵگرت کوڕەکەوتی : من نیازم پاکەوباسی دەوڵەمەندی خۆی بۆکردم٠من لەدوای ئەوتەلەفۆنەهەڵوێستم بەرامبەربەوکوڕەگۆڕا ، ڕۆژانەبەردەوام لەدوای تەواوبوونی دەوامی کۆلیژ چاوەڕوانی کوڕەکەم دەکردبۆئەوەیبیبینم گفتوگۆبکەین بۆدانانی بەرنامەی پێکهێنانی ژیانی هاوسەرگیری٠ڕۆژانەبەئۆتۆمبیلەکەی ئەوبەناوشارەکەمانداپیاسەمان دەکردوخۆشەویستی نێوانمان بەتین تردەبوو ، ڕۆژێك لەگەڵ کوڕەکە بەئۆتۆمبیلەکەی بۆپیاسەکردن بەرێکەوتین هەرئەوەندەم زانی ڕووی ئۆتۆمبیلەکەی بەرەوخانوێك ئاراستەکرد بەیەکەوەلەدەرگای خانووەکەچوینەژوورەوەولەژوورێك بەیەکەوەدانیشتین ، دوای قسەوگفتوگۆیەکی کورت هەرئەوەندەم زانی

پەلاماری دام ئیترکوڕەکەئەوەی مەبەستی بوولەگەڵ منی کرد ، زۆرهەوڵمدارزگارم بێت بەلاّم بێسوودبووکارلەکارترازا ، لەوڕۆژەوەکاروپیشەم بووەگریان کوڕەکەش بەڵێنی پێدام بێتەداخوازیم ، ڕۆژان هاتن وچوون کەچی بێدەنگ بوو ڕۆژێکیان لەناکاوزەنگی تەلەفۆنەکەی من لێیداو وتی : دەمەوێ بتبینم کارێکی گرینگم پێتە ، منیش زۆردڵخۆش بووم وام زانی دەیەوێت کاربۆڕێکخستنی هاوسەرگیری بکەین بەیەکەوەدانیشتین ویەکەم قسەپێی وتم : بەهیچ شێوەیەك بیرلەڕێکخستنی خوازبینی وئەوشتانەنەکەیتەوە هەروابەیەکەوەژیان بەسەردەبەین ، منیش زۆرتوڕەبووم وبەهەمووهێزم شەقەزللەیەکم لەڕوومەتی دا ، ئیترکوڕەکەهەڵساوبەرەوئۆتۆمبیلەکەی ڕۆیشت وکاسیەتێکی دەرهێناوپێی وتم : بەم کاسیەتەژیانت دەکەم بەدۆزەخ ، وەرەلەگەڵم ناوەرۆکی کاسیەتەکەببینەچووم سەیری کاسیەتەکەم کرد بینیم ئەوەی لەنێوان من وئەوکوڕەلەوڕۆژەڕوویداوە نیشانی دام وپێی وتم : لەڕێگای کامیرای شاراوەوە وێنەم گرتووە بۆئەوەی ئەگەرڕۆژێك لەفەرمانەکانی من دەرچیت بەم کاسیەتەئابڕووت بەرم وبلاّوی بکەمەوە ، ئیترلەوڕۆژەوەبووم بەکوەیلەیەکی ژێردەستی ئەو ، دەیویست لەڕێگای منەوە پارەکۆبکاتەوە هەرڕۆژێك لەبەرامبەربڕەپارەیەك منی لەدەستی کەسێك دادەنا ، تاڕۆژێکیان کاسیەتەکەلەنێوخەڵکی بلاّودەبێتەوە دواتردەگاتەدەست کوڕەمامەکەم ، ئەویش دەیگەیەنێتەخێزانەکەی من وێنەکان لەنێوگەنجان بلاّوبۆوە بەمەش ئابڕووی من وخێزانەکەم چوو بەناچاری خێزانەکەمان لەوشارەباری کرد منیش لەشوێنێکی ترخۆم حەشاردا ، بەلاّم بەردەوام لەدوای دەرفەتێك دەگەڕام بۆئەوەی تۆڵەی خۆم لەوکوڕەبکەمەوە تاڕۆژێکیان چوومەژوورەکەی وچەندچەقۆیەکم لەجەستەی داوخەڵتانی خوێنم کردوکوشتم،دواتریش من زیندانی کرام وباوکیشم بەوهۆیەوەگیانی سپارد٠(هیوادارم ئەم نموونەیەببێتەپەندێك بۆهەمووئەوانەی بیرلەخۆشەویستی وپەیوەندی دەکەنەوە)٠بەلاّم نموونەی هاوسەرگیری عاقلانەوداب ونەریت ومیسالی (نمونەیی) (ئە)و(ڕ)دووهاوسەرن ساڵی (١٩٧٨) هاوسەرگیرییان کردووە ، (ئە) لەبارەی هاوسەرگیرییەکەیان دەڵێ : ((ئەومنی بەدڵ بوو ، منیش ئەوم بەدڵ بوو ، بەلاّم هیچ کات بەتەنیانەچووین بۆشوێنێك ، تەنیایەك جارلەدەرەوەیەکترمان بینی لەوەشداتەنیانەبووین ، بەڵکوهەندێك لەبنەماڵەی هەردوولامان ئامادەبوون ، دوای ئەوەی یەکترمان بینی (ڕ)بنەماڵەکەی خۆی ناردبۆداوام بووین بەدەزگیراندار))٠

لەڕوانگەی ئەفلاّتوونەوە شاعیران کراونەتەدووبەش :-

١ – شاعیرەباشەکان ڕێگەیان پێدراوەلەکۆمارەکەیدابمێننەوە (کۆمار جۆرەدەوڵەتێکەلەخەیاڵ داڕێژراوە)٠

٢ – شاعیرەخراپەکان کەڕووبەڕووی دەرکردن دەبنەوەلەکۆمارەکەیدا

## کاریزماچییه ؟

کاریزماواتادەسەلأتی لەڕاددەبەدەری ئەفسونکردنی جەماوەر٠کەسایەتی مێژوویی بەدرێژایی مێژووجیهان چەندین کەسایەتی ناوداری لەخۆگرتووە چ وەك کەسایەتییەکی قارەمان یان خوێنڕێژیان زاناوهونەرمەندێکی دیاروبەناوبانگ٠بێگومان هەندێك لەوکەسایەتییانەمێژووبەچاك باسیان دەکات وهەندێکیشیان بەخراپ وقێزەون وبەدکردارونمونەی شەڕانگێزی ودیکتاتۆری٠

ئەگەربەچاوی وردبینی تەماشای لاپەڕەکانی مێژووی ئەوکەسانە بکەین کەگەورەبوون وناویان بەجیهاندا بلأوبۆتەوە ئەوجۆرەپیاوانە ، یان هەرخەریکی چاکەویارمەتیدان ودەستگرتنی لێقەوماوان بوونە ، بۆسوودی گشتی وئاسوودەیی ئەم وئەوچ بەوتن یان بیریان کردەوە پشتیوانی لێقەوماوان بوونە، یان بەزیرەکی خۆیان پێشخستووە٠

وشەی کاریزما، لەڕووی زمانەوە واتا: بەخششی خوا، بەکەسێك دەوترێ کەتوانایەکی لەڕاددەبەدەری لەبوارێك لەبوارەکان هەبێت وکاریگەری لەسەرکۆمەڵگاودەورووبەری دروست بکات ، کاریزماش زیاترلەهەڵومەرجی کێشەوململانێ دەردەکەوێ ، کارێزماش کەسێکە خەڵك خۆشیان دەوێ وشوێنی دەکەون ، کەسێکی وەك : ئیمامی غەزالی وئیبنوقەییمی جەوزی تائێستاش نووسینەکانیان کاریگەری ماوە ، هیچ نوسراوێکی ئەمڕۆشان لەشانیان نادات ئەوەندە بەتام وچێژوبەرەکەتە ، هەروەهافکروفەلسەفەی دنیا تائێستاش لەژێرکاریگەری ئەفلأتوون وئەرستۆدایە،یاخود نیلسوون ماندێلا،غاندی ئەوکەسانە لەدوای مردنیشیان هەرکاریزمان ، بەلأم پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) تایبەتمەندی خۆیان هەیەو ناچنە ئەو چوارچێوەیەوە ، چونکە ئەوانە لەڕێگەی پاڵپشتێکی ئیلاهییەوە ،جگەلەوەش ئەگەربڕیاربێت کەسایەتی کاریزمایی کەسایەتییەکی مەقبول بێت وخەڵك شوێنی کەوتبن ، ئەوابەشێکی زۆریان خەڵك باوەڕی پێنەکردوون وخەڵکێکی کەم دوایان کەوتوون ، وتراوە پاڵە وان ناتوانێت لەمێژوودا دەرکەوێت،ئەگەرباروودۆخی کات وشوێن بۆی نەڕەخسێت ، بۆنموونە ئایاهیتلەردەبووە پاڵەوان ئەگەرلەبەریتانیا ژیانی بەسەربردبا؟ هەروەهائەگەرئەوکەسایەتیانە ش نەبوونایە کەسێکی دیکە لەجیاتی ئەوان دەبووڕۆڵ بگێڕێت ، کەواتە باروودۆخی ئابووری وکۆمەڵایەتی وسیاسی یارمەتی دروست بوونی کاریزما دەدات وکەسەکەش خۆرسك لەماکیان دایە،لێرەداناوی کەسانی بێبەزەییشم هێناوە ، وەکو : هیتلەر، چونکەبەناوبانگ بووە کاری کردۆتە سەرمێژوو، لەسەرئەوبنچینەیە ناوم هێناوە نەك بەچاکیان بزانم٠

**لەبارەی زیرەکی :**

(هواردگاردنەر) دەڵێت : (زیرەکی توانای مرۆڤەبۆچارەسەرکردنی کێشە)٠هەندێکی تردەڵێن (زیرەکی زمانی)٠

**هەندێك لەزیرەکەدەگمەنەکان :**

١ - ئیمامی شافیعی :

لەتەمەنی حەوت ساڵی هەمووقورئانی لەبەربووە،لەتەمەنی پازدە ساڵی بۆتە موفتی٠

٢ - جۆن ستیورات مل :

ئابوریناس وفەیلەسوفێکی بەریتانییە، ساڵی (١٨٠٦) لەدایکبووە،لەتەمەنی یانزە ساڵی فەیلەسوف بوو٠

٣ - ڤیکتۆرهۆگۆ(١٨٠٢ — ١٨٨٥) :

نوسەرێکی فەرەنسییە لەتەمەنی سێزدە ساڵی خەلاّتی ئەکادیمی وەرگرت لەوێژەدا٠

٤ - یۆنگ :

لەتەمەنی سێ ساڵی فێری خوێندەواری بوو، لەتەمەنی هەشت ساڵی بەشەش زمان قسەی دەکرد٠

٥ - لۆردماکۆڵی :

مێژووی جیهانی لەتەمەنی حەوت ساڵی نووسی٠

٦ - کریستیان هانیفین :

منداڵێکی هۆڵەندی بوولەتەمەنی چوارساڵی بەزمانی ئیغریقی ولاتینی وفەرەنسی قسەی دەکرد٠

## گەشبینی :

گەشبینی بریتییەلەتێڕوانینی باش بۆژیان وپێشبینی ڕوودانی کاری چاك ودڵخۆشکەربەپێی توێژینەوەیەك کەلەزانکۆی (بیستبۆرگ)ی ئەمریکی ئەنجام دراوە ، ڕەشبینەکان زیاترتووشی نەخۆشییەکانی وەك:بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن وزیادبوونی ڕێژەی کۆلیستڕۆڵ لەخوێن دەبن هەروەهاتوێژینەوەیەکی ئەمریکی ئەوەی دەرخستووە کەگەشبینی زوودەرکەوتنی نیشانەکانی پیربوون لای مرۆڤ کەم دەکاتەوە ، ئیبن مەسعووددەڵێ : (لەناوچوونی مرۆڤ بەدووشتە: نائومێدی ولەخۆڕازیبوون )٠

(ئەلبێرت کامۆ) زۆرتاریکبینانە تەماشای ژیان دەکات،دەڵێ:(ئایاژیان ئەوەدەهێنێت تیایدابژین ؟)

## یەکەمین ئینسان لەکوێ ژیاوە ؟

یەکەمین خانوولەسەرزەوی کەعبەیە، چوارگۆشەیەکەپێی دەڵێن : کەعبە ، کەبەرامبەر(بیت المعمور)ە لەئاسماندا ، ئەویش خۆی چوا رگۆشەیەکە لەبەرامبەرعەرشە ، ئیبن عەبباس(خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ : (حەزرەتی ئادەم یەکەم کەس بووئەوماڵەی سازکرد ونوێژی تێداکرد) ، هەروەهاله (سەحیحی مسلم) داهاتووە ئەبوزەر دەڵێ : (وتم:ئەی پێخەمبەری خوا،کام مزگەوت یەکەم مزگەوتەلەسەرزەوی؟

فەرمووی: مزگەوتی حەڕام

وتم: پاشان کامە؟

فەرمووی: مزگەوتی ئەقسا

دیارەمزگەوتیش لەشوێنی ژیانی خەڵکی دەبێ ، کەواتە (مسجد الحرام) یەکەمین مزگەوتەلەدەوری ماڵی بەیت دروستکراوە، (مسجدالاقصی)ش ، دووەمین مزگەوتی سەرزەوییە کەدوای (مسجدالحرام) دروستکراوە ، حەزرەتی داود(سەلامی خوای لێ بێ)دروستکردنی ئەومزگەوتەی دەستپێکردوحەزرەتی سولەیما نی کوڕی تەواوی کرد، ماوەیەك ئەومزگەوتە ڕووگە( قیبلە)ی موسوڵمانان بوو، لەپاشان ڕووگە گۆڕابۆ(کەعبە)٠

لەبارەی تەسبیح :

تەسبیح لەڕیزی ئەوشتانەیە کەبەدەست بەشێکی زۆری خەڵکەوە یەلەگەنجان وبەساڵاچووان،لەڕووی دەروونییەوە تەسبیح سوودێکی گەورەی هەیە کەلەکاتێکدامرۆڤ فکری ئاڵۆزە بەکارهێنانی تەسبیح مێشك دەحەسێنیتەوە٠

جۆرەکانی تەسبیح لەڕووی ڕێژەی دەنکە کانییەوە :

١-تەسبیح جۆرێکیان جگەلەئیمامەکەی ودوومەمکەکەی لە(٩٩)دەنك پێکدێ،دەڵێن بۆیە(٩٩) دەنکە،چونکە خوای گەورە (٩٩) نەوەدونۆناوی هەیە، بێجگەلەوەش دەبینین دەنکەکان (٣٣) بە(٣٣) بە(٣٣) جیاکراونەتەوە کەدیارەئەمە بۆتەسبیحاتی دوای نوێژە فەرزەکانە،کەسوننەتە (٣٣) جار(سبحان الله ) و(٣٣)جار(الحمدلله) و(٣٣)جار (الله اکبر) بکرێت٠

٢-تەسبیحی (٦٣)دەنکی :

ئەم جۆرەیان گوزارشت لەتەمەنی پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ)دەکات٠

## بەشی نۆیەم

### نەزانی چییە ؟

نەفامی (جاهیلیەت) مانای دژی زانست نییە واتازانستی کیمیاوفیزیاوبیرکاری و٠٠٠هتد٠چونکەئەم زانستەهەرگیزرێگری لەمرۆڤ ناکات لەتاوان وستەم ونادادگەری ، بەڵکورووبەری تاوانی فراوانترکردووە ئەگەرجاران مەیدانی شەرلەچەندکیلۆمەترێك تێپەری نەدەکردوژمارەی کوژراوان کەمتربووئەمرۆرووبەرەکەی فراوانتربووەوجەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤ — ١٩١٨) کەزیاترلەیەك ملیۆن کەسی کردەقوربانی ، دواترجەنگی دووەمی جیهانی روویدا(١٩٣٩ - ١٩٤٥)کەزیاترلە(٥٠)پەنجاملیۆن کەسی کردەقوربانی کەچی لەماوەی (٢٣) بیست وسێ ساڵ پێخەمبەرایەتی وبیست وحەوت غەزادا نزیکەی (١٠٠٠)هەزارکەس کوژراون٠هەروەك چۆن ئەمرۆنەتەوەخاوەن شارستانیەتەکان ئەوهەمووپێشکەوتنەمرۆڤی لەخراپەدوورنەخستۆتەوە بەڵکوبەتواناتری کردووەبۆئە نجامدانی تاوان٠نەزانی دووجۆرە : نەزانی زانست ونەزانی سەرلێشێوان٠

**چەندنموونەیەك :**

لەسەردەمی نەفامی خێلەکییەك لەبازاردانیشتبوولاقی درێژکردبوو، ململانێی هەرکەسێکی دەکردکەبتوانێ لاقی لەسەررێگەکەلابدات بە بەهێزی شمشێر ، یەکێك لەوکەسانەکەلەوێ دانیشتبووخێراپەلاماری شمشێرەکەی داولاقی پەراند ، بەم هۆیەشەوەئاشوبێکی زۆرهەڵگیرسا زۆرگەورەهەڵگیرسا ، ئەگەریەکێك لەئەندامانی خێلەکەتاوانێکی ئە نجام دابا ، ئەواهەمووئەندامانی خێلەکەکە تاوانباردەبوون بەوهۆیە شەوەهەمووان سزادەدران ، هەردەستدرێژییەك بکرابایەسەرئەندا مێکی خێلەکە وەك ئەوەوابوودەستدرێژی کرابێتەسەرهەمووخێلە کە، ئیبن عومەر(خوالەخۆی وباوکی رازیبێ) ، دەڵێ: پێخەمبەری خوا فەرموویەتی:(کەللەرەقترین(بەدبەختترین)کەس لای خودا سێ کەسە : کەسێك لەماڵی خواداخەڵك بکوژێت ، یان جگەلەبکوژەکە کەسێکی تربکوژێتەوە ، یان لەتۆڵەی خوێنی نەفایدابکوژرێتەوە) ،هەروەها بەیهەقی ریوایەتی کردووە ، پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(لەخۆبایی ترین کەس ئەوەیە کەکەسێکی ترجگەلەبکوژەکە بکوژێت (باوك ، یان برا ، یان ئامۆزا) یان خوێنی کەسێك لەمووسڵمانان داوابکات کەلەپێش ئیسلامداکوژرابێت ، هەرو ەهاریوایەت کراوەکەپێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ) رێگری کرد وەلەبەردهەڵدان ، فەرموویەتی:(راوی پێناکرێت ودوژمن ئەزیەت نا دات ، بەڵام ددان دەشکێنێت وچاوئەزیەت دەدات) ، نمونەیەکی تربە سوس پوری جەساس دراوسێیەکی هەبووشترێکی هەبوو،کەلەگەڵ وشترەکەی (جەساس) دا دەلەوەرا ، (کەلیبی کوری رەبیحە)ش کەگە ورەی هۆزبوو دۆڵێکی هەبوونەیدەهێشت جگەلەوشترەکەی خۆی هیچ وشترێکی ترتیایدا بلەوەرێت ، رۆژێکیان بینی

وشترەکەی(بەسو س)لەدۆڵەکەی ئەودا دەلەوەڕێت بۆیە تیرێکی دا لەگوانی وشترەکەی بەسوس ، کاتێ بەسوس بەمەی زانی هاواری کرد ، هاواربۆ ئەم زە لیلییە جەساس هێوری کردەوە ، پاشان چوو کەلیبی کوشت ، ئەمە هۆکاری جەنگی (بەسوس)بوو کەلەنێوان هۆزی کەلیبی وجەساس داڕووی دا٠ (ئەبوذەر) لەگەڵ یەکێك لەهاوەڵان خراپ تێگەیشتنێك لەنێوانیانداڕووی دا ، ئەبوذەر پێی ووت : (ئەی کوڕی ژنەڕەشەکە) پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: (تۆپیاوێکی سیفەتی نەفامیت تێدا مایە)٠ هەروەهاپێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :

(چوارشت هەن لەناوئوممەتەکەم دا لەکردەوەکانی سەردەمی نەفامین :

١ – خۆهەڵکێشان بەبنەماڵەوعەشیرەت وتایەفەگەرییەوە٠

٢ – تانەوتەشەردان لەکەسانی بێکەس وبێ عەشیرەت و بێبنەماڵ٠

٣ – بەکارهێنانی ئەستێرەناسی بۆباران ، واتا ئەستێرە دەکەنە هۆکاری باران بارین٠

٤ – لەخۆدان لەسەرمردووەکانیان٠

عەلی وەردی دەڵێ ئالوسی شەڕێکی توندەگێڕێتەوەکەلەجاهیلیەت ڕوویداوەهۆکاری ئەوشەڕەش گاڵتەپێکردن وسوکایەتی بووە ، بەسەرهاتەکەئەوەیە : سێ پیاوی بیابان نشین سەفەرێك دەکەن یەکێکیان فرازی دەبێت ودووەمیان تەغلوبی دەبێت ئەوی تریان لەهۆزی کەلبی دەبێت ، بەیەکەوەکەرێکی کێوی ڕاودەکەن کاتێك فرازییەکەدەچێت هەندێك کاری تایبەت ئەنجام بدات ، دووهاوڕێکەی گۆشتی کەرەکەدەبرژێنن ودەیخۆن دواتر(     )ی کەرەکەبەبرژاوی بۆفرازییەکەهەڵدەگرن بۆئەوەی بیخوات ، کاتێك فرازییەکەدەگەڕێتەوەدەیخوات ئەوانیش پێدەکەنن فرازییەکەهەڵدەچێت وشمشێرەکەی هەڵدەکێشێ وفەرمان دەکات بەدووهاوڕێکەی کەدەبێت ئەوانیش بیخۆن ، یەکێکیان ڕەتی دەکاتەوەونایخوات چارەنووسی کوشتن دەبێت ، بەڵام ئەوی ترگۆشتەکەدەخوات بۆڕزگارکردنی گیانی خۆی ، ئەوەی کەخواردی خۆی و هۆزەکەی بوونە مایەی قەشمەری هۆزەکانی ترچەندینشاعیریش لەبارەی ئەوەوەقەسیدەی داشۆرینیان نووسی٠لەجاهیلیەتدائابڕوچوونی یەکێك ڕەنگدانەوەی بۆتەواوی هۆزەکەدەبێت٠ عەلی وەردی دەڵێ(ئەبوفەرەجی ئەسفەهانی) کتێبێکی تایبەت بەڕۆژگاری عەرەب نووسیووە،مەبەست لەوڕۆژانەیە کەجەنگ لەنێوان هۆزەکان لەجاهیلیەت ڕوویداوە کەبریتی بووەلە(١٧٠٠)هەزاروحەفسەدڕۆژکاتێك هۆکاری ئەوجەنگانەدەپشکنین بۆنموونەجەنگی (الغبراء) هۆکاری ئەم جەنگەکێبرکێی سوارچاکییەك بوولەنێوان هۆزی (عەبسی) و(زوبیانی) ئەوکات مشتومڕێك لەنێوان خاوەن ئەسپەکان دروست دەبێت ، هۆزەکان وهاوپەیمانەکانیان لەجەنگێکی سەخت بەشداردەبن کەهیچی کەمترنییەلەجەنگی (بەسوس)٠عەلی وەردی دەڵێ : ئەگەرسەیربکەین جەنگی یەکەمی جیهانی لەئەنجامی گوللەیەکی قوتابییەکی سربی بووکەئاڕاستەی جێنشینی نەمسای کرد ، ئەمەش وەك تیرێکی بەنی تەغلوب لەوشترێکی بەسوس بگرێت زیاترنییە٠

**لەبارەی زانایانی ئاینی :**

پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:(زانایان میراتگری پێخەمبەرانن)دیارەپێخەمبەران زۆرپاکبوون وبەهیچ جۆرێك لەرێی ڕاست لایان نەداوە ، ئامانجیان ڕاگەیاندنی فەرمانی خوای گەورەبووە بۆنەوەی ئادەم۰دیارەئێستا هیچ پێخەمبەرێك لەجیهاندانییەژیانی خۆی بەسەرببات۰ هەروەها "حەسەنی بەصری" وتوویەتی:(ئەگەرزانایان نەبوونایە ئەوخەڵکەوەکوئاژەڵ وولاخیان لێدەهات) وشەی (میحراب) لەزماندالەوشەی (حرب) وەرگیراوە ، کەواتای "جەنگ" دەگەیەنێت ، میحرابیش لەمزگەوتداسەنگەری ئەم جەنگەیە ، کە واتەوتاردان ڕووبەڕوی ئەودوژمنە دەبێتەوەکەشەیتانە،وتاریش دەبێ مامناوەندی بێت،چونکەئەگەردرێژبێت گوێگرلێی بێزاردەبێت ، ئەگەرکورتیش بێت باسەکەڕوون ناکاتەوە ومافی خۆی نادات ، گو ێگرنابێ قسەبکات ، ئەگەرکەسێکیش قسەی کردنابێ بەقسەپێی بڵێین ، بەڵکودەبێ بەئاماژەئاگاداری بکەین ، هەروەهانابێ گوێگرلە کاتی وتارداندابەتەسیح وپەنجەوئەوشتانەخۆی سەرقاڵ بکات،فکریان لای وتارەکەنەمینێ وەك لەحەدیسداهاتووە : (هەرکەسێ یاری بەوور دەبەردبکات ودەستیان تێوەربدات ئەوەقسەی کردووە )لەبەرگرینگی وتارە ، کەزۆرجار(وەزارەتی تەندروستی) وتاربێژانی کۆکردۆتەوە وداوای لێکردوون بۆئەوەی لەوتاری هەینی دا خەڵکی هانبدەن بەدەم هەڵمەتی کووتانەوەبچن ومنداڵەکانیان بکوتن،یاخودرێکخراوی (ئێم ئەی جی) وتاربێژانی کۆکردۆتەوە ، داوای لێکردوون لەوتاری هەینی دا خەڵکی وریابکەنەوە کەدەستکاری (مین) نەکەن وياری پێنەکەن لەکاتی بێئاویشدا زۆرجارداوالەوتاربێژان کراوە کەخەڵکی هۆشیار بکەنەوە دەست بەئاووکارەباوهۆیەکانی تری ژیانەوەبگرن ، هەرلەبە رگرینگی وتارە نوێژی (هەینی) لەچوارڕکاتەوەبووە بەدووڕکات ، سو ڕەتێکیش لەقورئاندا ناوی (جمعە)ی لێنراوە بۆیەناونراوە(جمعە)لە بەرکۆبوونەوەی گشت مووسوڵمانان لەشاریاگوند لەوڕۆژەدا ، چونکە تەربیەت وەك پاتری وایە بەردەوام پێویستی بەشەحنکردنەوەهەیە هەندێك دەق وفەرمودە باسی گەورەیی زانست وزانایان دەکات ، لە بارەی زانای خراپیش هەڕەشەی گەورەوگرانیان لەسەرهاتووە۰

پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (دووچین لەئو ممەتی من هەن ئەگەرچاكبوون هەمووخەڵکی چاك دەبن ، وەئەگەر خراپ بوون خەڵکەکەش چاویان لێدەکەن وخراپ دەبن ، ئەودوو چینەش : فەرمانڕەواوفەقیە وشارەزاکانن) هەروەها فەرموویەتی : (زەمانێك دێت بەسەرئەوخەڵکەدا فەقیە وشارەزاکان کەم دەبنەوەو وتاربێژەکان زۆردەبن)۰

ئیبن جوزی بەغدادی ، دەڵێ:(ئەگەرزانایەك لەتەکولێرەیەکی لەدەست دابێت وخەریکی خواردنی بێت،بائەوکارانە ڕێگەپێدراوبن هەرلەبەرچاویان کەسایەتی دادەبەزێ )، هەروەهادەڵێت : (بەڕاستی کەنارگیری وخۆبەدوورگرتن لەچاوی خەڵکی قەڵایەهەم بۆزانست وهەم بۆزاناکەش ، چونکە خەڵکی عەوام بەکەم تەماشای ئەوکارانە دەکەن)،هەروەها دەبێ زانا لەکاتی بەدەستهێنانی شوێنکەوتن ، کەهەندێکیان شوێنکەوتوانیان زۆرە ، توشی خۆبەگەورەزانین نەبن۰ هەروەها دەبێ وتاربێژبە شێوازێکی جوان ئامۆژگاری

بكات ، هەروەك خوای گەورە فەرمان بەحەزرەتی موساوهارۆونی برای دەكات لەكاتی گفتوگۆكردن لەگەڵ فیرعەون بەنەرم ونیانی قسەی لەگەڵ بكەن ، بەڵكوقسەی نەرمیان ببێتەهۆكاری بەخۆداچوونەوە ( فقولاله قولالینا لعله یتذكر اویخشی) طه : ٤٣ – ٤٤ لەتوێژینەوەیەكدا كەقوتابی ماستەر (تواناعوسمان محمدامین) بەناونیشانی : (ڕۆڵی بەهاكۆمەڵایەتییەكان لەڕێكخستنی كۆمەڵگا) ئەنجامیداوە لەبارەی ئاستی مامۆستایانی ئاینی لەجێبەجێكردنی ئەركەكانیان بۆچارەسەركردنی كێشەكانی كۆمەڵگای كوردی،ڕێژەی( ٦ ,٤٩٪) پێیان وایە تاڕاددەیەك بەئەركی خۆیان هەڵساون،ڕێژەی (٦ ,٣٩٪) پێیان وایە ئەركەكانی خۆیان بەكەمی ئەنجام داوە ، ڕێژەی (٧ ,١٠٪) پێیان وایە كەتائاستێكی زۆرئەركەكانی خۆیان ئەنجام داوە٠

## چەندزانیارییەك لەسەرحەدیس :

١ – رواه الشیخان : ئەوفەرموودانەیە كەئیمامی (بوخاری وموسلیم) گێڕاویەنەتەوە٠

٢ – متفق علیه : بوخاری وموسلیم

٣ – ژمارەی فەرموودەكان : ئیمامی ئەحمەد ، دەڵێ : لە پێخەمبەری خواوە(درودی خوای لەسەربێ) حەوت سەدهەزار فەرموودەی ڕاست گێڕدراوەتەوە٠ ئەبولعەبباس كوڕی عوقەوە ، دەڵێ : سێ سەدهەزارفەرموودەم لەئەهلی بەیتەوەلەبەركردووە٠

ئیسحاق كوڕی ڕاهەوەیش ، حەفتاهەزارفەرموودەی لەبەركردووە بەلاّم هەشیانەڕەخنەلەوژمارەیە دەگرێ ، ئیبن جوزی بەغدادی دەڵێ : ئەگەرفەرموودەڕاستییەكان وبابەتییەكان كۆبكرێتەوە ناگەنە پەنجا هەزارفەرموودە٠

٤ – سوننەت :

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (شوێنی سوننە تەكانی ئەوانەی پێش خۆتان دەكەون بست بەبست وباڵ بەباڵ) بە لاّم لەشەریعەتدا سوننەت بەواتای فەرموودە ، گوفتاروكردار ، یاخود ئەوكاروكردەوانەی لەهاوەڵاّنی بینیوەوڕازی بووە ، یان بەچاكی زانیو ەوپشتگیری لێ كردووە٠ بیرۆكەی ئەوەی تەنها قورئان بۆتێگەیشتنی ئیسلام بەسە، بیرۆكەیەكە خودی قورئان بەدرۆی دەخاتەوە ، چونكەلەچەندین ئایەتی قورئان فەرمانكراوە شوێنی پێخەمبەر(درودی خو ای لەسەربێ) بكەوین وگوێڕایەڵی بكەین ، زۆرجارئایەتەكانی قورئان وردەكارییان پێنەدراوە،وەك: ژمارەی ڕكاتەكانی نوێژوشێوازی ئەنجام دانی، هەروەها عام هەیە حەدیس تەخصیصی كردووە بۆنموونە :

خوای گەورەلەسوڕەتی (مائدە) دەفەرمووێ : (حرمت علیكم المیتة والدم) ، ماسی مرداربووە،حەدیس تەخصیصی كردووە كەحەلاله٠

**تۆمارکردنی سوننه :**

**وتراوەیەکەم کەس بیری لەتۆمارکردنی سوننە کردبێتەوە، (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)بووە،نامەیەکی ناردووە بۆ(ابی بکربن حزم) والی وقازی شاری مەدینە تیایدا نوسیویەتی : بگەڕێ وسەرنج بدە فەرمو ودەی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)وبینوسەوە ، چونکە من لە تیاچوونی ئەوزانستەونەمانی زانایان دەترسم٠ (ئەبوزعیم) لە(تاریخ الاصفهان) ، دەڵێ:عومەری کوڕی عەبدولعەزیز،نامەی بۆهەمووولاًتان نوسی : بگەڕێن بەدوای فەرموودەی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) وبینوسنەوە(٠ئیبن جریج)(١٥٠)ی کۆچی لەشاری مەککە فەرمو ودەی کۆکردۆتەوە ، (ئیبن ئیسحاق) (١٥١)ی کۆچی لەمەدینە ، ئیما می مالك (١٧٩)کۆچی ، لەکوفەسوفیانی سەوری(١٦١)کۆچی،لەخوڕاسان (عەبدوڵای کوڕی موبارەك) (١٨١)کۆچی ، پاشان (محمدی کوڕی ئیسما عیل) ناسراوبە (ئیمامی بوخاری) (٢٥٦)کۆچی ڕێگەیەکی نوێی گرتە بەر، تەنهافەرمووده سەحیحەکان بنوسێتەوە،کتێبەکەی ناونا(الجامع الصحیح)لەسەرهەمان ڕێچکەی ئەو قوتابیەکەی (ئیمامی موسلیم) (٢٦١)کۆچی ، سەحیحەبەناوبانگەکەی بەناوی (صحیح مسلم) دانا بەدوای ئەوان زۆرێك شوێنیان کەوتن وزۆرێك لەکتێب نوسران ،**

**گرینگترینیان:(سنن ابی داود) (٢٧٥) ی کۆچی، (سنن النسائی) (٣٠٣)ی کۆچی،(جامع** الترمذی**)** **(٢٧٩)ی کۆچی، (سنن ابن ماجە) (٣٧٣)ی کۆچی پاشان سەدەی چوارەمی کۆچی هات،لەبەناوبانگترین ئیمامانی ئەوسەردەمە : (سلیمان بن احمد** الطبرانی**) کەسێ موعجەمەکەی خۆی دانا ، گەورەکەی تەرخانکردبۆئەوفەرموودانەی کەهەرهاوەڵێك دەیگێڕێتەوە وناوی هاوەڵانی بەپێی پیت ڕێکخست ئەمەش بریتییەلە (٥٢٥٠٠٠) پێنجسەدوبیست وپێنج هەزارفەرموودە ، هەروەها (الدار**القطنی **) کەسونەنەبەناوبانگەکەی خۆی دا ، (**الطحاوی**) (٣٢١)ی کۆچی٠**

**ئیمامی نەسائی : لەساڵی (٢١٥)ی کۆچی لەشاری (نەسا) لەخوڕاسان لەدایکبووە ، ساڵی(٣٠٣)ی کۆچی لە(ڕملە) کۆچی دوایی کردووە٠**

**ئەبوداود :**

**سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی کوڕی ئیسحاقی سیجستانییە ، ساڵی (٢٠٢)ی کۆچی لە(خوڕاسان) لەدایکبووە،لە(بەسرە) ساڵی (٢٧٥) ی کۆچی وەفاتی کردووە٠**

ترمذی :

**(ئەبوعیسا محەممەدی کوڕی عیسا) ساڵی (٢٠٠)ی کۆچی لە (**ترمذ**) لەدایکبووە٠**

**ئیبن ماجە :**

**عەبدوڵای کوڕی یەزیدی کوڕی ماجە ، ساڵی (٢٠٧)ی کۆچی لەدایك بووە٠**

**٥ – تەنیازانینی حەدیسێك لەسەربابەتێك بەس نییە ، بەڵكو پێویست بەكۆكردنەوەی گشت دەقەكان وروانین لەهەموویان پێكرادەبێت،چونكە جاری وایە لەسەربابەتێك كۆمەڵێك حەدیس هەیە،دەبێ هەموویان پێكەوەتەماشابكەی ولەهەموویان تێبگەی٠**

**فەرموودەی قودسی :**

**ئەوفەرموودەیەیەواتاكەی لەخوداوەوەیە ، بێژەودەربڕینەكەی لەلایەن پێخەمبەرەوەیە(درودی خوای لەسەربێ)٠**

**تێبینی لەسەرتەفسیری قورئانی پیرۆز :**

**١ – نوسەرێك دەنوسێت ودەڵێت : لەسەرشانۆی جیهان زۆرپاشای بەهێزمان بینی كەزیانیان بەوجۆرەبووە خوای گەورە وەسفیان دەكات** (قالت ان الملوك اذادخلواقرية أفسدوها وجعلواأعزة أهلهاأذلة وكذلك يفعلون) **واتا : (بەلقیس وتی : بەڕاستی لەشكری پاشاكان كاتێك چووبنە شاروديێهاتەكانەوە ، وێران وكاولیان كردووە وتۆوی خراپەیان چاندووە ، كەسانی خاوەن دەسەڵات وپیاوی ناوداری ئەوشوێنەیان زەلیل وڕیسواكردووە وهەمیشەئەوەپیشەیانەوبەوجۆرەدەكەن وهەرواش دەبن)٠ النمل : ٣٤ ئەم قسەیەهی شاژنی سەبەئە٠**

**٢ – نوسەرێكی تردەنوسێت ودەڵێت : (نێروەك مێ نییە) ، لەم ئایەتەقورئانییەپیرۆزەدالەسورەتی (ال عمران)داخوای گەورەپێی ڕاگەیاندوین كەوانێرجیاوازەلەمێ٠**(اذقالت امرأت عمران رب انى نذرت لك مافى بطنى محررافتقبل منى انك أنت السميع العليم) **ال عمران : ٣٥ واتا : (كاتێك هاوسەری عیمران وتی : پەروەردگار؛بەڕاستی من بڕیارم داوەونەزرم كردووە ئەومنداڵەی لەسكمدایەئازادكراوبێت لەهەمووئەرك وئیش وكارێك (تاهەرلەخزمەتی بیت المقدس دابێت)دەتۆش لێم وەرگرە ، چونكەبەڕاستی تۆخوایەكی بیسەروزانایت)٠**(فلماوضعتهاقالت رب انى وضعتهاأنثى والله أعلم بما وضعت وليس الذكركالانثى وانى سميتهامريم وانى أعيذهابك وذريتهامن الشيطن الرجيم) **ال عمران : ٣٦ واتا : (بەلاّم كاتێك منداڵەكەی بوو(بەدڵشكاوییەوە) وتی : پەروەردگارخۆمن كچم بووبێگومان خوا خۆی چاك دەزانێ كەچی بووە ، (خۆئاشكرایە)كوڕیش وەكوكچ نییە(ئەركی خزمەتكاری بیت المقدس بەوناكرێت) ، منیش بەڕاستی ناوم ناوە مەریەم ومن ئەیپارێزم بەتۆخۆی ووەچەكەی لەشەیتانی ڕەجمكراو)٠ئەم ئایەتەقسەی هاوسەری عمرانە٠**

**٣ – نوسەرێكی تردەنوسێت ودەڵێت : خوای گەورەدەفەرموێت : (انما**هذه الحيوة الدنيامتع وان الاخرة هى دارالقرار) **غافر : ٣٩ لەزەمانی فیرعەون ئەوكەسەی كەئیمانی هێنابوو وتی : (ئەی قەوم وهۆزم بێگومان ژیانی ئەم دنیایەتەنهابریتییەلەڕابواردنێكی كەم ، بەڕاستی ژیانی پاشەڕۆژوداهاتوو، هەرئەوشوێنی ئومێدوئارامگرتن وحەسانەوەیەبۆئیمانداران)٠**(يقوم انماهذه الحيوة الدنيامتع وان الاخرة هى دارالقرار)٠

**لەبارەی زانست :**

**ئایازانست لەخزمەتی مرۆڤایەتی دایە؟**

وەلأمی ئەم پرسیارەلەهەمووئەوکوشت وکوشتارە بەکۆمەڵ وکاولکا ی وڕوخاندن وویرانکردنەدایە، لەبەرئەوە (ئیسلام) سنووربۆزانیاری دادەنێ ، لەم ڕووەوە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویە تی:(ان من العلم جهلا وان من القول عیا)رواەابوداود،واتا:(هەندێك زانست ناپەسندە ، هەندێ قسەش هەیە گران دەبێت بەباربەسەر قسەكەردا)، هەروەهافەرموویەتی:(پەنابەخوادەگرم لەزانیارییەك كەسوودوقازانجی نەبێت) ، ئەوپیاوەی (دینامیت) ی داهێنا وای دادەناخزمەتی مرۆڤایەتی دەكات،ڕێگاوبان بۆمرۆڤ خۆش دەكات وشاخ وكێوی سەخت هەڵدەدرێت ، سەدان هەزاربەردشكێنی بێكا ركردوجەرگ ودڵی هەزاران پیاووئافرەت ومنداڵی لەت لەت ، ئە گەرزانست بەتەنیامایەوە لەئەخلاق دابڕا دەبێتە هۆكاری بەلأو موسیبەت لەبەرەبەیانی ڕۆژی ٦\٨\١٩٤٥ فڕۆكەیەك بۆمباكەی فڕێداو دوای تۆزێك تەقییەوە ، وابیسترواوە لەفڕۆكەوانەكە لەماوەی (٣)سێ دەقیقەدا یەك پارچە شارەكەبووەبەدووكەڵ بەبەرزایی (٣٠٠٠٠)سی هەزارپێ ، هێرۆشیماشارێكی جوان وفراوان بوو ، (٧٦)هەزارخانووی تیابوونزیكەی (٣٥٠٠٠٠)سێ سەدوپەنجاهەزاركەسیشی تێدا دەژیا ، دوای بۆمباكە ٦٣٪ی خانووەكان ڕووخان وبوون بەخۆڵ و(١٤٠٠٠٠)ی تیابرد ، لە(ناگازاكی)شدا(٥١٠٠٠) پەنجاویەك هەزارخانووی تیابوو نزیكەی (٣٠٤٠٠٠) سێسەدوچوارهەزاركەسیشی تێدادەژیا ٢٥٪ ی خانووەكان ڕووخان و(٧٤٠٠٠) حەفتاوچوارهەزاركەس مردن و (٢٠٠٠٠)بیست هەزاركەسی دیكەش توشی نەخۆشی جۆراوجۆربوون۰

كردوكاوڵكارییەكەی لەخزمەتەكەی زیاتربوو۰ یەكەم حالەتی كوشتن لەجیهاندا ڕووی دا ، ئەوەبووكە (قابیل) (هابیل)ی برای كوشت ، لەداروبەردوكوتەك بووبە(مەنجەنیق) وئەوجا شیروخەنجەریان بەكارهێناوە۰ لە(٧٣٨)پێش میلاد ، جەنگ بەكەشتی دەریایی داهاتو وە ، لە(١٣٥٠)پاش میلاد تۆپ وگوللە تۆپیان دروستكرد لە(١٤٢٥) تفە نگ دروستكراوە ، تۆپ لەوەختی خۆی دا ئاسنێكی كلۆربووە پڕپانكر دووەلەباڕووت لەبەردی خڕخڕتەقاندوویانە ، سوڵتان (محمدی فاتیح )كەدەوری(قوستەنتینیە- ئەستەمبووڵ)ی گرت تۆپی گەورە بە(١٠٠) سەد (گا) ڕایانكێشاوە،ئەندازیارێكی (مەجەڕ)ی تۆپێكی بۆسوڵتانی ناوبراودروستكردلەكاتی گرتنی (قوستەنتینیە) ، ناویان نا(هاونا)۰ جاران باوەشێنی دەست گرینگی خۆی هەبوو ، پاشاكان خزمەتكارێكیان هەڵدە بژارد باوەشێنیان لێبكات ، بەلأم دوای ئەوەی زانست بەرەوپێشچوو باوەشێنی كارەباییان داهێنا پێویست بەباوەشێنی دەستی نەماوزانست بووە خزمەتكاری مرۆڤ۰

**بەڵگەکانی بوونی خوا (جل جلالە) :**

**یەکەم :**

**خانوێك بۆخۆی دروست نابێ،ئەگەریەکێك بڵێ ئاوهات لەگەڵ گڵ تێکەڵ بووکردی بەقوڕوئەویش لەقالب دراوبووبەخشت،خشتەکەش لەخۆڕاچووەناوئاگروخشتەکەبووبەکەرپووچ وئەم کەرپووچە خۆی بەخۆی لەسەریەك دانراوڕیزبەڕیزڕێکبووقوڕیش خۆی بەخۆی چوو ە ناوڕیزەکانیەوە بووبەم خانووە ، خانووەکە بەبێئەوەی هیچ وەستا یەك دیواری بکات ، بەبێئەوەی هیچ ئەندازیارێکیش خەریتەی خانو وەکە بکێشێ،ئەگەریەکێ ئاوابڵێ بێگومان بەشێتی ئەزانن وگاڵتەی پێدەکەن٠**

**دووەم: قورئان باسی زۆرشتی غەیبی کردووە،ئەم جۆرە باسانەش مرۆڤ نایزانێ ، یان ناتوانێ بیڵێ لەترسی ئەوەی ڕاست دەرنەچێ ،بۆنموونە لەقورئاندا هاتووە ئەبولەهەب دۆزەخییە لەوکاتەی کە ئەبولەهەب لەژیاندابوو ، ئایەت هاتەخوارەوە ، ئەگەرقورئان لە پێخەمبەربالەوانەیە ئەبولەهەب لەڕکابەری ئەم قسەیە ئیمانی هێنابا بۆئەوەی ئەم سوڕەتەبەدرۆبخاتەوە ، بەڵام چونکە ئەم قورئانە لەخواوەیە خواش غەیبزانە ، یاخوودئەودەکەسەی موژدەی بە هەشتیان پێدراوە ، ئەگەریەکێك لەوانە پاشگەزبووباوە٠**

**سێیەم :**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)باسی میحراجی گێڕایەوە بێ بڕوا کان داوایان لێکردتەعریفی (بیت المقدس)یان بۆبکات ، ئەویش تەعر یفی بۆکردن ، هاتن پرسیاری ڕێگەکەیان لێکرد فەرمووی : سێ کاروا نی ئێوەم دیت ، یەکەمیان کاروانی فلانە تیرەبووکەلەفلاًن شوێن بە لایانداتێپەڕیم کاروانەکەلەدەنگی پێی بوراق سلەمییەوە ، وەیەکێك لەحوشترەکانیان وێڵ بوو ، دووەمیان : کاروانی فلاًنەتیرەبوولەفلاًن شوێن توشیان بووم وشترێکیان دووتای بەسەرپشتەوەبوو، یەکێکیان ڕەش وئەوی تریان سپی،وشترەکان سلەمینەوە،کاروانەکان کەگەیشتنە مەککە ئەم پرسیارانەیان لێکردوتیان : هەمووی ڕاستە٠**

**چوارەم : بەڵگەی ڕێك وپێکی بوونەوەر**

**ئیمامی غەزالی (٤٥٠ – ٥٠٥ ھ) لە** (الحكمة في مخلوقاة الله) **، دەڵێ : (خوای تەعالا ئاسمانی دروستکردووە ، ڕەنگەکەی جوانترین وباشتر ین ڕەنگە بۆچاو ، تەماشاکردنی سەوزوشین لەگەڵ چاوتەبایە،مرۆڤ لەبینینی ئاسمانی بەرین وبالاً خۆشی وئاسودەیی ڕووی تێدەکات بە تایبەتی کاتێك ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوە ونوری مانگ دەردەکەوێ خوای گەورە فەرموویەتی : (**والسماء ذات الحبك) الذاريات : ٧ **وتراوە مانای (الحبك)واتا ڕێگاکان ، هەروەهاوتراوە مانای خاوەنی جوانی دەگەیەنێت٠ کاتێك خوای تەعالا شەوی کردووە بەساردکردنە وەی هەواوئارامی وسوکنایی ژیان ، نەیکردووە بەتاریکستان وهیچ ڕۆشناییەکی تێدانەبێت ، ئەوکاتە نەدەتوانرا هیچ جۆرە کارێك لەشەو ەزەنگ دا ئەنجام بدرێ ، چونکە لەوانەیە مرۆڤ پێویستی بەهەندێ کارهەبێت لەشەودا ، بەهۆی پێویستییەکەوە ، یان بەهۆی نەبوونی کات لەڕۆژدا هەندێ جاربەهۆی گەرمای زۆرەوە خەڵکی بەشێك لەکاروبارەکانیان دەخەنەشەو،ئەمانەوچەندین هۆی تر، ڕۆشنایی**

مانگ لەشەودابۆهەمووکارەکانی شەویارمەتیدەرن ، هەروەها بەشێك لەتیشکی هەسارەکان کۆمەکی مرۆڤ دەکەن ، هەسارەوئەستێرەکان بەجوانی بۆئاسمان ئاسودەیی بەخەڵکی دەبەخشن،هەروەهامرواری خوای گەورەلەناوقاوغی (گوێکچە ماسی)دا خولقاندوویەتی ، خوای گەورە خواردنەوەی ئاوی لەکاتی پێویست دا خۆش وبەتام کردووە ، مرۆڤ لەخواردنەوەی دا هەست بەئاسوودەیی وئارامی دەکات، ئەگەرتێنوێتی زۆربێت هەمووگەنجینەی دنیاتۆخاوەنی بیت بۆبەدەستهێنانی ئەوقومە ئاوەدەیبەخشی، ئاوپیسی جەستە لادەبات وچلك وچەپەڵی لەپۆشاك وجل وبەرگ دەکاتەوە، بەئاوخوڵ وخاك دەبێت بەقوڕولەدروستکردنی خانووپیشەسازی دا بەکاردەهێنرێت، کڵپەی ئاگربەئاودەکوژێتەوە ، گەرپاروێك لەقورگ دا گیرا ئاوپاڵی دەنێت وکەسەکە لەمردن قوتاردەکات ، هەروەها بەئاوماندووبوون لەجەستە دەردەچێت ودوای خۆشوشتن ئاسودەیی وپشودان ڕووی تێدەکات پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:(خۆشترین خانەیەك موسوڵمان تێی بچێت بریتییە لە گەرماو(حەمام) ، ئەگەر کەسێك تێی چوو باداوای بەهەشت لەخوابکات وپەنای پێبگرێت لە ئاگر)اخرجه البیهقی ، ئیبن حجروتوویەتی : (صحیح موقوف)ە (بڕوانە : ابن قیم الجوزی ، الوابل الصیب ، وەرگێڕانی : عبدالکریم فتاح )خوای گەورە چاوی بۆبینین دروستکردووە ، چاوی بەحەوت توێژاڵ دروستکردووە،هەرتوێژاڵێك سیفەت وشێوەی تایبەت بەخۆی هەیە ، گەریەکێك لەوتوێژالانە تیابچێ مرۆڤ بینین لەدەست دەدات سەرنجی شێوەی پێڵوی چاوبدە کەدەوری چاوی داوە ، چاولەتەپ و تۆزو هەرشتێکی تری زیانبەخش دەپارێزن،پێڵوەکان وەك دەرگا وان لەکاتی پێویست دادەکرێنەوە ولەکاتی ناپێویست دا دادەخرێن ، جگە لەپارێزگاری چاومەبەستی جوانی چاوو ڕوخسارلەپێلوەکاندا هەیە ، بۆیەبرژانگەکان بەئەندازەیەکن ئەوەندە زۆروکەم نین زیان بە جوا نی چاوبگەیەنن٠ دووبرۆی پشتی چاوی کردووە بەجوانی بۆڕوخسار ی مرۆڤ،پاشان سەرنج بدە لەدەم وزمان ئەونهێنییانەی تێیدایە ، دو ولێوی کردووە بەدوودەرگالەکاتی پێویستدا دەکرێنەوە داپۆشەری پووك وددانە،تاکوجوانیش بدەن بەڕوخساری مرۆڤ،دوولێوبۆقسەکردن زۆربەسوودن، زمانیش بۆقسەودەربڕینی ئەوەی لەناخی مرۆڤدایە ، پاشان ددان بەژمارەی جۆراوجۆر هەموویان یەك پارچە ئێسك نین، تاکوئەگەردانەیەکیان تیابچێت دەتوانیت سوود لەوانی تروەربگرێت ددانەکان بۆبڕینی خواردن وجوانی پێشەوەی دەمە ، بۆیەخوای گەو رە ڕەنگەکانی سپی کردووە لەگەڵ رەنگی سووری پووك لەدەورووبە ریان،خوای گەورە لووتی بەرزکردۆتەوە شێوەیەك جوانی بەڕوخسار بەخشیوە ، هەروەها دووکونی تێدا داناوە ، تاکولەبۆنی خۆش وگولاّ وچێژوەربگرێت ، هەروەها نینۆك دەبنەجوانی بۆسەری پەنجەکان ، شتی وردیان پێ هەڵدەگرێت کەپەنجەکان بەبێ نینۆك پێیان هەڵنە دەگیرا،هەروەها بۆخورانی جەستە لەکاتی پێویست دا ، هەروەهاپێیە کانی بەپەنجە جوانکردووە بوون بەجوانی وهێزبۆڕۆیشتن پەنجەکا نیشی بەنینۆك ڕازاندۆتەوە وبەهێزی کردوون،پاشان ملی لەحەوت بڕبڕەی شێوەبازنەیی ناوبۆش پێکدێ٠ کاتێك گەورەدەبیت لەڕوخسا ریدا موو دەڕوێت ، تاکولەمنداڵ وئافرەت جیاببێتەوە ، بەمووانە جوانی دەکات

ونەبوونی لەئافرەتیش دا ، تاکوجوانی وگەشاوەیی بە ڕوخساریان بدات وپیاوان ببزوێنن ، ئەمەش بۆڕوودانی زەواج وبەر دەوامی نەوەکانی٠ سەرنجی دروستکردنی ڤژونینۆك ودرێژبوونیان بدە لەکورتکردنەوەیان دا بەرژەوەندی مرۆڤ بوونیان هەیە ، خودا (جل جلاله) وای دروستکردووە هەستیان تێدا نەبێت ولەبڕینیان دا هیچ ئازارێك بوونی نەبێت٠ ئەگەرلەبیرچوونەوە نەبوایە هەرگیز مرۆڤ لەموسیبەتەکان دا سەبووری نەدەهات وبەهەمیشەیی لەحەسر ەت وئێش وئازاردادەبوو٠ ئەگەرحەیا نەبوایە مرۆڤ پشتی لەخراپە هەڵنەدەکردو دەستبەرداری نەدەبوو٠ بەهۆی هیواوئاواتەوە دنیائاوە دان دەبێتەوەونەوەی مرۆڤ بەردەوام دەبێت ، ئەگەرمرۆڤ ڕۆژی مردنی خۆی بزانیبایە تامی ژیانی نەدەکرد ، بەئاوەدانکردنەوەی زەوی ئاسوودە نەدەبوو،هەروەها نەزانینی ماوەی تەمەن ترس لەلای مرۆڤ دروست دەکات لەهێرشی مردن لەهەرکاتێك دا ، بەڵام ئەگەربیزانیبا یە تەمەنی درێژە لەحەزوئارەزووخراپەکاری ڕۆدەچوو) ، هەروەها (نیزامەددین عەبدولحەمید) لەکتێبەکەی دا : (خودای بەرزی میهرەبان) دەڵێ:(مرۆڤ بەفیتڕەت هەست دەکات دەبێ ئەم هەمووکائیناتە دروستکەرێکی هەبێ ، مرۆڤ تەماشادەکات چاوەکان لەقولایی دایە ، ئەگەروانەبوایە چاوەکان زۆرزەق وناشیرین دەردەچوو ، جگەلەوە هەمووکاتێك نزیك دەبووتوشی زیان بێت ، هەروەهاهەرچاوێکی برۆیەکی بەسەرەوەیە ئەمەش جگەلەوەی جوانییەکەی ، چاویش دە پارێزێ لەتۆزوباوئەوئارەقەیەی کەبەناوچاوانی دێتەخوارەوە،ناهێڵێ چاوئەزیەت بدات،ئینجا ئەم هەمووڕێکخستن وڕێك وپێکییە ، دەبێ لەخۆیەوەبووبێت ، یان خوایەکی تاك وتەنیا ئەم هەمووڕێك پێکییە ی دامەزراندووە ؟)

پێنجەم : شێوەوشێوازی قورئان

ئەگەرلەقورئانی پیرۆزوردبینەوە ، دیاردەیەکی بەرچاولەبارەی شێو ەوشێوازی قورئان بەدی دەکەین ، جیاوازی شێوازی قورئان لەگەڵ فەرموودەکانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەڵگەیەکەقورئان سروشی خوایە ، جائەگەرقورئان دانراوی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بوایە دەبوایە لەگەڵ شێوازی فەرموودەکانی خۆی جیاوازی نەبوایە٠ (بڕوانە: تەفسیری خاڵ)

شەشەم : ئیعجازی قورئان

(شێخ محەمەدی خاڵ) ، دەڵێ:(مەبەست لە(ئیعجاز) دەتەوسان وداماو کردنەلەکارێکداوەك بەیەکێك بڵێی:شاخی گوێژەم بەکوڵ بۆهەڵبگرە دیارەکەناتوانێ هەڵیبگرێ٠ ئەم ئایەتە:(والخيل والبغال والحميرلتر كبوها وزينة ويخلق مالاتعلمون) النحل : ٨

واتا : ئەسپ وئێستروگوێدرێژمان بۆدروستکردوون،تاسواربن وبن بەمایەی جوانی وەشتی واتان بۆدروست دەکات کەئێستانایزانن)، دەڵێ : لەدوای هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەبە(١٣٠٠) ساڵ فڕۆکەوئۆتۆمبیل وشەمەندەفەروپاپۆڕی گەورەوگەلێ شتی ترکەمرۆڤ بەکاری بێنێت بۆسواربوون وجوانی وگواستنەوە) ، هەروەهادەڵێ:(جاران وادادەنرا کەنێرومێ تەنیالەناومرۆڤ وگیانلەبەران هەیە ، بەڵام دارودرەخت وگژوگیا

هەموونێرومێیان هەیە (ومن کل الثمرات جعل فیها زوجین اثنین ) رعد : ٣ واتا : (خوا (جل جلاله) لەناوهەمووجۆرە بەرداریکدا نێرومێی دروست کردووه) ، لەپاشان زانایان بۆیان دەرکەوت کەتەنانەت کارەبا نێرومێی هەیە ، وەبەیەکگرتنی ئەم دووانە تەوژمی کارەباپەیدادەبێ (ومن کل شیء خلقنازوجین) ذاریات : ٤٩ واتا : (نێرومێمان لەهەمووشتێکدا دروست کردووه) ، زانای بەناوبانگ (فەرەنگلین) لەساڵی (١٧٥٢) دۆزییەوە کەهەور کارەبای تێدایەهەورێك کەهەرکارەبای گەرم،یان هەرکارەبای ساردی تێدابێ ناباریت ، بەلاَم کەخوای تەعالابیبارێنێ بەهۆی باوە وەئەو پارچەهەورانەی کەکارەبای گەرم وساردیان تێدایەلیکیان نزیك دەخاتەوە تاتیکەڵیان دەکات وکارەباکانیان موتوربەدەبن ئەوکات دەست دەکات بەبارین ، وەك لەئایەتی (٢٢)ی سورەتی (حجر) داها تووە : ( وارسلنا الریاح فأنزلنامن السماء ماء فأسقیناکموه )

**لەبارەی سیاسەت :**

لەبارەی پێناسەی سیاسەت، (موسوعە لسان العرب)،دەڵێ:(سیاسەت کردن بریتییەلەرێکخستنی کاروباری دەوڵەت ، سیاسییەکانیش ئە وانەن سەرکردەی گەلانن وکاروباری خەڵك ڕێکدەخەن ودەیبەن بەرێوە)، ئەم پێناسەیەدەکرێ هەندێ وشەی تری بۆزیادبکەین تاکو پێناسەیەکی تەواووگشتگیری لێدەربچێ ، واتائەمەشی بۆزیادبکرێ یاخودئەوانەی ململانێ لەسەربەدەستهێنانی دەسەلاَت دەکەن٠ وشەی سیاسەت لەڕووی زمانەوە دەگەڕێتەوە بۆوشەی (سوس)٠ کەواتەمانافەرهەنگییەکەی سیاسەت لەوشەیەکی دیاریکراووەرگیراوە ، کە (سوس)بەواتای (بەرێوەبردن) دێ ، هەروەك وشەی (مؤمن) لەزماندا بەواتای کەسێك لە(ئەمن)دابێت،بەلاَم بەواتای ئەوکەسەدێ کەباوەڕی بەئاینی ئیسلام هێنابێت٠ الزمخشری (لە ٥٣٨ ی کۆچی مردووە)،دەڵێت:(ئەگەرکەسێك کۆمەڵێ ئاژەڵ ڕێکبخات،دەوترێ سوسیان دەکات) ، کەواتە وشەکەلەڕووی زما نەوە بەواتای ڕێکخستن دێ٠

لەمێژووی جیهاندا ململانێ لەنێوان دووبرا ، یان سێ برا لەسەردە سەلاَت زۆر ڕوویداوه ، وەکوململانێی نێوان (ئەمین ومەئموون) لە دوای کۆچی دوایی هارِوونە ڕەشیدی باوکیان تاکارگەیشتەئەوەی(مەئموون)جەنگ لەدژی (ئەمین)ی برای ڕابگەیەنێ وبەکوژرانی (ئەمین) لەسەردەستی سەرۆك سوپای (مەئموون) کۆتایی هات٠ خوای گەورەباسی تاقیکردنەوەی حەزرەتی سولەیمان دەکات،( ولقد فتنا سلیمان والقینا علی کرسیه جسدا ثم اناب قال رب اغفرلي وهب لي ملکا لاینبغی لاحد من بعدی انك انت الوهاب ) ص : ٣٤ — ٣٥ واتا : (بێگومان (سولەیمان)مان تاقیکردەوە وتەرمێکی مردوومان خستەسەرکورسی دەسەلاَتەکەی بۆئەوەی تێبگات کەکورسی ودە سەلاَت بۆکەس نامینێت ، پاشان ئەویش زۆربەزوویی تۆبەی کر دووفەرمووی : ئەی خوداوەند لەوتاوانەم خۆشبەودەسەلاَتێکم پێببەخشە کەپاش من بەهیچ مرۆڤێك نەدرابێ ، چونکە بەڕاستی تۆخوایەکی زۆربەخشندەی)٠

ناصری سوبحانی دەڵێ:(ئەگەربەوردی سەیری ئەم ئایەتەبکەین ، بۆمان دەردەکەوێت کە حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێ) هەندێك خۆشەویستی دەسەلاَت وسەرمایەی کەوتبووە ناودڵیەوە ،

لەبەرئەوهۆیە خوای تەعالا تەرمێکی خستە سەرکورسی دەسەلأتەکەی ، کەکاتێك ئەودیمەنەی بینی بیری کردەوەکەبێگومان ئەویش دەمرێ وئەوسەرمایەودەسەلأتەبەجێ دەهێلێ ، بۆیەتەوبەی کردو داوای لێخۆشبوونی لەخوای تەعالاکرد ، خوای گەورەش تۆبەکەی لێ قبوول کردو خۆشەویستی دەسەلأتیشی لەدلی سڕیەوە ، دەسەلأتی بەهۆکاروئامرازێك دەزانی بۆئەنجام دانی واجبەکان وبەندایەتی بۆخوای گەورە) فارابی پێی وایە ئەوکەسەی دەبێتەفەرمانڕەوا ، دەبێ دوازدەخەسلەتی تێدابێ ، هەندێك لەوخە سلەتانە :

ئەندامەکانی لەشی کەم وکوڕی تیانەبێ ، ئاستی تێگەیشتنی باش بێت ، زیرەك بێت ، گوتارودەربڕینەکانی جوان بێ ، هتد لەکۆندا فەرمانڕەوادەبوایە سواری ئەسپێك بێ وبەپێش سوپاکەی بکەوێ وخۆی بەشداری شەڕەکان بکات ، ئەمانەچەندخەسلەتێك بوون بۆئەوکات زۆرپێویست بوو ، بەلأم ئێستائەوخەسلەتانەبەمەرج نازانرێ ، بەلکوهەربیریشی لێناکرێتەوە٠ ماکیاڤیلی لەوبڕوایەدایە ، چوارڕێگەهەیەبۆگەیشتن بەدەسەلأت :

١ – ئەوفەرمانڕەوایەی کەبەهێزوتوانای خۆی دەگاتەدەسەلأت٠

٢ – گەیشتن بەدەسەلأت لەڕێگەی بەختەوە٠

٣ – گەیشتن بەدەسەلأت لەڕێگەی یارمەتی وەرگرتن لەهاولأتیانەوە٠

٤ – گەیشتن بەدەسەلأت لەڕێگەی تاوانکردنەوە٠ لەتوێژینەوەیەکدا کەقوتابی ماستەر(تواناعوسمان محمدامین) لەبەشی کۆمەلناسی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین سالی (٢٠١٧) ئەنجامی داوە ، بەناونیشانی( ڕۆلی بەهاکۆمەلأیەتییەکان لەڕێکخستنی کۆمەلگا) لەبارەی شێوازەکانی سیستەمی حوکمڕانی بەڕێژەی( ٩،٤١٪ ) پێیان وایە هەرسیستەمێك بێت گرینگ ئەوەیە خۆشگوزەران بێت ، ( ٨ ,٣٤٪) پێیان باشە سیستەمی کۆماری بێت وچوارسالْ جارێك سەرۆك بگۆڕدرێت ، ڕێژەی( ٨ ,١٤٪ ) پێیان باشە سەرکردەیەکی بەهێزحوکمی ولإت بکات دادپەروەربێت وماوەی دیارینەکراوبێت ، ڕێژەی ( ٥, ٨٪) پێیان باشە سیستەمی پاشایەتی بێت ، دەبینین زۆرینەی ئەندامانی نموونەی توێژینەوەکەسیستەمێکی دیاریکراویان لاگرینگ نییە ، گرینگ ئەوەیەخەلکی بەباشی بەڕێوەببڕێن گرینگ نییەچ سیستەمێك بێت٠

وتراوە :(بەدرۆی پیاوی گەورە دەلێن : سیاسەت ) ، لەدنیای سیاسەت دادرۆکردن زۆرەهەندێ جارپیاوانی سیاسی لەبەلێننامە نوسراوەکا نیش پاشگەزدەبنەوە ، (سەیدڕەزای دەرسیمی) کەبۆوتووێژبانگکرا بوولەسالی (١٩٣٧)لەسەرمێزی وتووویێژلەلایەن حکومەتی تورکیاوە دەستگیرکراوخرایە زیندانەوەولەسێدارەدرا٠ ئینگلیزەکان وفەرە نسییەکانیش دەیانووت : بۆئاوەدانکردنەوە (استعمار) هاتووین! لەتوێژینەوەیەکدا کەقوتابی ماستەر(توانا عوسمان محمدامین) بەناونیشانی : (ڕۆلی بەهاکۆمەلأیەتییەکان لەڕێکخستنی کۆمەلگا) لەسالی (٢٠١٧) لەبەشی کۆمەلناسی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین ئەنجامیداوە لەبارەی شێوازوجۆرەکانی سیستەمی سیاسی ، ڕێژەی( ٤ ,٣٠٪ ) سیستەمی فرەحیزبییان پێباشە ، ڕێژەی( ٥, ٢١٪) سیستەمی تاك حیزبییان هەلبژاردووە ، (٤ ,٢٠٪) هیچ یەکێك لەم سیستەمانەیان پێباش نەبووە ، ڕێژەی (

**٣ ,١٣٪ ) سیستەمی سۆشیالیستییان پێباشەرێژەی ( ١, ٨٪) سیستەمی دووحیزبییان پێباشە ، ڕێژەی ( ٣ ,٦٪) سیستەمی دیکتاتۆرییان پێباشە ، لیرەدا لەبارەی سیاسەت ئاماژە بەدیدوبۆچوونی هەندێ لەزانایان دەکەین : (موریس دوورژە) لەکتێبەکەیدا : (بنەماکانی زانستی سیاسەت) سیاسەتی بەهونەری کاروحوکمڕانیەتی کۆمە لگەی مرۆڤایەتی زانییوە ، هەرهەمان نوسەرلە (کۆمەڵناسی سیا سی)دا نوسیویەتی : یەکێك پێی وایە کۆمەڵناسی سیاسی زانستی دەوڵەتەویەکێك بەزانستی دەسەڵاتی لەقەلەم داوە٠ کتێبێکی تر ، "ئەندرۆوینست" بەناونیشانی : (تیۆرەکانی دەوڵەت)لەم کتێبەدا لەبارەی سیاسەت دەڵێ:(زانستی سیاسەت بەمانای وشە زانستێکە لەدەوڵەت دەکۆڵێتەوە) محەمەدخاتەمی"لەکتێبەکەی دا : (لەدنیای شارەوە تاشاری دنیا) ، کەوەرگێڕدراوەتەسەرکوردی ، لەبارەی هۆکا رەکانی بەجێهێنانی فەرمان ، کۆمەڵێ فاکتەری دیاریکردووە :**

**یەکەم : ترس**

**ترس گرینگترین هۆکاری زاڵبوونە بەسەرکۆمەلگای مرۆڤایەتی٠**

**دووەم : فاکتەری باوەڕ**

**کەبریتییەلەباوەڕی خەڵکی ، هیچ حکومەتێکیش ناتوانێ تەنیاپشت بەفاکتەری ترس ببەستێ ، ئەگەرفاکتەری باوەڕی لەگەڵدانەبێ٠**

**ئەگەرسەیربکەین وشەی سیاسەت بەپێی بەکارهێنانی لەلایەن خەڵکییەوەواتای دیکەی وەرگرتووە : (درۆ ، فرۆفێڵ ، ٠٠٠ هتد) بۆنموونەشاعیر(ئەحمەدموختارجاف) دەڵێ :**

**ئیسمی ویجدان و عەدالەت بێ موسەممایەودرۆ**

**بۆسیاسەت ئەم قسەکەوتۆتەسەرلێوانەوە**

**لەم سیاقەشداوشەی سیاسەت واتای فرۆفێل دەدات بەدەستەوە٠ سەبارەت بەوەی ئایاکەسانی کاربەدەست گەنج بن یان بەتەمەنهەندێك پێیان وایەئەوەی گرینگەئەوکەسەتاچەندلێهاتووە وتوانای کارکردن وشارەزایی هەیە ، هەندێکیش پێیان وایەبەتەمەن بێ چونکەبەڕای ئەوانەکەسانی بەتەمەن بەئەزموونترن لەکەسانی گەنج بۆیەشارەزاترولێهاتووتریشن٠ئەفلاتون دەڵێت : ((کۆمەلگەلەمێگەل پێکهاتووە دەبێت شوانێکیان هەبێت))٠دەستەواژەی شوان ورەعییەت بەتایبەتی لەکلتوری سیاسی خۆرهەلاتدا زۆرباوە ، مانای وردوڕۆحی حەقیقەتی سیاسەت وحکومەت پیشاندەدات٠**

لەبارەی کۆن ونوێ :

کۆن ونوێ ئەودووچەمکەن کەزۆرمرۆڤیان خەریك کردووە ، هەیەدەمارگیری زۆری بەرامبەربەکۆن هەیە وهەشەتوندباوەشی پێداکردووەوهەمووتازەیەك ڕەتدەکاتەوە٠مەرج نییەهەمووکۆنێك خراپ بێت وهەمووتازەیەك باش بێت چەندڕستەوقسەی سوقرات وئەفلاتوون وشکسپیرهەیەهەرچەندەکۆنیشن کەچی هێشتاتازەدەردەکەوێت وپچڕانی شیرازەی خێزان کەئەمڕۆلەکۆمەلگەی ڕۆژئاواباوەتازەیەکەچی خراپیشە٠

١ – ئەگەرسەیری داب ونەریتی کوردەواری لەکۆندابکەین ، ئەگەرنموونەی هاوبەشیکردنی خەلکی لەخەمناکی لەکۆندادەبینین بەمردن وگیانلەدەستدانی یەکێك خەلکی ئەودێیەی کەکەسەکەی لێ کۆچی دوایی کردووە ڕادیۆیان پێنەدەکرد،کەئەمەش نیشاندانی هاوسۆزی وهاوخەمی وڕێزلێگرتنە٠بۆنموونە (شیوەغەریبە) کەئێستابوونی بۆتەدەگمەن ونەماوە بەلام ئێستائەگەرلەپرسەکەشی ئامادەبێ بەلام ڕۆحی هەرەوەزکاری ویارمەتیدان نەماوە ، بەلام پێشترچێشت وخۆراکیان ئامادەدەکرد دەچوونەمالی خاوەن پرسەکەلەگەل ئەوان وکەس وکاری دەیانخوارد٠

٢ – لەکۆنداهەبووبڕوانامەی شەشی سەرەتایی هەبووکەچی زۆرسەرکەوتوبوولەوانەوتنەوەدا ، بەلام ئێستادەرچووی کۆلیژەکانیش وەك پێویست ناتوانن دەرس بلێنەوە٠

٣ – بەلام لەڕووی سیاسییەوەئەگەربمانەوێ بەراوردێك لەنێوان ڕابردووئێستابکەین،لەڕابردوودامرۆڤ نەیدەتوانی بیروڕای خۆی دەربڕێ ئەگەریش بیروڕای خۆی بوتبایان دەچووە بەرپەتی سێدارەیان دەچووەکونی زیندان٠(س)دەلێ : ئێستادەتوانم زۆربەئازادانەبیروڕای خۆم دەربڕم٠(ك)دەلێ : جاران هیچ کاتێك هەستمان بەئارامی نەدەکردکاتێکیش ترس نامینێ ژیان ئاسوودەدەبێ(ب)دەلێ : قەت ئێستاوجاران بەراوردناکرێ ئێستابێ ترس دەتوانم بیروڕای خۆم دەربڕم٠

٤ – حەمدی (١٨٧٦ – ١٩٣٦) سەبارەت بەڕۆژگاروسەردەمەکەی ئاوەژووبوونەوەی هاوکێشەی ژیان لەنێوان مرۆڤی نەفام و نەزان لەگەل مرۆڤی داناوزانا واتائاست نزم وئاست بەرز،کاتێك کەسانی بەتوانادەبن بەژێردەست و هیچ حیسابێکیان بۆناکرێت کەچی کەسانی نەزان دەبن بەسەرداروسەروەردەلێ :

هەرنالەوالەبورجی جەلالەوەکوهیلال

هەرماهەوالەکونجی مەلالەلەنال ئەچێ

هەروەها(میهری) دەلێت :

بێ حەیایی و بێ وەفایی عالەمی داگرتووە

هەرچی بێ فێل بێ بەجارێ دل بەدەردومیحنەتە

هەروەکوچێشت چۆن بەبێ خوێ ناخورێت وناکرێ

بێ درۆئەمڕۆکەقسەبێ فەڕوبێ لەزەتە

شاعیرباسی زەمان ورۆژگاری دەکات کەوای لێهاتووە قسەبەبێ درۆکردن هیچ تام وبۆێکی نییەوکەسیش گوێی بۆناگرێت گەرهاتوودرۆی تیانەبێت٠هەروەهادەڵێ :

ئەم دنیایەبێ وەفایە  بێ شەرت وبێ بەقایە

پرجەوروپرجەفایە  پرشۆر و پرغەوغایە

پرحوزن وپرهەرایە  پردەردوپربەلأیە

بۆکەس نییەبەئیتلاق  غەیرەزجەنابی خلاق

ئەووەلی هەرحەسرەتە  ئاخیری هەرنیقمەتە

کێ لێ بووساحێب مراد  کێ لێ دەرچووبەدلشاد

هەروەهادەڵێ :

هەرچی ئەیبینی لەسەرئەرزلەزادەی بەشەرە

لای داوە لەرێگەی حەق وچاوی لەزەرە

مەشغولی هەتیوبازی ومێ بازی وئەنواعی شەرە

بەشەوورۆژخەریکی مەیەوشوشەی لەبەرە

٥ - گیانی دراوسێیەتی :

عەرەب دەڵێ : ((الجارقبل الدار))واتا : ((دراوسێ بەرلەخانووەکە))٠کاتێك یەکێك خانوێك یان پارچەزەوییەك دەکرێ پێویستەبایەخ بەوەبدات کێ دراوسێیەتی٠ئەم نەریتەش رووی لەلاوازی کردووە٠

٦ - کۆمەڵێك منداڵی گەرەك جەماعەتێکیان دروست دەکردبۆئەوەی شەرلەگەڵ جەماعەتی گەرەکەکانی دیکەبکەن ، لەوشەرانەش بەردبەکارهاتووە هەندێ جارچەقۆش بەکارهاتووە٠ئەونەفامانەهەربەوەندەوازیان نەدەهێنابەڵکوگێچەڵیان بەرێبوارەکانیش دەکردهەندێ جارپارەشیان لێ دەستاندن ئەمەش لەتێروانینی ئەوان بەڵگەی ئازایەتی بو وە٠

٧ -  نەریتێکی ترکاتێك ئاوپێشکەش میوان دەکراهەمووی لەیەك پەرداخ ئاویان بۆتێدەکرا ، ئەمەش زیانی بۆتەندروستی هەیەوادەکات نەخۆشی بلأوببێتەوە٠

٨- بەزۆربەشوودان وهاوسەرگیری زۆرەملێ :

ئاشکرایەپرۆسەی هاوسەرگیری بەرەزامەندی هەردوولاپێکدێت،هەندێك جارکچان لەمنداڵییەوەبەناوی کەسێکەوەمارەدەکرائەمەش دەرەنجامی باشی نەدەبوو٠

٩ — سەبارەت بەشوکردنەوەی ژن بەپیاوێکی دیکەبۆماوەیەکی کورت بۆئەوەی هاوسەری پێشووی بتوانێت مارەی بکاتەوە ، لەرابردوودایەیرەودەکراکەئەمەئەوپەری سوکایەتی بەخۆکردنە٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)نەفرینی لەونەریتەکردووە بەفەرموودەی

(لعن اللەالمحلل والمحلل له)واتا : (نەفرینی خوا(جل جلاله)لەوکەسەی کەمارەبەجاش دەکات ولەوکەسەش کەبەناولێی مارەدەکات)٠

١٠— شیربایی :

یەکێك بوولەودیاردەناشیرن وباوانەی کۆمەڵگای کوردی لەڕابردووداماٶستا(ع) دەڵێ : ئەوپارەی وەکوشیربایی وەردەگیرێ حەرامەهەرچەندەبەومەبەستەش وەریگرتبێ تاکوبۆکوڕەکەی ژنی پێبێنێ٠

١١— پۆشاك :

پۆشاك لەبەرکردن بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی یەکێك بووەلەتایبەتمەندییەکانی مرۆڤ ، ئەگەرسەیری پۆشاك لەکۆمەڵگای کوردی بکەین گۆڕانێکی زۆرخێرای بەسەرداهاتووە ، جیاوازییەکی زۆری هەیەلەگەڵ ڕابردوودا٠پۆشاکی ئێستاناکەوێتەژێرکاریگەری شەرمکردنەوە ، پۆشاکی جاران درێژووپان وپۆربوو ، پۆشاکی ئێستاتەنکن ، تەسکن ، کورتن ، وێنەی تەواوی ئەندامەکانی تێدادەردەکەوێت ، ئەوانەش کەنەخشەی ئەم پۆشاکانەدەکێشن هەموویان لێهاتوون لەبواری دەروونناسی جنسی دا ، غەریزەی مرۆڤ دەجولێنێت ، ئەمەش لەئەخلاقەوەدوورە ، لەڕەوشتی مرۆڤایەتییەوەدوورە ، ئەوەی لەکۆمەڵگەی خۆرئاواییەوەدەبینرێت ئەوەئازادی نییە،ئەوانەژن بۆخراپکردنی کۆمەڵگەبەکاردێنن ، بۆخراپکردن وتێکدانی کۆمەڵگەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کارلەسەردووشت دەکرێت ، یەکێکیان ڕاگەیاندن ئەوی تربەکارهێنانی ژنە٠ئەمەش هەمووی سیاسەت کردنەبەجەستەی ژنەوەنەك پارێزگاری لەژن٠لەلایەکی تریش شێوەکانی جل وبەرگی ئەمڕۆی ئافرەتان بەزۆری لەشێوەی جل وبەرگی پیاوان دەچێ بەمەش لەشێوازی ئافرەتانەدووردەکەوێتەوەلەهەمووشی خراپترئەوەیەهەڵسوکەوت ومامەڵەشیان وەکوپیاولێبێ٠(غاندی)دەڵێ : ((شورەییەبۆ ئێمەجل وبەرگی ئینگلیزبپۆشین وداواشیان لێ بکەین ولاتەکەمان بەجێبێڵن))٠

برایەتی :

مەبەست لەوشەی برا دڵنیایی کۆمەلایەتی وخۆشەویستی وئاشتی وپێکەوەژیان ودادی کۆمەلایەتی ولێبوردەییە٠ برایەتی تەنیاتایبەتنییەبەپیاوانەوە ، بەڵکوئافرەتانیش دەگرێتەوە : برایەتی لەنێوانپیاوان ، خوشکایەتی لەنێوان ئافرەتان٠خوای گەورەفەرمویەتی : (انماالمؤمنون اخوة) واتا : (ئیمانداران برای یەکن) ئافرەتانیش دە

گرێتەوە٠هەروەهائەم فەرمودەیە : (لایؤمن أحدکم حتی یحب لاخیه مایحب لنفسه) رواه البخاری ومسلم والنسائی٠(ورجل ذکرالله خالیافافاضت عیناه) واتا:(پیاوێك ئەگەربەتەنیایادی خوای کردلەترسی خوافرمێسکی بەچاودابێتەخوارێ ولەبەرخوا(جل جلاله)بگری)٠ئافرەتیش دەگرێتەوە ، دیارەمرۆڤ کەبەتەنیابووکەس چاوی لێنەبووهیچ مانایەك بۆڕیانامێنێتەوە٠

**جۆرەکانی :**

**١– برای دینی : ئەوکەسانەی هاودینن دەبنەبرا** (انماالمؤمنون اخوة)الحجرات:١٠

**٢- برا : لەدایك وباوكێكن٠**

**٣-زڕبرا : لەدایك نەك لەباوك ، یان لەباوك نەك لەدایك٠**

**٤-برای شیری : منداڵێك ئەگەرشیری ئافرەتێکی تری خواردبێ لەگەڵ منداڵەکانی ئەوئافرەتەدەبێتەبرا٠**

**٥ – برای ئینسانی : پێشەواعەلی (خوای لێ ڕازیبێ) دەڵێ :** ((کل انسان نظیرلك في الخلق فاءنهم صنفان : اماأخ لك في الدین ، أونظیرلك في الخلق)) **واتا : ((هەموومرۆڤێك لەئەفراندندا وەك تۆوان ، مرۆڤەکان دەبن بەدووبەشەوە : یان برای ئاینی تۆیە ، یان برای ئینسانی تۆیە))٠چونکەخوای گەورەفەرموویەتی :** (یاأیهاالناس اناخلقناکم من ذکروأنثی)**الحجرات : ١٤**

**قانیع دەڵێ :**

**باسێ ڤات نەبێ خانووسەراکەت**

**پارەی ڤاتێکیان بدە بەبراکەت**

**دەوڵەمەندمەڵێ هەوڵی بۆخۆیە**

**نەبوونی برات نەبوونی تۆیە**

**دیارەبرایەتی تەنیاوتەیەك نییەبەدەم بوترێت ، یەکێك لەمەرجەکانی برایەتی هاوکارییە ، هەندێك کەس کەتۆپێویستت بەهاوکارییەهاوکاریت دەکات ، هەندێکی تردەبێ تۆداوای لێبکەی ئەوجاهاوکاریت دەکات ، هەندێك کەسیش ئەوەندەهەستیارەبێئەوەی تۆداوای لێبکەی خۆی هەستی پێدەکات دەزانێ کەتۆپێویستت بەهاوکارییەهاوکاریت دەکات ، بەلاْم هەندێکی ترئەگەرداوای یارمەتیشی لێبکەی نایەت بەدەمتەوە ، لێرەداهیچ واتایەك بۆمانای برایەتی نامینێت٠هەندێك کەسیش وەکودەرمان ئەگەرپێویستی پێت بووبەگەرم وگوڕییەوەبەڕووەڕووت دێ ، بەلاْم کەپێویستی پێت نەماناتناسێت ، هەروەکودەڵێ :**

**کەئیشم پێتەڕێم هەرلەڕێتە**

**کەئیشم پێت نەماپێت دەڵێم شێتە!**

**هەروەهالەکاتی شکست لەژیاندا ، کەیەکێك شکستی خواردخەڵك لێی دووردەکەوێتەوە٠**

**لەبارەی سوالکردن :**

**سوال بریتییەلەداواکردنی شت٠سوالکەرەکان ئافرەت ، پیاو ، گەنج ، پیر ، منداڵ ومێرمنداڵن٠ئاخۆمرۆڤ چەند بڕوا بەم ئیدیعایانەبکات : بێکەسم ، هەنیوبارم ، مەصدەری ژیانم نییە ، نەخۆشم پێویستم بەعەمەلیاتە،کرێچیم٠ئەمانەزۆرێك لەوشێوازانەی سوالکردن وداواکردنانەن کەژمارەیەکی زۆری**

سوالکەرەکان بەکاری دەینن لەبازاڕوکۆلأن وبەردەم مالأنداۥوشەی سوال ، بناغەکەی وشەی سوئالی عەرەبییە ، واتاداواکردنۥپێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی :(داواکردن دروست نییە بۆیەکێ لەم سێ کەسەنەبێ : پیاوێك خوێنێکی کەوتبێتە سەر دروستە سوال بکات ، تاخوێنەکەی دەست دەکەوێت ئیتروازبێنێت ، پیاوێکیش بەلأیەك ڕووی کردبێتە مالەکەی هەمووی تیاچووبێت دروستە سوال بکات ، هەتائەوەندەی دەست دەکەوێت پێ بژی ونە مری لەبرسان ، پیاوێکیش هەژاری ونەبوونی ڕووی تێکردبێت بەشێوەیەك سێ کەسی ژیرلەهۆزەکەی بلێن بەڕاستی فلأنەکەس بەتەواوی هەژاروبێدەسەلأتە ، ئەویش دروستە سوال بکات ، هەتا بژێوی دەست دەکەوێت ولەمردن دەگوزەرێ ، جگەلەم سیانە ئەی قبیصە، هەمووسوالێك حەڕامە وخاوەنەکەی بەحەرامی دەیخوات) ئیمامی موسلیم وئەبوداودونسائی ڕیوایەتیان کردووەۥناصرێ سوبحانی لەکتێبەکەیدا : (وانەکانی خواناسی) دەلێ : ((دیارەهەژاری (فقر)یەکێکەلەوهۆکارانەی کەپشتی ئینسان دەشکێنێ ، هەروەك خودی وشەی (فقر)لەگەلْ وشەی (فقرة) کەبۆبڕبڕەکانی پشت بەکاردێ هاوبەشن یەك ماددەن کەدەلێن لەبەرئەوەی هەژاری پشتی ئینسان دەشکێنێ))ۥهەرسەبارەت بەهەژاری ، خوای گەورە دەفەرموێت : (يحسبهم الجاهل أغنياءمن التعفف) البقرة : ٢٧٣ واتا : (هەندێ هەژارهەیەلەبەردەروونی بەرزی خۆی حەزناکات نزمی پیشانبدات ئەوانەی کەنەیناسن وادەزانن بارودۆخی زۆرخۆشەودەولەمەندە)ۥ

**لەبارەی شەرمکردن :**

دیارەشەرمکردن ڕێژەکەی جیایەلەپیاووئافرەت ، پەندێکی کوردی هەیەدەلێ : (ژنی شەرمن شارێك دەینێ ، پیاوی شەرمن شانەیەك ناینێ)لەئاینی ئیسلامداشەرم وحەیاپەیوەندی نییەبەپیاووئافرەت ئەوجیاوازییەی کەهەیەدەگەڕێتەوەبۆداب ونەریتی کوردەواریۥلای خۆشمان جۆرەتێکەلکردنێك هەیەلەنێوان شەرم لەگەلْ حەیاۥزۆرجارئەم ئیدیەمە (دەم لێك سپی بوونەوە) لەنێوان ژن ومێرد بەکاردێ لەکاتێکدا زۆرلەگەلْ یەکدی بلێن ، لەم بارەدا دەگوترێ دەمیان لێك سپی بۆتەوە واتا شەرمیان لەیەکتری شکاوە ، حیساب بۆڕێزگرتنی یەکتری ناکەنۥلێرەداشتێکی زۆرگرینگ هەیەزۆرجار کەناوی شەرم دێ وشەیەکی تریشی لەگەلْ دێت ، ئەویش وشەی (حەیا) یەۥبۆنموونە دەلێن : (فلأن کەس زۆر بەشەرم وحەیایە)ۥبەلأم هەندێك جارمرۆڤ ئەگەرشەرم بکات مافەکانی لەدەست دەدات۰شەرم بۆمرۆڤ بەگشتی ئەگەرلەڕووی ڕێزگرتنەوەبێ باشە ، بەلأم شەرمی لەڕاددەبەدەردەبێتەهۆی لەدەستدانی مافی خاوەنەکەی بۆنموونەئەگەربیانەوێ غەدرێکت لێبکەن لەڕووی پارەخواردن ، یاخودکاتێ داوای شتێکت لێبکەن بۆخۆت پێویستت پێبێت وحەزناکەی بیدەیتێ ، بەلأم لەشەرمان بیدەیتێ ئەواشەرمکردن لەوحالەتەداکارێکی خراپە ، هەروەکوئیمامی غەزالی دەلێ : (هەرکەسێك بەڕووقایمی مالێك لەکەسێك وەربگرێ ، ئەویش لەشەر ماندابیداتێ حوکمی زەوتکردنی هەیە)ۥبەپێی تازەترین لێکۆلینەوەکان خەلکی شەرمن زیاترجێگای متمانەنۥلێکۆلینەوەکان پیشانیانداوە هەست بەشەرمەزاری یارمەتیدەردەبێت بۆچاککردنی پەیوەندییەکۆمەلأیەتی یەکان ، لەڕاستیداپیشاندانی

شەرمەزاری بەشێوەیەك بریتییەلەداوای لێبوردنكردن٠شەرم بەوواتایەناكەلەكاتی قسەكردن ڕەنگی سوورهەڵدەگەڕێ وزمانی تێك دەئاڵێ٠لاوان هەندێك كارهەن لەشەرمان ئەنجامی نادەن ، بەڵام ئەوكرێكارانەی لەشوێنێكی ترەوەهاتوون یاخودئەولاوانەی ئێمەكەدەچنەشوێنێكی ترڕەنگەهەمووجۆرەكارێك بكەنوەك پاككردنەوەی شەقامەكان ئەمەش دەبێتەهۆی زیاتركردنی بێكاری لەنێولاواندا٠

لەبارەی دڵ وجۆرەكانی :

دڵ ئەوئەندامە سەرەكییەی جەستەی مرۆڤە كەبەوەستانی چركە كانی ژیان كۆتایی دێ ، دڵ وەكوترومپایەك وایە كەپاڵ بەخوێنەوە دەنێ بۆمولولەكان كەبەهەمووڵاشەدابلاْوبوونەتەوە ، دڵ لەناوسینگ دایە ، لەلای چەپی قەفەزەی سینگ٠ دڵی ئادەمیزادمەكینەیەكی چاك وبەهێزە ئەگەرچاك ئیش دەكات ، ژیانی ئادەمیزادهەمووی بەدڵەوەبەندە ، زۆرجاری واهەیە دڵی مرۆڤ كتوپڕلەئیش دەكەوێ بەهۆی هەواڵێكی پەست وناخۆش ، بێجگەله مە چەشنی خواردەمەنی پەیوەندی زۆری هەیە بەدڵەوە ، ئەوانەی خواردنی چەوردەخۆن ولەسەری ناجولێن چەوری بەری دڵیان دەگر ێ ، كەئەم چەوریيە ڕێك وپێكی ئیشی دڵ تێكدەدات٠ هەروەهادوای تاقیكردنەوەساغ بۆتەوە ئەوانەی وەرزش دەكەن دڵیان بەهێزترە لەوانەی وەرزش ناكەن٠ دیارەدڵ هەرتەنهائەوپارچەگۆشتە نییەكە لەسینەدایە بەڵكوهەستی دەروونی مرۆڤە٠ئاینی ئیسلام دەروونی كردۆتە سێبەش :

یەكەم : نەفسی الامارة

واتا : دەروونی هاندەربۆكاری خراپە(ان النفس لامارة بالسوء) یوسف : ٥٢ شاعیرانی كوردلەشیعرەكانیاندا زۆرجارسەركۆنەكردنی

نەفسی خۆیان كەلەجۆری ئەممارەیە وفەرمان بەكردنی تاوان دەكات بەزیندەوەرێكی وەك (مار)چواندووە ، هەروەكو مەحوی(١٨٣٦–١٩٠٦)

دەڵێ :

ئەسیری صەیدی قەیدی كەیدی شەیدی نەفسی ئەممارەم

لەدەست ئەم مارە چارەچییە چارەم خودا چارەم

دووەم : نەفسی اللوام

واتا: دەروونی هاندەربۆكاری چاكەوڕەوشت بەرزی٠

سێیەم : دەروونی دڵنیا (النفس المطمئنة)

ئەمەش بەرزترین وئاسودەترین دەروونە ناهێڵێ خاوەنەكەی تووشی خراپەكاری ببێ ، چونكە خاوەنەكەی هەرلەسەرەتاوە لەسەرپاكییە تی وڕەوشت بەرزی ڕایهێناوە ، خوای گەورە بەم دەروونە خاوێنە لە كاتی ماڵئاوایی لەدنیاپێی دەفەرمووێ : (یاایهاالنفس المطمئنة ارجعی الی ربك راضیة مرضیة).

لەبارەی لەبیرچوونەوەوهەڵە :

بەپێی یەکێ لەڕاکان بۆیە وشەی ئینسان بۆمرۆڤ بەکارهێنراوە ، چونکەشتی لەبیردەچێتەوە لە(نسیان)ەوەنزیکە٠

هەڵەکردن ئەوەیەمرۆڤ کارێك بکات بەبێ ئەوەی ویستبێتی ، بۆ نموونە بەردێك فڕێدەات کەچی بەرکەسێك دەکەوێ٠(عەلی وەردی) بەسەرهاتێکی خۆی دەگێڕێتەوە ، دەڵێ : (لەکاتێکدا سەرقاڵی نوسین بووم ، فنجانێك قاوەوشوشەیەك مەرەکەبم لەبەردەم دابوو ، سەری شوشەکەم لابردتاکوقەلەمەکەم پڕبکەم لەمەرەکەب ، بەلاّم لەجیاتی ئەوەی قەلەمەکەمی تێبکەم شوشەکەم بەرزکردەوە بۆلای دەمم وەك ئەوەی بمەوێت لێی بخۆمەوە تائەوکاتەی خەریك بوومەرەکەبەکەبد ەم بەدەمم دا٠ هەروەهادەڵێن (نیوتن) جارێکیان دەیەوێت هێلکەیە ك بخاتەنێوئاوی گەرمەوە تاکوبیکوڵێنێت ، بەلاّم لەجیاتی ئەوەی هێلکەبخاتەناوئاوەکەوە ، کاتژمێرەکەی دەستی تێدەخات وهێلکەکە شی بەدەستەوەبوو تەماشای دەکردتاکوکاتەکەی بۆدیاری بکات٠ پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (قەلەم هەڵگیر اوە لەسەرئوممەتەکەم لەئاست ئەم سێ شتە : لەبیرچوون ، هەڵە ، کاری بەزۆر)٠

لەبارەی سیحروجادوو :

سیحروجادووبوونیان هەیەوناتوانرێت ئینکاری بکرێت ، چونکە لەقورئاندا هاتووەکەسیحردەبێتەهۆی جیاکرنەوەی ژن ومێردلە یەکتری ، وەپێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ) سیحری لێکراوە وبەهۆیەوەنەخۆش کەوتووە ، تاحەزرەتی (جبرائیل) هەواڵی پێدا وجێگایان پێنیشانداوسیحرەکەیان لەناوبیرێکداولەبن بەردێکداکە شاردبوویانەوە دەریانهێنا (بڕوانە : ژیانەوەی زانستە ئاینییەکان ، بەرگی یەکەم )هەروەها ئەوەی کەبەشیش چاوی بریندارەکات ودەیکات بەناوچاوی دا وهیچی لێ نایەت یان لەبەرچاوی خەڵك دا ئاگردەخوات ئەم جۆرە کارە سەیروسەرنج ڕاکێشانە بەشێکن لە

جادووی خەیاڵی٠ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویە تی:(ان من البیان لسحرا)رواە مسلم واتا : (بەشێك لەبەلاغە(ڕەوا نبێژی) سیحرە) وشەی سیحرلەم فەرموودەیە زیاتربۆوەسفی توانای ڕەوانبێژی بەکارهاتووە ، نەك ئەم جۆرەسیحرەی جادووکەران دەیکە ن٠

ئەونیشانانەی کەجادووگەری پێ دەناسرێتەوە :

١ – جادووگەرپرسیاری ناوی دایکی دەکات٠

٢ – جادووگەرداوای شتێك لەشتەکانی کەسەکەدەکات وەك:پارچەقوماش وتاڵەمووکراس و٠٠٠هتد٠

٣ – جادووگەرهەمیشەچەندوشەونیشانەیەك دەنووسێت کەکەسەکەلێی تێناگات٠

٤ – هەندێك جارجادووگەرشتێك بەکەسەکەدەدات داوای لێدەکات لەژێرزەویدابیشارێتەوە٠

لەنموونەی ئەوجۆرەکارانەی کەبەرێگای نادروست فۆڵی خەڵکی پێدەبرن کەرۆژانەدەیان ئافرەت بەدرۆوفرت وفێڵ لەخشتەدەبەن،پیاوێك کەناوی (ج)بووساختەکارانەوفێڵبازانەرۆژانەپارەیەکی زۆری لەوئافرە تەسادەوساویلکانەبەردەدایەوەلەپەنای ئەوکارەش کاری داوێنپیسیشی لەگەڵ ئافرەتەجوان وناسکەکان دەکرد ، بەلاَم ئەوکارەی درێژەی نەکێشالەشەوێکدابەچەقۆی چەندنەناسراوێك کوژرا٠(ج) ماوەی هەشت نۆساڵ ئیشی کرێکاری وبلۆك وچیمەنتۆی دەکرد بەهۆی ئەوەی زۆرخۆی ماندووکردبووتوشی فەقەراتی پشت وئینزیلاق هات نەیتوانی چیترکاربکات ، لەدوای ئەوەی هەژاری ونەداری باڵی کێشابەسەرخێزانەکەیدا هیچیان نەبووبیخۆن خێزانەکەی دەیوت: (ج) هەرکارێك دەکەی بیکەگرینگ ئەوەیە دووعانەمان بۆپەیدابکەی ئەمەکەی حالەئێمەدەیگوزەرێنین٠(خ)دەڵێ : رۆژان هاتن ورۆیشتن (ج) وردەوردە باری تەندروستی باشتربوو ، رۆژێکیان وتی : ژنەکەخۆمن تازەهەرکارم پێناکرێ بیرم لەوەکردۆتەوە ریشم درێژبکەم وبەری بدەمەوە وپەرۆیەکی سەوزلەپشتم ببەستم ومەندیلێك لەسەربنێم ودەست بکەم بەدوعاکردن بۆخەڵك بەپارە ئەمەئاسانترین پیشەیەنەدەستمایەی دەوێت نەهیچ ، (خ)دەڵێ : کە(ج)ی مێردم ئەوقسانەی کردمنیش لەدڵی خۆمدازۆرم پێخۆش بووبۆیەبە(ج)م وت : هەتازووەدەستبەکاربکە،بەلاَم (ج)وتی : دەبێ لەوگەڕەکەباربکەین ، چونکەکەس بڕوامان پێناکات ئەوەبوودوای دوومانگ لەوگەڕەکەبارمانکرد (ج)ی مێردم بەڕیشی درێژومەندیل وپەڕۆی سەوزی ناوقەدی خۆی لەوگەڕەکەنوێیەناساندئیترژنانی گەڕەك هەرچ کێشەیەکیان هەبایەدەهاتنەلای وبڕوایان پێ دەکردو(ج)یش پارەیەکی زۆری لێبەردەدانەوە ، ئێمەش بەوپارانەحەسابوینەوە ئیترژیانما وردەوردەباشتردەڕۆیشت٠(ج)لەسەرەتادادوعای دەکردبۆخەڵك هەربۆئەوەی پارەیەکی کەمی دەستکەوێ وماڵ ومنداڵی پێ بژێنێ دوای کەمێك دەوڵەمەندبووین وپارەمان هاتەدەست و(ج)گۆڕاوزۆرخراپ بووبوولەگەڵم دەیگوت : ژن دێنم٠منیش کەلەهەونەداری پاڵ پشتی بووم ولەگەڵی دەژیام کەچی ئەوکەپارەی دیت شەوورۆژبەشەڕدەهات لەگەڵمدا وجنێوی پێدەدام وقسەی ساردوسوکیشی پێدەوتم ، دووجارانیش بەتوندی لێیدام کەجارێکیان ددانێکم لەگەڵ لێدان شکاوهەمووشی لەسەرئەوەبوودەیوت : تۆبەکەڵك نەماوی وژنێکی دیکەت بەسەردێنم ، منیش دەمووت : رێگانادەم ژنێکی تربێنی٠ئەمجارەیان هەڵساهۆدەیەکی تایبەتی لەقاتی سەرەوەی ئەوخانووەی تێدابووین دروستکرد٠جاران ئەگەرهەرژنێك هاتبایەلای پێی شەرم بوو بەتەنیالەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەم دابنیشێ منیشی بانگ دەکرد ، بەلاَم دوای ئەوەی ژورێکی تایبەتی لەقاتی سەرەوەی ئەوخانووەی تێدابووین دروستکردبەمن ومنداڵەکانیشی گوت : هەرکەسێك هات بۆلام بۆتان نییەبێنەژوورەوە ، منیش لەدوای ئەم قسەیەبەتەواوی هەستم کرد(ج)نیازی پیسەودەیەوێ دەیەوێ لەگەڵژنی خەڵکی بەحەرامی غەریزەکانی بەتاڵ بکاتەوە بۆیەکاتێك رۆژانەدەمدیت کەئەهەمووژنەجوان وجاحێڵانەبۆمەبەستی نوشتەکردن دەهاتنەلای لەداخان وەختبووجەڵتەلێم بدات بەتایبەتی کاتێ دەرگای دادەخست نەمدەزانی چی دەکات ؟ بۆیەشەوورۆژشەڕوئاژاوەم بوولەگەڵیدازۆرجارئەگەرئەوم لێ

دیارنەبوایەزۆرئافرەتم بەڕێدەکرد دە مگوت : لەماڵ نییەیان دەموت نوستووە٠(خ)دەڵێ : ماوەیەك دیقەتم دەداژنێکی زۆرجوان ڕۆژناڕۆژێك دەهات بۆلای (ج) ی مێردم منیش سوڕدەمزانی کەئەوژنەڕەوشتی تەواونییەوشتەکی هەیەلەگەڵ (ج)دا چونکەکەئەوژنەدەهات (ج) دەیگوت : هەرکەسێکی دیکەهات بەڕێی بکەوبڵێ (ج)لەماڵ نییە ، ئیتر(ج)لەگەڵ ئەوژنەدەچوونەژورێ ویەك دووسەعاتیان پێدەچووتاڕژێکیان کەئەوژنەهات(ج)لەماڵ نەبوومنیش پێم وت : ئەرێ خوشکم تۆچ مشکیلەیەکت هەیەهەروائەوەندەزۆرزووسەردانی ئەوفاڵچییەی مێردم دەکەی ؟! گوتی : بۆچی دەڵێی فاڵچی ؟! ئەوەپیاوێکی باشە٠گوتم : ئاخرچ موشکیلەیەکت هەیە،ئەی بۆچی ناتوانی بۆت چارەسەربکات ؟ گوتی:ئەوەی ڕاستی بێ من منداڵم نابێ لەگەڵ مێردەکەمدانێوانمان زۆرناخۆشە ، چونکەمێردەکەم پیاوێکی نەزۆکە منیش حەزم لەمنداڵە بۆیەحەفتەی دووسێ جاران دێمەلای ئەوپیاوە چاکەی تۆتاکوبەدوعاونوشتەکان خوامنداڵێکمان پێببەخشێ٠منیش وتم : تۆبۆچی خۆت گێل کردووە یان دەتەوێ فێڵم لێ بکەی تۆئەگەرپیاوەکەت نەزۆك بێت منداڵتان نابێت ئەوە بوویەك دووجاری دیکەئەوئافرەتەهاتەوەلای(ج)ونەمدیت چیتربێتەوەلای٠دووسێ مانگ ئەوژنەبزربوو(ج) ی مێردیشم زۆردەترساوازی لەوکارەهێناودەیگوت : من ئیترخۆم بەکارێکی ترەوەسەرقاڵ دەکەم٠ تاڕۆژێکیان (ئە)ی کوڕم بەهەناسەبڕکێ هاتەحەوشەوەگوتی : من لەگەڵ (ھ)ی برادەرم لەوگەڕەکەی ئەوبەردابەپاسکیلەوەتێپەڕین قەرەباڵغییەك لەبەردەرگای ماڵێکداهەبووئێمەش چووین تاکوبزانین چی ڕوویداوە ؟بەچاوەکانی خۆم ئەوژنەم بینی کەسەردانی باوکمی دەکردبەدەستی پیاوەکەی کوژرابوو(خ) دەڵێ : هەرناوهەناوم لەترسان بەربۆوەوگوتم : نەیان گوت لەسەرچی کوژراوە ؟(ئە)گوتی:بابادەیانوت ژنەکەدووگیانیش بووە ، من کەئەوقسانەی (ئە)م بیست بەتەواوی ئەژنۆم شکان بۆیەهەمووخەبەرەکەم خستەناودەستی (ج) ئەویش کەئەوەی بیست دەستی بەگریان کرد ، گریانێك لەژیانمداگریانی وام لە (ج)نەدیتبوو٠ئەوەبووهەمووی دووهەفتەی نەخایاند شەوێکیان چەندکەسێك کەدەمی خۆیان بەجەمەدانی داپۆشیبووهەڵیانکوتایەسەرماڵمان وبەبەرچاوی منەوە (ج)یان دایەبەرچەقۆولەناوژوورەکەداتاڕۆحی دەرنەچووبەجێیان نەهێڵا ئیترئەوان ڕایانکرد(جیهانێك لەتاوان ، بەرگی یەکەم)٠

**لەبارەی چاووزار :**

بەدرێژایی مێژوومەسەلەی چاووزارلەناوهەموومیللەتانداهەبووە٠وەچاووزارکاریگەری هەیەوبەشێکەلەئیرەیی ، بۆنموونەخانوێك دروست دەکەی یان سەیارەیەك دەکڕی یان جلێکی جوان لەبەردەکەی،تاقیکردنەوەی ژیانی ڕۆژانەوبوونی هەندێك ئایەتی قورئانی پیرۆز وامان لێدەکات باوەڕمان بەچاووزارهەبێت ، بۆپارێزگاریکردن لەچاووزار پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ) ڕێنمایی کردووین ئەگەرشتێکی جوان ودڵگیرمان بینی بڵێین : (ماشاءالله لاقوة الابالله) ، کەواپیاهە ڵدان ڕەنگەببێتەمایەی

چاولێدان٠ لەسەرەتادا مرۆڤ خاڵی کوتانی کردبووە لەمپەربۆچاووزار، بەلاّم پێخەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەمەی قەدەغەکرد٠چاووزاروبەچاوچوون عیلمییەن تیشکی چاوهەیە ، لەئاینی ئیسلامیشدا بەلگەی عەقلی ونەقلی دووپاتیان ڕوونیان کردۆتەوە٠حەزرەتی یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێ) فەرمانی بەکوڕەکانی کردووە هەریەکەیان لەدەرگایەك بچنە ژوورەوە (من ابواب متفرقە) لەبەرچاووزاربووە٠(عامربن ریعە)پیاوێك بوولەسەردەمی پێخەمبەر(درودی خوای لێ بێ) ناسرابووبە(حاسد) ، (سهل بن حنیف) پیاوێکی سووروسپی بووخۆی دەشوشت ، عامرهات وسەیری کردگوتی : چەندجوانە!کچێکی لەهەرحال بووبێ ئەوەندەپێستی جوان نەبووە،یەکسەر(سهل) کەوتەسەرزەوی ولەهۆش خۆی چوو٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) کەزانی توڕەبووفەرمووی : دەبوایەدوعای بەرەکەتی بۆکردبوایە ئەمری کردعامریان هێناوشوشتیان ولەنا لوقەدەحێك ئاوەکەیان بەسەر(سهل) داکرد هاتەوە هۆش خۆی٠

**لەبارەی کات :**

یەکێك لەشتەبەنرخەکان کاتە هەرلەبەرگەورەیی نرخەکەی خوای تەعالا سوێندی پێ خواردووە٠ ناصری سوبحانی ، دەڵێ:(ناسینی کات مەسەلەیەکی زۆرگرینگەبۆژیانی ئینسان ، ئەگەرئینسان کات دیاری نەکات پەیوەندی کۆمەلاّیەتی زۆربەسەخت ئەنجام دەدرێ ، چونکە بۆنموونە من پەیمان دەدەم بەکەسێك لەفلان ڕۆژدا مامەڵەیەك دەکەم ، یان قەرزێك دەدەمەوە ، یان بۆنموونە ئیجازە هتد ، کاتێك ژمارەیەك بەردەست نییە بەهۆیەوە کاتەکەی ، ڕۆژەکەی بۆدیاری بکەم مامەڵەوپەیوەندی کۆمەلاّیەتی زۆربەزەحمەت ئەنجام دەدرێ) هەروەها ناصری سوبحانی(٤) ، دەڵێ :(یەکێ لەنیعمەتەکانی خوای میهرەبان ئەوەیە کاتی کردووە بەدووبەش : شەووڕۆژ ، ئەگەرکات هەمووی شەوبوایە گیانلەبەرپێویستی بەوزەی گەرمایە ، لەبواری ئابوریشدائینسان توشی گیروگرفت دەهات ، چونکەلەشەودا ئینسان ناتوانێ وەکوڕۆژکاربکات)گەورەترین سەرمایەی مرۆڤ کاتە ، یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی ئەوەیە زووبەسەردەچێت وناگەڕێتەوە ، بۆیە مرۆڤ بەشتێکەوەخۆی خەریك بکات سوودی تێدابێت٠لەگۆڤارێك خوێندمەوە ، لەئەڵمانیالەپشتی (لۆری)یەك نووسرابوو : (باکاتت لەکیس بچێ باشترە لەوەی ژیانت لەکیس بچێ)٠واچاکەمرۆڤ کاتەکانی بکات بەسێ بەشەوە : بەشێکی دابنێت بۆنوستن،بەشێکی بۆکاروفرمان ، بەشێکیشی بۆحەسانەوە٠

**لەبارەی خۆکوشتن :**

مرۆڤ کاتێ لەژیانی ڕۆژانەی دەکەوێتەحالەتی بێزاری وبێدەسەلاّتی ، ناتوانێ لەبەردەم گرفتەکانی داخۆی ڕابگرێ ، پەنادەباتەبەرخۆکو شتن ، لەناوکۆمەڵی کوردەواری دا دیاردەی خۆکوشتن لەمێژە هەیە ، بەتایبەتی لەنێوئافرەتان٠ تاکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمیش لەولاّتی هیند خۆکوشتنی ژنی هاوسەرمردوو

دوای مردنی هاوسەری نەر یتێکی جێگیربوو ، کەپێیان وابووئەم خۆکوشتنە دەبێتەهۆی بەخشینی گوناهەکان٠مرۆڤ بەهیچ شێوەیەك مافی ئەوەی نییە کۆتایی بەژیانی خۆی بهێنێ٠پێویستەمرۆڤ ئەوڕاستییەبزانێ کەژیان بێ ناخۆشی وئازارنابێ ، وەهیچ کەس نییەژیانی تەنیاخۆشی بێت ، چونکەژیان بەهەشت نییەبەس جێگای خۆشی بێت ، بەڵکولەگەڵ خۆشی ناخۆشیش هەیە ، لەگەڵ لەش ساغی نەخۆشی هەیە ، لەگەڵپێکەنین گریان هەیە ، ئەمەسوننەتی ژیانە٠ئەگەرتەماشای ئەوکەسانەبکەین کەخۆیان دەکوژن یان خۆیان دەسوتێنن زۆرجارنامرن بەڵکوکەم ئەندام دەبن یان شێوەودیمەنیان تێکدەچێ٠کاتێك ناخۆشییەك یان خەمێکی گەورەڕوولەمرۆڤ دەکات ، مردن چارەی ناکات٠گۆڤاری (ئەلیف باء)لەژمارە(٧٣٠) بلاّویکردۆتەوەکە"گرهاردکورنش"ی ئەڵمانی تەمەن(٦٨)ساڵ لەمایسی ساڵی (١٩٧٥)دالەیەکێ لەژوورەکانی شوقەیەکی سێ ژووری دابەدووکەڵ دەخنکێ تاحوزەیرانی ساڵی (١٩٨٣) کەس پێی نازانێ ، چونکەکەس نەچووەسەرێکی لێبدات تاکاتێ دەرگاکەیان کردۆتەوەتەرمەکەیان بینیوە! (دیل کارینجی)لەکتێبی (دع القلق وابدأالحیاة) چەندنموونەیەك لەژیانی ئەمریکادەهێنێتەوە دەڵێ : ئامازەکان سەلماندوویانەقەلەق (نیگەرانی)بکوژی ژمارەیەکەلەئەمریکا٠

(ولیەم جیمس)کەمامۆستای فەلسەفەبوولەزانکۆی هارڤارد دەڵێ :(بێگومان گەورەترین چارەبۆنیگەرانی بریتییەلەئیمان)٠خوای گەورەش دەفەرمووێ : (الابذکر الله تطمئن القلوب)واتا : (بەڕاستی دڵەکان تەنیابەیادی خوائارام دەگرن)٠

## لەبارەی منداڵ ومەترسییەکانی ناوماڵ :

منداڵ ئەومرۆڤە ناسك وپڕبەرائەتەیە کەپێویستی بەچاودێری دایك وباوك هەیە٠ هەرلەوکاتەی منداڵ دەست بەگاکۆلکێ وڕۆیشتن دەکا ت ، چاوەڕوانی هەمووجۆرە مەترسییەکی لێدەکرێت،بەتایبەتی منداڵ حەزی لێیەهەمووشتێك تاقیبکاتەوە ، جالەبەرئەوەڕێکخستن لەماڵەوەزۆرگرینگە ماڵی ڕێك دڵنیاترە لەوانی تر٠بۆسەلامەتی منداڵەکەت ، ئەم خالاّنەپەیڕەوبکە :-

١-ئاگادارکردنی منداڵ لەوشتانەی دەبنەهۆی سووتان ، وەك : مەنجە لێ ئاویان شلەمەنی گەرم ، یان سۆپالەزستاندا٠

٢-ئاگادارکردنی منداڵ لەسەرکەوتن بەسەرپەیژەدا ، کەپێویستە بەدەرگایەکی بچووك ، یان بەشتێك لای خوارەوەی دابخرێت٠

٣ -دانەنانی منداڵ لەسەرشوێنی بەرز، وەك : سەرمێز ، چونکە مەترسی کەوتنی لێدەکرێت٠

٤-ئاگاداری منداڵ لەشتی وەك : چەقۆکە یاری پێنەکات٠

٥ -هاوارکردن ، منداڵ کاتێ چەقۆیەکی بەدەستەوەیە هاواربکەی بەسەریا ، لەوانەیە ڕاچلەکێ وخۆی بریندابکات ، یان کاتێك منداڵ لەماڵەوە لەئاگرنزیك دەکەوێتەوە ، ئەگەرهاواربکەی بەسەریالەوانە یەڕاچلەکێ وبکەوێ بەسەرئاگرەکەوە٠

٦ – هیچ شتێك لەسەرزەوی نەكەوتبێ ، چونكەلەوانەیەمندالْ قوتی بدات ، چونكەمندالْ هەمووشتێك بۆدەمی دەبات٠

٧ – تەلەكانی كارەبابەوالایی بەجێ مەهێلْە٠

**لەبارەی داهێنان :**

داهێنان بریتییەلەوەی شتێك لەنەبوونەوە بینیتە وجوود٠ زۆرلەداهێنانەكانیش لەدەرەوەی قوتابخانەبووە (ئەمەنەبێتە هاندان بۆئەوەی وازلەقوتابخانە بێنن ، بەڵكوئەگەركەسێك نەیتوانی لەقوتابخانە سەركەوتووبێ ، رێگەی دیكە هەیە ببێتە كەسێكیسەركەوتوو ، وەكوزۆرلەنووسەروشاعیروفەیلەسوف وزانا هەن بێ قوتابخانە بوونەتە كەسێكی سەركەوتوولەبوارێك لەبوارەكان دا) (تێبینی : لەكتێبی سەركەوتووەكان بێ قوتابخانە وەرگیراوە )

چەند نموونەیەك :

ئەدیسۆن (١٨٤٧ – ١٩٣١) :

ئەدیسۆن لەشاری (میلانۆ) لەویلایەتی (ئۆهایۆ)ی ئەمریكا لە (١١ ی شوباتی ١٨٤٧) لەدایكبووە ، لەسەرەتای ژیانی دا دوای ئەوەی لەقوتا بخانە دەركرا بەبیانووی ئەوەی دەبەنگ ودواكەوتووە لەژیری دا دەستی بەكاری رۆژنامە فرۆشتن كردووە٠ گەورەترین داهێنانی گلۆپی كارەبایی بوو ، لەسالأنی كۆتایی ژیانیشی دا وێنەی جولاوو قسەكەریشی داهێنا ، هەروەها موەلیدەی كارەبایی وپاتری خەزنكر دنیشی داهێناوە٠ ئەدیسۆن وتوویەتی : (من هیچ یەكێك لەداهێنا نەكانم بەرێكەوت دانەهێناوە ، بەڵكوبەماندووبوونێكی زۆروهەوڵد ان وبەردەوام بوون ئەم كارە ئەنجام دراوە)لەساڵی (١٩٣١) لەتەمەنی (٨٤)ساڵی كۆچی دوایی كرد٠ لەزۆرێك لەولأتانی دنیاش دا لەساڵیادی كۆچی دوایی (ئەدیسۆن)دا واتا لە (١٨ی ١٠) گلۆپەكانیان بۆماوەی یەك خوولەك وەكورێزێك بۆئەوداهێنەرەبەتوانایە دەكوژێننەوە٠

ماركۆنی (١٨٧٤ – ١٩٣٧) :

ئەم داهێنەرەش یەكێكە لەوكەسانەی وازی لەقوتابخانە هێناوە وڕادیۆی داهێناوە٠ لەشاری پۆلۆنیای ئیتالْیا لەدایكبووە٠ ماركۆنی دەستی كردووە بەخوێندنەوەی كارەكانی زانای فیزیایی ئەڵمانی (هاینریچ هێرتز) لەبواری شەپۆلْەكانی كارۆموگناتیسی٠

سیكیرۆهۆندا (١٩٠٦ – ١٩٩١) :

ساڵی (١٩٠٦) لەولأتی یابان لەدایكبووە ، باوكی ئاسنگەرێكی هەژاربووكاری چاككردنی پاسكیلی هەوایی دەكرد ، هۆندا حەزی بەفێربوون بووبەشێوەیەكی كردەیی زۆرحەزی لەئۆتۆمبیل وئامێرەكان بوو ، ساڵی (١٩٢٢) لەتەمەنی شازدە ساڵی دا وازی لەقوتابخانەهێنا٠ ساڵی (١٩٤٨) كۆمپانیایەكی دامەزراند بەناوی (كۆمپانیای هۆندا) ، كەخاوەن بڕوانامەی داهێنان بوولەدروستكردنی ماتۆڕسكیل دا ، ساڵی (١٩٦١) دەستیكردبەناردنی سەدهەزارماتۆڕسكیل بۆویلایەتەیەكگرتووەكانی ئەمریكا ، ساڵی (١٩٦٨) كۆی

ماتۆڕسکیلەنێردراوەکانی هۆندا بۆئەمریکاگەیشتەیەك ملیۆن ماتۆڕسکیل ، هۆندا تەنیاخۆی لەدروست کردنی ماتۆڕسکیلداقەتیس نەکرد ، بەڵکو ساڵی (١٩٦٢)چووە ناوجیهانی ئۆتۆمبیلیش ساڵی (١٩٩١) لەتۆکیۆماڵئاوایی لەژیان کرد٠

میخائیل تیموفیچ کلاشینکۆف (١٩١٩ – ٢٠١٣) :

میخائیل کلاشینکۆف داهێنەری چەکی کلاشینکۆفە ، لەساڵی (١٩١٩) لەڕوسیالەدایکبووە ،لەساڵی (٢٠١٣) لەتەمەنی (٩٤) ساڵی کۆچی دوایی کرد٠

دووبراکە : وێڵبروایت(١٨٦٧- ١٩١٢) ، ئۆرڤیل وایت(١٨٧١- ١٩٤٨)

ئەم دووبرایە لەساڵی (١٩٠٢) فڕۆکەی چارۆکەداریان دروستکرد٠

جان جاك ڕۆسۆ(١٧١٢ – ١٧٧٨) :

ساڵی (١٧١٢) لەسویسڕای ئێستا لەدایکبووە ، بیروبۆچوونەکانی کاریان کردە سەرشۆڕشی فەڕەنسا ، لەتەمەنی پازدە ساڵی دا هاوسەرگیری لەگەڵ (لویز دی وارنز) کرد ، کەسیانزەساڵ لەلویزبچووکتربوو ، بەڵام لەکتێبی (دانپێدانان)ەکەی دا باس لەبەختەوەری خۆی دەکات لەگەڵ خاتوو(دی وارنز) ، بەڵام لەساڵی (١٧٤٠) لێی جیابۆوە٠

ولیام شکسپیر(١٥٦٤- ١٦١٦) :

ئەدیبێکی ئینگلیزییە ، بەهۆی کارەساتێکی ئابورییەوەکەدووچاری خێزانەکەی هات وازی لەقوتابخانەهێناوە٠

کەریم خانی زەند :

بەیەکەم شای دادپەروەری ئێران ناسراوە ، نەخوێندەواربووە٠لەعەشیرەتی (لەك)بووە٠لەساڵی (١١٤٠)ك کە(نادرشا)خاکی لوروبەختیاری داگیرکرد ، لەخێلی لەك چەندکەسێکی بەزۆرخستەناولەشکرەکەیەوەکەریم خانیش یەکێك بوولەوان٠لەسەربازی بووبەخاوەن پایە٠لەزەمانی عادل شای برای نادرشا بووبەسەرتیپ ، لەپاشان بووبەسەرکردەی سووپا٠لەکاتێکداکەئێران پشێوی تێکەوتبووکەلکی لەوهەلە(فرسەت)وەرگرتووە ، بووبەشای ئێران٠ئەم پیاوە دادپەروەرە (٢٨)ساڵ حوکمڕانی کردووە٠

لەبارەی زمان (اللغە) :

خوای گەورەخۆی زمانی بەئادەمیزادبەخشیوە٠وەکونەتەوەی ئادەمیزاد کەلەباوکەئادەمەوە هاتۆتەخوارەوە ، هەرچی نەتەوەهەیەلەسەررووی زەمین گشتی لەباوکەئادەمەوەهاتۆتەخوارەوە٠

گۆڤاری مێرگ لەژمارە (٦٣)ی ساڵی (٢٠١٠) ، بلاّویکردۆتەوە کە :( شەش هەزار زمان لەنێوگەلانی جیهاندا بلاّوبۆتەوەوسەرچاوەکەشی یەك زمانە) بەپێی ئاینەئاسمانییەکان لەسەرەتادا یەك زمان هەبوو ەوزاناکانیش ئەوەیان دووپاتکردۆتەوە کەبەڵێ لەسەرەتادایەك زمان هەبووە ، بەڵام ئایا یەکەم وشە چ بووە کەمرۆڤ وتوویەتی ؟ یەکەم وشەکەبەسەرزاری مرۆڤ داهاتبێ (الحمدلله)بووە٠لەکوڕی مەسعودودەستەیەك

لەهاوەڵانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)دەگێڕنەوە: کاتێك ڕۆحیان بەئادەم بەخشی وگەیشتەسەری ، پژمی وفریشتەکان سوپاسی خوایان کرد ، ئەویش سوپاسی خوای کردوخواوەندفەرموی : ((خوداڕەحمت پێببەخشێت)) (بڕوانە : مێژووی تەبەری ، بەرگی یەکەم)٠

زانای زمانەوانی (جۆزێف گرینبێرگ)(١٩١٥-٢٠٠١) ، دەڵێ :(ئەوشەش هەزار زمانەی کەئەمڕۆهەیە ، چەندین لێکچوون وپەیوەندی لەنێوانیان داهەیە ، چونکە هەرهەموویان لەیەك زمانەوە سەرچاوەیان گرتووە)٠

**لەبارەی وشەی (سید) :**

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(اناسیدولدادم ولافخر) واتا :(من سەروەری ڕۆڵەکانی ئادەمم وشانازیش ناکەم) ، وەك ئەوەی پێخەمبەری خوا ڕێگری بکات لەشانازیکردن٠ هەروەها پیاوێك بەپێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) یا سید ، ئەو یش فەرمووی : سەید بریتییە لەخوای تەعالا) ، ئەمجارەیان وەك ئەوەی ڕێگری بکات لەمەدحکردن لەڕوودا٠ هەروەهاپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (کل بنی ادم سید ، فاالرجل سید اهله ، والمراة سیدة بیتها) واتا : (هەمووکە سێك لەنەوەی ئادەم گەورەیە ، پیاوگەورەی خێزانەکەیەتی ، ئافرە تیش گەورەیەلەماڵەکەی) پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەکاتی هاتنی عەشیرەت وبنەماڵەیەك بۆلای ، دەیفەرموو : کێ گەورەی ئەم عەشیرەتەیە؟ من سید بنی فلان ؟ بەڵام سەیدی نەسەب وڕەچەلەك بەوکەسانەدەوترێ کەلەزورییەتی پێخەمبەرن (درودی خوای لەسەر بێ) ، کەئەوا نیش نەوەکانی فاتیمەی کچی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) وعەلی کوڕی ئەبی تالیب ی ئامۆزایتی٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) کاتێك نامەی بۆپاشاودەسەڵاتدارەکان دەنووسی ، بۆنموونە دەینووسی : (الی عظیم روم) ، لەزمانی عەرەبیدا وشەیالسید بەواتای کاك ، وشەی السیدة بەواتای خانم٠لەیەکێ لەفەرموودەکان وشەی (سید)بەمانای سەرۆکی گەل بەکارهاتووە ، هەروەکولەم فەرموودەیە : (سیدالقوم خادمهم)رواه الطبراني واتا : (سەرۆکی هەرگەل ومیللەتێك دەبێ خزمەتکاریان بێ)٠

**بەڵگەکانی بەکارهێنانی لای ڕاست :**

١ -شۆردنی دەست نوێژدەبێ لەدەستی ڕاستییەوەدەست پێبکات ، ئەوجالای چەپی بشوات٠

٢ -هەروەهالەنوێژدا دەستی ڕاستی لەسەردەستی چەپی دادەنێ ، لەسەرناوك ولەژێرسینگی٠

١-هەروەها یەکەمجاربەلای ڕاستی سەلام دەداتەوە٠

٢- پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(من اکل بشماله اکل معه الشیطان ومن شرب بشماله شرب معه الشیطان)واتا : (هەرکەسێك بەدەستی چەپ خواردن بخوات ، شەیتان لەگەڵی دەخوات ، هەرکەسێك بەدەستی چەپ ئاوبخواتەوە شەیتان لەگەڵی دەخواتەوە)٠

٣- ( فأما من اوتى كتابه بيمينه (٧) فسوف يحاسب حسابا يسيرا (٨) وينقلب الى اهله مسرورا) الانشقاق : ٧ – ٨
واتا : (جائەوکەسەی نامەی کردەوەی بەدەستی ڕاستی درایەدەست ئەوسالێپرسینەوەیەکی سووك وئاسانی لەگەڵ دەکرێ ، وەبەشادومانی دەگەڕێتەوەلای کەس وکاری)٠
٦ – دەستی ڕاست بەهێزترە ، بۆیەمرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی دەستی ڕاستی بەکاردەهێنێت ، دەستی چەپ وەکویارمەتیدەرێك بەکاردەهێنێت٠

## ناولێنان :

ناونان بەشێکەلەزمان وبنەمای سەرەکی نەتەوەیە٠هیچ شتێك لەم کەونەدانییەبەبێ ناوبێ ، خەڵکی بەهۆی ناوەوەهەمووشتێك دەناسنەوەولێکیان جیادەکەنەوە٠هەموومرۆڤێك کاتێك لەدایك دەبێت ناوێکی لێ دەنرێت٠بێگومان دوای ڕەنگ وڕوخسارناوگرینگترین ئامرازە بۆجیاکردنەوەی مرۆڤەکان لەیەکتری وەپێویستەخەڵکی ناوەکان وەکوخۆی بەکاربهێنێت دووربکەوێتەوەلەگۆڕین وکورتکردنەوەی ناوەکان بەتایبەتی ناوەکانی : ابراهیم وعبدالله ومەحمودو٠٠٠هتد٠
ناو وشەیەکەبۆئاماژەکردن بەکەسێك یان شتێك یان گیانلەبەرێك بۆناسینەوەی ئەوکەسە یان ئەوشتە یان ئەوگیانلەبەرە٠ ناولێنانی منداڵ یەکێکەلەومافانەی کەمنداڵ لەسەردایك وباوك هەیەتی کەناوێکی خۆشی بۆهەڵبژێن وماناکەی بزانێ وسووك وئاسان بێت لەسەرزمان وناوێك بێت کەگەورەبووشەرم لەناوەکەی خۆی نەکات ونەبێتەجێگای پێکەنین وتانەدانی خەڵکی٠جائەگەرکەسێك بڵێ ناوجگەلەعەرەبی جائیزنییە لەڕوانگەی شەریعەتەوە هیچ ئەسڵێکی نییە ، بەڵکوئەگەرناوتەنهالەبازنەی عەرەبی کۆببێتەوە ئەوە دەکاتە دەمارگیری ، ئەگەربڕوانینە ناوی پێخەمبەران بەزۆری عەرەبی نین٠ ئیمامی ئەحمەدوئەبوداودڕیوایەتیان کردووە : (خۆشەویسترین ناوە کان لای خوا : عبدالله و عبدالرحمن ە وناخۆشترین وناپەسند تر ینیان : حرب) و(مر) واتا : جەنگ وتاڵییە٠بۆیەهەرگەلەوبەزمانی خۆی ، هەموودایك وباوکێکیش هەستی بەرپرسیاریەتییان هەبێت کێشەنییەئەگەرڕێژەیەك ناویش بەزمانانی تربێت٠
پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (خیرالاسماء ماحمد وعبد)ئایامەرجە (حمد و عبد) بەزمانی عەرەبی بێ ؟ وەئایا توانای ئەوزمانە لەوەدایەکەناوێکی هاومانامان بداتێ مەبەست ومانا یان یەك بن ؟ بۆنموونەدەتوانین لەجیاتی (نەجات) بڵێین (ڕزگار) ، لەجیاتی (سەلام) بڵێین (ئاشتی) لەجیاتی ئیمان بڕوا لەجیاتی ئەمەل
هیوا یاخودئاوات لەجیاتی صابرئارام ،٠٠٠هتد٠ درودی خوای لێبێ فەرموویەتی : (خیرالاسماء اسماء الانبیاء) ، ناوی زۆربەی ناوی پێخەمبەرانیش عەرەبی نین ، هەروەهایەکێك لەیارانی پێخەمبەر(درودی خوای لێ بێ)ناوی گاوان بووە کوردبووە پێخەمبەر(درودی خوای لێ بێ)فەرمانی نەداوە بەگۆڕینی ناوەکەی تەنانەت ماریەی خێزانی هەربەناوەقیبتییەکەی خۆی ماوەتەوەنەشی گۆڕیووە هەربۆیەبەعەرەبکردنی

ناولەئاینی ئیسلامداهیچ ئەسڵێکی نییە تەنیائەگەریەکێك ناوێکی بێماناى لێ بووبێ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی داوە بەگۆڕینی·زۆرجاریش خەڵکی سادەوساویلکەوای زانیووەهەروشەیەك لەقورئانی پیرۆزداهەبێ ئەوەبۆناودەستدەدات بەبێ ئەوەی لەوشەکەبگات وماناکەی بزانێ وەکوناوی(کەزیبان) لەساڵی (٢٠٠٥) چەندکچێك کەناویان کەزیبان بووە ناوی خۆیان گۆڕیووە بەهۆی ناوەوەدەتوانین دەستنیشانی نەتەوەکان بکەین بۆنموونە ناوەکانی (ئایدن ، ئایهان ، ،···هتد)تایبەتەبەدەستنیشانکردنی نەتەوەی تورك·سەبارەت بەڕێژەی ناوی کودی یەکێك لەوانەی بەناوسجل وتۆمارەکانداگەڕاوەبۆڕێژەی ناوی کوردی لەشاری هەولێرلەساڵی (١٩٩٠ – ١٩٩١) لەکۆی (٤٠٠)ناو ڕێژەی ناوی کوردی ٧٥٪بووە ، لەساڵی (١٩٩٩)ڕێژەی ناوی کوردی ٢٥ ٪ بووە ، لەساڵی (٢٠٠١) ٢٩ ٪ بووە·هەروەهازنجیرەدراماکانیش بەڕێژەیەکی کەم کاریگەرییان هەبووەلەهاتنی ناوی نەتەوەکانی تربۆناو زمانی کوردی بۆنموونە زنجیرە درامای (خۆشەویستی خەمناك)کەزنجیرەدرامایەکی کۆرییە دۆبلاژی کوردی کراوە لەناوەڕاستی ساڵی (٢٠٠٧) کاریگەرییەکی دەروونی بەسەربینەرداهەبووە خەڵکێکی زۆربەتامەزرۆییەوە سەیری ئەوزنجیرەدرامایەیان کردووە ، پاڵەوانی ئەوزنجیرەدرامایەکچ وکوڕێك بوون بەناوەکانی (هاین وژوانیۆ) هەندێك لەدایکبوانی کاتی پەخشکردنی زنجیرەدراماکەبنەماڵەکانیان ناوی (هاین)یان لەکچەکانیان ناوە·هەند ێك ناویش هەیەلەنێوان کچان وکوڕان هاوبەشە وەك : نەجات ، ئاراز ، ···هتد·ناویش هەیەژمارەیەوەك : حەفسەد·

عەلی وەردی دەڵێ : تێبینیمان لەبارەی ناوەکان لەجاهیلیەت ئەوەیەزۆربەیان ئاماژەبۆهێزوزاڵبوون دەکەن وەك:( حرب،سیف،·· ·هتد) وەئەوەی جێگەی سەرنجەئەوەیەزۆربەی ناوەکان لەناوەکانی ئاژەڵی دڕندەوەرگیراون وەك : فهد(پڵینگ) ، سرحان(گورگ) ، حریش(مارەزیو)·زۆردەگمەنەکەسێك نابینی ناوی (حصان)بێت یان ناوی (جمل)بێت یان هەرئاژەڵێك ڕێگەبدات کەسانی دیکەسواری سەرپشتی بن یان بارهەڵبگرێت ، چونکەلەتێڕوانینی ئەوان ئاژەڵێکی زەلیلە ، بەلاّم ئاژەڵێك سەرکێش بێت وهێرش بکاتەسەرکەسانی دیکە دەبینی زۆربەی ناوەکان بەناوی ئەوئاژەلاّنەوەکراون کەسەکێشن وهێرش دەکەنەسەکەسانی دیکە ، هەرلەبەرئەوەشەبێزراوترین ئاژەڵ (کە)ە چونکەئەوئاژەڵەبەرگەی زۆرترین ملکەچی هەیە ، خراپترین جنێویش پیاوی بدوو(بیابان نشین)پێی بدرێت (کەر)ە·

واتای چەند ناوێك :

١ – مریم : لەبنەڕەت دا وشەیەکی عیبرییە ، بەواتای ئەوکە سەدێت کەبەندایەتی وخزمەتکاری بۆخوای گەورەبکات ، وتراوە یەکەم کەس ئەوناوەی لێنرا (مەریەمی کچی عیمران) بوو ، دایکی ئەوناوەی لێنا ،

چونکە بڕیاری دابوو کەخزمەتی (بیت المقدس) بکات ، وشەی مەریەم لەلایەن یۆنانییەکان پێی دەوترێ (ماریا)٠

٢ – ادهم : ڕەش

٣ – ارکان : پایە ، بنچینە

٤ – اسحاق : ناوێکی عیبرییە بەمانای (پێکەنین) دێ

٥ – اسماعیل : ناوێکی عیبرییە بەمانای خوادەبیستێ

٦ – ادریس : زۆردیراسەکردن

٧ – ئەنوەر : خاوەن ڕووناکییەکی زۆر

٨ – ایوب : ناوێکی عیبرییە بەمانای تەوبەکار

٩ – هەلاڵە : هەمووگوڵێك پێکهاتووەلە گەڵاوهەلاڵەوبنکەولاسك٠

١٠ – باسل : جوامێر ، ئازا

١١ – باقر : زۆرشارەزالەزانست

١٢ – بدر : مانگی چواردە شەوی

١٣ – بەشیر : موژدەدەر

١٤ – بشار : لەموژدە هاتووە

١٥ – بسام : زۆربەزەردەخەنە

١٦ – بلال : ئاو ، شتێك تەڕبوبێت

١٧ – توفیق : سەرکەوتوو

١٨ – سابت : جێگیر

١٩ – جابر : چاکساز

٢٠ – جاسم : گەورە ، مەزن

٢١ – جوبەیر : چاکساز

٢٢ – جویر : حەبلی ملی وشتر ، ڕێشمە

٢٣ – جلال : بەشکۆ

٢٤ – جلیل : بەشکۆ

٢٥ – جونەید : سەرباز ، جندی

٢٦ – حاتم : یەکلاکەرەوە

٢٧ – حارث : شێر ، بەمانای جوتیاریش دێ

٢٨ – حازم : کارەکان بەپوختی وجددی دەکات

٢٩ – حاسم : بڕینەوەی کار

٣٠ – حسام : شیری تیژ

٣١ – حەسەن : باش

٣٢ – حەسیب : بەڕەچەلەك ، ژمێریار

٣٣ – حمدان : دووحەمد

٣٤ – حەمدی : شوکرانە بژێری

٣٥ – حەمزە : شێر

٣٦- حمید : سوپاسگوزار

٣٧ – حیدر : شێر

٣٨ – خالص : ساف ، پاك

٣٩ – خباب : بەرز

٤٠ – خبیب : جۆرەڕۆیشتنێکە

٤١ – خزیمە : جۆرە گوڵێی بۆنخۆشە

٤٢ – خەتتاب : ڕەوانبێژ ، وتاربێژ

٤٣- خلیل : دۆست ، هاوڕێ

٤٤ – داود : ناوێکی عیبرییە بەمانای خۆشەویست

٤٥ – ڕەئوف : میهرەبان (تێبینی : لەزمانی کوردی پیتی (ر)لەسەرەتای وشەبێ حەفتی لەبن دەنوسرێ)

٤٦ – ڕائید : ڕێبەر ، پێشڕەو

٤٧ – ڕاشد : ڕێپیشاندەر

٤٨ – ڕاغب : دڵخواز ، ویستی لەسەر

٤٩ – ڕەشاد : ڕێنمویی کار

٥٠ – رشدی : ڕێپیشاندەر

٥١ – رشید : ژیر

٥٢ – رضوان : ڕازیبوون

٥٣ – رفیق : هاوڕێ

٥٤ – ڕەمزی : هێما

٥٥ – ریاض : بێستان ، مێرگ

٥٦ – زاهد : دنیانەویست

٥٧ – زاید : زێد

٥٨ – زبێر : بەهێز

٥٩ – زێدان : زیادبوون

٦٠ – ستار : داپۆشەر

٦١ – سراج : چرا

٦٢ – سەعدون : بەفەڕ

٦٣ – سفیان : پەلە

٦٤ – سلمان : بێ عەیب

٦٥ – سلێمان : بچوککراوەی (سلمان)ە

٦٦ – شعیب : بچوککراوەی (شعب) ە ، واتا : گەل

٦٧ – شفیق : بەسۆز

٦٨ – شیبە : جۆرە درەختێکە

٦٩ – ضحاك : زۆرپێدەکەنێ

٧٠ – صائب : ڕاست ، دروست

٧١ – صباح : بەیانی

٧٢ – صبحی : بەیانی

٧٣ – صدقی : ڕاست

٧٤ – صهیب : ڕەنگی مەیلەوسوورتاڵە

٧٥ – تارق : ئەستێرەی بەیانیان

٧٦ – تەلحە : جۆرە درەختێکە

٧٧ – تەلعەت : گزنگی خۆر

٧٨ – عائض : قەرەبوکار

٧٩ – عباس : شێر

٨٠ – عدنان : مانەوە

٨١ – عکرمە : تاریکی شەو

٨٢ – علاء : بەرز ، بڵند

٨٣ – علی : بەرز ، بڵند

٨٤ – عماد : ستوون

٨٥ – عەممار : ئاوەدانکەرەوە

٨٦ – عومەر : هەوڵی ئاوەدانی وشارستانیەت دەدات

**٨٧ — عواد : سەردان**

**٨٨ — غسان : تەمەنی لاوی**

**٨٩ — فادی : خۆبەخش**

**٩٠ — فاروق : جیاکەرەوە(ناسناوی ئیمامی عومەرە (خوای لێ ڕازی بێ)**

**٩١ — فرج : کرانەوەی دەرگای خۆشی دوای ناخۆشی**

**٩٢ — فرحان : دڵخۆش**

**٩٣ — فرید : بێ وێنە**

**٩٤ — فهد : پڵینگ**

**٩٥ — فەوزی : سەرکەوتن**

**٩٦ — فیصل : دادوەر**

**٩٧- مازن : ڕوخساردرەوشانەوە**

**٩٨ — مەتین : بەهێز**

**٩٩ — مورتەزا : خەڵك لێی ڕازیبن**

**١٠٠ — مەسعود : ئاسودە ، کامەران**

**١٠١ — موشیر : ئاماژە بۆکراو**

**١٠٢ — مستەفا : هەڵبژێردراو**

**١٠٣ — قاسم : دابەشکردن**

**١٠٤ — قتادە : جۆرە درەختێکە**

**١٠٥ — قوددامە : کۆن**

**١٠٦ — قیس : هێز**

**١٠٧ — کازم : ئارامگرتن**

**١٠٨ — کەیفی : شێواز**

**١٠٩ — لوتفی : نەرم ونیان**

**١١٠ — لقمان : بەربەست**

**١١١ — لیث : شێر**

**١١٢ — مجید : شکۆدار**

**١١٣ — مرشد : ڕێبەر**

**١١٤ — موسعەب : گران**

**١١٥ — موعاز : ڕووتێکردن**

١١٦ — موقەتەدا : شوێنی دەکەوێ

١١٧ — مقداد : جوان وبالاَّبەرز

١١٨ — مکتوم : شاردراوە

١١٩ — ممدوح : ستایشکراو

١٢٠ — مناف : بەرز ، سەربڵند

١٢١ — منیر : ڕووناك ، درەوشاوە

١٢٢ — موسی : ناوێکی عیبرییە٠

١٢٣ — نادر : دەگمەن

١٢٤ — نازم : دانەر

١٢٦ — نایف : بەرز ، بڵند ، سەرپەرشتیار

١٢٧ — نامق : چاکزان

١٢٨ — نزار : لەئەلنەزر هاتووە واتا : کەم ، رجل نزور واتا : پیاوێکە کەم قسەدەکات٠

١٢٩ — هانی : خۆشگوزەران

١٣٠ — هود : ناوێکی عیبرییە بەمانای بەڕێزوشکۆدار

١٣١ — هەیسەم : باز

١٣٢ — هشام : بەخشندە

١٣٣ — ولید : منداڵ

١٣٤ — یاسر : ئاسان

١٣٥ — وائل : داواکردن

١٣٦ — یەعقوب : ناوێکی عیبرییە بەمانای لەدواهاتن٠

١٣٧ — یوسف : ناوێکی عیبرییە بەمانای زێدە یان جوان٠

١٣٨ — اقبال : بەرەوڕووهاتن

١٣٩ — احلام : خەون

١٤٠ — ایناس : هۆگری

١٤١ — بهاء : جوان

١٤٢ — بیان : بەشتێك دەوترێ کەڕوون وئاشکرابێ

١٤٣ — تحفە : شتی نایاب

١٤٤ — حسیبە : پایەدار

١٤٥ — حەفسە : ڕەحمەت

**١٤٦ — حەليمە : لەسەرخۆ**

**١٤٧ : حەنيفە : پاك ، بەمانای ڕاستیش دێ**

**١٤٨ — رابعە : ژمارە چوار**

**١٤٩ — رابيحە : براوە**

**١٥٠ — رغدە : خۆشگوزەران**

**١٥١ - زينب : جۆرە درەختێکە بۆنی خۆشەو شێوەی جوانە**

**١٥٢ - زينە : ڕازاندنەوە**

**١٥٣ — صبيحە : بەيانی**

**١٥٤ — سلمی : بێ عەيب**

**١٥٥ — ساميە : پلەبەرز**

**١٥٦ — ساهرە : بەخەبەرلەشەوان**

**١٥٧ — سوعاد : کامەران**

**١٥٩ — سەعديە : ئاسوودە**

**١٦٠ — لامعە : درەوشاوە**

**١٦١ — مديحە : ستايشکراو**

**١٦٢ — نابغە : بليمەت**

**١٦٣ — نجوی : چرپە : نهێنی**

**١٦٤ — نەجيبە : ڕەسەن**

**١٦٥ — بەهرۆز : خۆشترين ڕۆژ**

**١٦٦ — يسری : ئاسان**

**١٦٧ — خوليا : تامەزرۆ**

**١٦٨ — ڤارين : بارين**

**١٦٩ — نيهاد : ويژدان ، دڵ ودەروون**

**١٧٠ — سۆما : ڕووناکی چاو**

**١٧١ — محمد : بەواتای کەسێکە کەستايشێکی زۆربکرێت بەهۆی ئەوگەورەييەی کەهەيەتی٠**

**١٧٢ — احمد : بەواتای کەسێك دێت کەبەرێژەيەکی زۆرستايش وحەمدی خوابکات٠**

**١٧٣ — محمود : ستايشکراو**

**١٧٤ — حامد : ستايشکار**

**١٧٥ — دلزار : خەفەتبار**

**١٧٦ — زرنگ : وشيار**

**١٧٧ — كۆسار : چيا**

**١٧٨ — لاوكۆ : تازەپێگەیشتوو**

**١٧٩ — ئاوێزان : تێكەڵ**

**١٨٠ : ئارينه : ناوى گوڵێكه**

**١٨١ — بەهره : توانا**

**١٨٢ — تارا : سەرپۆشى بووك ، جۆرەقوماشێكى تەنكەلەكوردەواریداجاران تاراى زەردوسوروسەوزومۆريان دەدابەسەرودەم وچاوى بوكدالەكاتى گواستنەوەيدا٠**

**١٨٣ — تاڤان : تاوى باران**

**١٨٤ — چيمەن : فريز**

**١٨٥ — ڕاز : وتەى نهێنى**

**١٨٦ — ڕەوەز : چين چين بەردى سەرچيا**

**١٨٧ — ئۆسكار : دياريیەكەدەدرێتەهونەرمەندان**

**١٨٨ — ئەلوەند : ڕووبارێكه لەخانەقين**

**١٨٩ — نەجمەدين : ئەستێرەى ئاين**

**١٩٠ — شەمسەددين : خۆرى ئاين**

**١٩١ — فەخرەددين : شانازى ئاين**

**١٩٢ — بهاء الدين : جوانى دين**

**١٩٣ — ابراهيم : بەسريانى واتا باوكێكى بەبەزەيى (بڕوانە : جلاء الافهام )**

**١٩٤ — كەژاڵ : بەومەڕوبەرانه وتراوه كەدەوروبەرى چاوى سپى بێ وچاوى ڕەش بێ٠**

**١٩٥ — كاكل : پێكهاتووه لە(كاك) وپاشگرى (ل)٠**

**١٩٦ — ياسەمين : گوڵێكەلەسەرەتاى بەهاداشيندەبێ وگوڵى سپى يان وەنەوشەيى دەگرێ وبۆنى خۆشە٠**

**١٩٧ — عبدالستار : يەكێك لەناوەكانى خواى گەورە (ستار)ە٠لەيەكێك لەڕيوايەتەكان دەڵێت:(حەزرەتى موسا(سەلامى خواى لێبێ) دوعادەكات باران نابارێ ، خوا(جل جلاله)دەفەرموێ : بڕۆن هەمووتان بەيەكەوەدوعابكەن ، باران نابارێ ، خواى گەورەوەحى بۆدەنێرێ دەفەرموێ : يەك كەستان تێدايەگوناهێكى زۆرگەورەى كردووه تائەوتان تێدابێ دوعاكەوەرناگرم٠ئەومرۆڤەگوناهبارەلەبەرخۆيەوەدەڵێ : خوايەگيان ئاشكرام نەكەى خوايەتەوبەبێت ، بەڵێن بێت ئيترناچمەوەسەرئەوگوناهه ، دەڵێ يەكسەرباران دەست پێدەكات ، حەزرەتى موسادەفەرموێ : خوايەكەس قسەى نەكرد! خوا(جل جلاله) فەرمووى : موسامن**

ئەوهەمووگوناهەی کردسەترم کردبوو ئێستاتەوبەی کردووە چۆن ئاشکرای دەکەم ، چۆن پێت دەڵێم کێیە)٠لەبەرئەوەیەکێك لەسیفەتەجوانەکان ئەوەیەسەتری عەیبی خەڵکی بکەی٠

## مرۆڤ چییە ؟

مرۆڤ بوونەوەرێکی بەرپرسیارە ئەرکی دین وئەخلاقی لێ داواکراوە ، دووفریشتەکاروکردەوەکانی دەنووسن تاوادەی مردنی دێت،ماوەی لەدنیاداکەمەولەگۆڕدا درێژخایەنەولەدوارۆژدا نەبڕاوەیە٠

(ئەرستۆتالیس) دەڵێت : ( مرۆڤ بوونەوەرێکی هۆشدارە )٠

(ئەرستۆ) دەڵێت : ( مرۆڤ زیندەوەرێکی قسەکەرە )٠

(ئەفلاتوون) دەڵێت : ( مرۆڤ زیندەوەرێکی سیاسییە )٠

فەیلەسوفی ئەمریکا (فرانکلین) وتوویەتی : (ئادەمیزادگیاندارێکی ئامرازدروستکەرە)٠

## قەزاوقەدەر :

باسکردنی بابەتی قەزاوقەدەربوارێکی فراوانەوشارەزاییەکی باشی لەدینداپێویستە٠ڕەنگەئەوبەسەرهاتانەی ڕۆژانەبەسەرمان دێن هەندێکیان لائیرادی بن وبەدەست خۆمان نەبن ، بەلام هەندێکیان دەگونجێ خۆمان فاکتەروهۆکاری سەرەکی بین٠ ئادەمیزادئەگەرسەرنج بدات لەگەلێك لاوەخۆی توانای هیچ بڕیار دانێکی نییە ، گەلێك کاروبارهەیەدێت بەبێ ئەوەی هەست پێبکات یان دەسەلاتی هەبێت ، دەبینیت کابرایەکی بازرگان کۆمەلێك کە ل وپەل لەولاتێك دەکڕێت ، بەلام ئەوپاپۆرەی بازرگانییەکەی تێدایە لەدەریادا توشی بای بەهێزوشەپۆلی گەورەدەبێت ونقوم دەبێت٠ بەلام پیاوێك بەناحەق گوللە بەناحەزێکی خۆیەوەدەنێت ودەیکوژێ ، ئەم پیاوەتاوانباردەبێت ، بەلام لەعیلمی ئەزەلی خۆی دەزانێت ئەم پیاوە لەفلان جێگاوکات وسەعات بەتواناوئیختیاری خۆی ئەم ناحەز ەی خۆی دەکوژێت ، ئەم زانینەی خوا(جل جلالە)قەدەرە(نوسراو) ، بلاتەشبیە زانایەکی فەلەکی بەپێی ئەوزانستەی کەهەیەتی زانی لەفلان ڕۆژوسەعات خۆریان مانگ دەگیرێت ، دوایی چۆنی وتبوو وادەرچوو قسەکەی ئەونەبۆتەهۆی ئەم خۆرگیران ومانگ گیرانە ، کەواتەعیلمی ئەزەلی خوا(جل جلالە) هۆکاری کردەوەی ئادەمیزاد نییە وەخوای تەعالانایەوێ ئەتوببیە سەبەب بۆکوشتنی کەسێك ، بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کەمرۆڤ ئەوەی بیەوێت بتوانێ بیکات هەندێك جارخوای گەورە هۆکاری وای دەخاتە بەردەم کەئارەزووە کەی نەیەتەدی ونەتوانێت بیکات ، تەماشادەکەی یەکێك گوللەبەیەکێك وەدەنێت بەلام گوللەکەلەلولەی دەمانچەکەوەگیردەبێت ونایە تەدەرەوە وبەوکەسەناکەوێت یان وادەبێت کەسێك دەچێتەسەرمالێك بۆدزی،بەلام خاوەن مال بەخەبەردێ ودزییەکەی لێ ناکرێت٠  خوای گەورە ویست وهەلبژاردنی بەمرۆڤ داوە ، بەویست وهەلبژاردنی خۆیان گوێڕایەلی دەکەن ، بەویست وهەلبژاردنی خۆشیان سەرپێچی دەکەن ، مرۆڤ لەتوانای دایە بچێت بۆمزگەوت

ولەتوانا شیدایە بچێت بۆمەیخانەومەی بخواتەوەبەلاّم پاداشت وسزاشی بۆکردەوەکانی داناوە ، بۆیە بۆهیچ کەس نییە تاوان ئەنجام بدات وبلێ قەدەری خوایە٠ ئەگەرکەسێکی کوژرا هەوڵی کوشتنی بکوژناداتەوە ؟ ئەی بۆچی داوای تۆڵە دەکرێ ؟ وەپێویستەمرۆڤ تائەوپەڕی توانای خۆی خۆی بپارێزێ ، جائەگەرلەگەڵ خۆپارێزی شتێك هات ، ئەوەشتێکی ترە٠ عەبدولاّی کوڕی عەبباس (خوای لێ ڕازی بێ) ، دەڵێ : ڕۆژێکیا ن لەپشتی پێخەمبەرەوە بووم ، پێمی فەرموو : ئەی لاوەکە ، چەند وشەیەکت فێردەکەم باش گوێی بۆبگرە : هەرکاتێ پاڕایتەوە تەنها لەخودا بپاڕێوە ، هەرکاتێ داوای کۆمەکیت کرد تەنهاداوا لەخوابکە ، تەنیاخودابەفریاگوزاری خۆت بزانە ، چونکە ئەگەرسەرجەم خەڵکی وتەواوی میللەتان کۆببنەوە بۆئەوەی شتێك لەسوودوخێرو خۆشی بۆتۆدابین بکەن ناتوانن بۆتی مسۆگەربکەن ، تەنهائەوەنەبێ خودابۆتی قەراردابێ وبۆتی نوسیبێ ، بەهەمان شێوە ئەگەرکۆببنەو ە بۆئەوەی شتێك لەزیان وناخۆشی وزەرەرتوشی تۆکەن ، ناتوانن دووچارتی کەن مەگەرخودا (جل جلاله)لەسەرتی دانابێ وبۆتی نوسیبێ ، چونکە قەلەمەکان هەرچییان نوسیبێ نوسییانە ، تێنو سەکانیش وشك بوونەتەوە) رواه الترمذی٠ بۆیەنابێ جگەلەخوا(جل جلاله) کەس بەفریاگوزاربزانین وهاواری لێ بکەین ، کەواتە لادانی زیان وناخۆشی تەنیابەدەست خودایە نەك بەدەست پیاوچا کان ، دەبینین زۆرلەنەفامان هاواردەکەن : یاحەزرەتی غەوس ! مەبەستیان شێخ عەبدولقادری گەیلانی ، خاوەن تەریقەتی قادرییە ، کەوشەی (غەوس) واتا : فریاکەوتن٠دوعالەعەرەبیدادەڵێن (استغاثة) ، لەکوردیدا (هاوارلێکردن) ، لەفارسیدا (فریاد) غەوث بەمانای فریاکەوتن ، هەروەکوبەباران دەوترێ (غیث) چونکەدەگاتەفریای خەڵك یان پێیان وایە سەردا نی قەبری فلاّن پیاوچاك شیفای نەخۆ شییە ، یان هۆی منداڵبوونە! دارچاك ودارئالاّو گرێدانی تیلمەپەڕۆ بەدرەختێکەوە ، (دۆناڵسۆن) باسی(درەختی مراز) دەکات ، کەوادەبێ لەسەرهیچ گۆڕێکیش نەبێ ، دەڵێ : (بۆی هەیەڕۆژێ لەڕۆژان پیاوچا کێ ، سەیدێ لای دابێتە ژێرئەم دارەجابۆیەدرەختەکەپیرۆزبووەلایان ! ساویلکەکان پەڕۆو داوی بەچلەکانەوەدەکەن ومرازی لێ دەخوازن ! وەلەخۆیان دەگرن ئەگەرمرازیان هاتەدی خێری بۆبکەن ! )٠بڕوابوون بەقەزاوقەدەر ، یەکێکەلەشەش بنچینەکانی ئاینی ئیسلام

سوودەکانی بڕوابوون بەقەزاوقەدەر :

١ – خۆڕاگرتن لەسەربەلاّوموسیبەت ، دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی ئێش وئازاری ئەوبەلاّیە ، چونکەکەسێك بڕوای وابێ کەهەرچی ڕوودەدات ئەگەرخوا (جل جلاله) ئیزنی لەسەرنەبێ ڕوونادات٠

٢ – ئەگەرکەسێك بڕوای وابێ نەئازایەتی لەمردن نزیکت دەکاتەوە، نەترسان تەمەن درێژدەکات٠یەکێك لەبابەتەکانی قەزاوقەدەرمەسەلەی ڕزق وڕۆزییە بێگومان مرۆڤ دەبێ دەست بداتەکارێك ئینجاخوای گەورەڕزقی بۆدەنێرێ هەروەك خوای گەورەڕزق باڵندەیەك دەدات ڕزقی مرۆڤیش دەدات وەکولەحەدیسداهاتووە کەباڵندەبەیانی زووبەسکی بەتاڵەوە دەچێتەدەرەوەئێوارەبەسکی پڕەوەدێتەوە٠خوای گەورەڕزقی باڵندەکەدەدات بەلاّم بۆی ناخاتەناوهێلانەکەی٠کارکردن ئەگەرچی سەرچاوەی ڕزقە ، بە

لاَم پێویستی بەبەرەکەتی خوا(جل جلاله)هەیە بۆنموونەکورددەڵێ (لەتۆحەرەکەت لەخوابەرەکەت)٠

**شارستانییەت چییە ؟**

شارستانیەت دوولایەنە ، لایەنی مەعنەوی بریتییە لەباشترکردن وپێشکەوتووترکردنی کۆمەڵگەوجێگرتنەوەی داب ونەریتی باش لەجێگەی داب ونەریتی کۆن ورزی ودواکەوتوو ، بینای جوان وشتی لەوبابەتە لایەنی ماددی شارستانیەتن ، بەلاَم لایەنی گرینگی شار ستانییەت خۆی لەڕەوشتی بەرزوجواندا دەبینێتەوە٠

**لەبارەی سەلامکردن :**

یەکێکەلەوئەرکەکۆمەلاًیەتییانەی کەدەبێتەهۆی نەهێشتنی رق وکینەوپتەوکردنی پەیوەندییەکۆمەلاًیەتییەکان٠ ( فسلموا على انفسكم تحية من عندالله مبركة طيبة ) النور : ٦١

واتا : (کاتێك چوونە ناوماڵێکەوە سەلامی خوای گەورە لەدانیشتوانی ئەوماڵە بکەن ، ئەوسەلامەی موبارەکەودەبێتەمایەی زیادبوونی خۆ شەویستی نێوانتان وبیسەرپێی خۆشحاڵ وکەیف خۆش دەبێت) وشەی البركە : بریتییەلەزیادبوون وگەشە٠ ( وجعل فيها روسى من فوقها وبرك فيها ) فصلت : ١٠ واتا : (خوای گەورە چەندین شاخی چەقاندووە لەسەررووی زەوی وبەرەکەتی خۆی بەسەرداڕ شتووە (زەوی توندکردووەو وای لەزەوی کردووە بەردەوام خێرو چاکەی هەبێ بۆخەڵك وزیندەوەران) ( وبركنا عليه وعلى اسحق ومن ذريتها محسن وظالم لنفسه مبين ) الصافات : ١١٣ واتا : (بەرەکەتی خۆمان بەسەرئیبراهیم وکوڕەکەی ئیسحاق دا ڕشت ولەنەوەکانی ئەم دوانە چەندین کەسی گوێڕایەل وخواپەرست هەبوو ، هەروەها هەیان بوو ستەمی لەخۆی کردو سەرپێچییەکەی ئاشکراوڕوونبوو) وەئەبوداود لە (السنن) داوئیمامی ئەحمەد لە(مسند)دا گێڕاویەتییەوە کەکاتێك پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) (جوەیرییە)ی خواست : (نەم دیبووهیچ ئافرەتێك ئەوەندەی بەرەکەتی زۆری بۆهۆزەکەی هەبێت وەکوجوەیرییە) (چونکەکاتێك پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) هاوسەرگیری لەگەڵ کرد بەهۆی ئەوەوەچەندین کەس لەهۆزەکەی ئەوئازادکران) ، هەروەها پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :(تمام تحيتكم بينكم المصافحه) واتا : (بەتەوقەودەست لەناودەست سەلا مکردن تەواودەبێت) ، هەروەها پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) سەلامی لە دایکی (هانی) کردو فەرمووی : ( مرحبا بأم هانىء) ( دایکی هانی خوشکی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە(ڕەزای خوای لێ بێ)٠

لەناوعەرەبدا ئەگەریەکێك بیویستبا سوێند بخوات لەسەرشتێکی ئاشکرا ، دەیوت : (لاأقسم) واتا (سوێندناخۆم) ، واتا ئەوەندەئاشکر ایە پێویست بەسوێند ناکات ، کەئەمەبەڕاستی بەقەدەرسوێندێك پشتیوانی قسەکەدەکات (بڕوانە : تەفسیری خاڵ ، جزمی سێیەم)

عن جابربن عبدالله قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : (السلام قبل الكلام)٠رواه الترمذی واتا : (سەلامکردن پێش قسەکردنە)٠ خوای گەورە دەفەرموێ : (واذاحييتم بتحية فحيوابأحسن منهاأوردوها) النساء : ٨٦ واتا : (ئەگەرسەلامتان لێکرابەشێوەیەکی جوانتروەلاٚم بدەنەوەیان وەك خۆی)٠لەئیمامی عەلییەوە(خوای لێ ڕازیبێ) دەڵێ : عەمارئیزنی خواست لەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەنگی ناسییەوە فەرموی : (مرحبابالطيب المطيب) واتا مرحباپاکی پاکەوەبوو٠رواه الترمذی٠لەئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازیبێ)دەڵێ : پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموی : بەشیان دەکات کۆمەڵێك ئەگەرپێکەوەدەڕۆیشتن یەکیان سەلام بکات برِی هەموویان دەکەوێ٠رواه ابوداود٠زوهری دەیگێڕێتەوە عروە دەڵێ : عائیشە (خوای لێ ڕازیبێ) وتی : کۆمەڵێك جولەکەهاتن بۆلای پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) وتیان : السام علیك واتامردنت لەسەربێ ، لێیان تێگەیشتم پێیانم وت : علیکم السام واللعنة واتا مەرگ ونەفرین لەئێوەبێت ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموی : لەسەرخۆبەعائیشە ، چونکەخوانەرم ونیانی پێخۆشە لەهەمووکارەکانت هەبێ ، وتم : ئەی پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) گوێت لێنەبووچییان وت ؟ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموی : ئەوەندە بەسەبڵێی : وعلیکم لەئێوەبێت٠بوخاری وموسلیم وترمذی ڕیوایەتیان کردووە٠لەعائیشەوە (خوای لێ ڕازیبێ) دەڵێ : پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموی : بۆهیچ موسوڵمانێك ڕەوانییەزیادلەسێ ڕۆژدەنگ دابڕێت لەموسوڵمانێك ، جائەگەرپێیگەیشت تاسێ جارسەلامی لێکراهەمووجارێ وەلاٚمی نەدایەوە ئەوەتاوانەکەی لەئەستۆدایە٠رواه ابی داود٠ ئەگەرهەردووکەسەکەپیادەبوون ، کامەیان لەپێشداسەلام لەوی تربکات ئەویان فەزلی زیاترە٠لەئەبوئومامەوە (خوای لێ ڕازیبێ) دەڵێ : پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرمووی : لەپێشترین کەس لەلای خوا(جل جلاله)ئەوەیەسەرەتاسەلام دەکات٠ئەبوداودڕیوایەتی کردووە٠لەعەماری کوڕی یاسرەوە (خوالێی ڕازیبێ) دەڵێ : پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرمووی : سێ شت هەن لەهەرکەسێ داهەبێ باوەڕی لەخۆیداکۆکردۆتەوە : ویژدان هەبوولەدەروونیدا ، سەلامکردن لەهەمووکەسێك ، بەخشین لەکاتی نەداریدا٠لەئەبوهورەیرەوە (خوالێی ڕازیبێ) پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : بچوك سەلام لەگەورەبکات ، ئەوەی تێدەپەڕێ سەلام لەدانیشتوبکات ، کەم سەلام لەزۆربکات٠لەئەبوئومامەی سەهل ی حەنیفەوە (خوالێی ڕازیبێ)لەباوکییەوە دەڵێ : پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : هەرکەسێ وتی : (السلام علیکم) (دە)چاکەی بۆدەنوسرێ ، هەرکەسێ وتی : (السلام علیکم ورحمة الله) بیست چاکەی بۆدەنوسرێ ، وەهەرکەسێ وتی : (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته) (٣٠) سی چاکەی بۆدەنوسرێ٠لەئەسمای کچی یەزیدەوە (خوای لێ ڕازیبێ) دەڵێ:(پێخەمبەری خوا(درودی خوای لەسەربێ) ڕۆژێك بەمزگەوتداتێپەڕی ئێمەکۆمەڵێ ئافرەت بووین دانیشتبووین ، دەستی بەرزکردەوەوسەلامی لێکردین)٠ رواه أبوداودوالترمذی ئەمەوالێکدەدرێتەوەدرودی خوای لێبێ بەدەم

وتويەتی بەدەست ئاماژەی کردووە٠چونکەجاری وایەئەگەرلێت دووربی گوێبیستی سەلامەکەت نابی بۆیەپێویست دەکات دەستت بەرزبکەیەوەوبەزمان سەلامەکەبلێی٠

**زاراوە :**

وشەیەکە لەئەنجامی ڕێککەوتنی شارەزایانی زمان بۆناولێنان داها تووە٠کۆڕی زانیاری کورد کەلەساڵی (١٩٧٠) دامەزرێنرا لەبارەی دانانی زاراوە بایەخێکی تەواوی پێدابوو ، چەندلێژنەیەکی تایبەتی بۆلێکۆڵینەوەلەزاراوەی زانستی دانابوو٠

ئایدەلۆژیا : زانستی بیروباوەڕ

ئارکیۆلۆجیا : شوێنەوارناسی

ئاپارتایت : جیاوازی ڕەگەزی

ئاپارتمان : باڵەخانە

افراط : زیادەڕۆیی

تفریط : کەمتەرخەمی

ئاناتۆمی : زانستی توێکاری

ئەنیما : نەخۆشی کەم خوێنی

ئەلتەرناتیف : بەدیل ، جێگرەوە

ئەکتیف : کارا ، چالاك

ئەجیندا : کارنامە ، بەرنامە

ئیستاتیکا : جوانیناسی

ئیکۆنۆمی : ئابوری

ئینتەرناسیۆنالیزم : نێونەتەوەیی

ئیکۆلۆجی : ژینگەزانی

ئیمتیاز : مافی تایبەت

ئۆتۆکراسی : حوکمی تاکەکەسی

ئۆلیگارشی : حوکمی کەمینە

ئۆرگان : زمانحال

ئوتارکی : سەربەخۆیی ئابوری

پرۆتستۆ : ناڕەزایی دەربڕین ، ئیدانە ، ئیحتیجاج ، واتاناڕازیبوون وبەرزکردنەوەی دەنگ بەنەخێربۆبڕیارێك یان کرداروهەڵوێستێك٠

پاسیف : ناکارا

پۆلەتیك : سیاسەت

پلۆرالیزم : فرەیی

محافیزکار : ئەوکەسانەی داب ونەریت وکلتوردەپارێزن.

زمانی ستاندارد : بریتییەلەزمانی فەرمی هەرولاّتێك دەبێت بەزمانی خوێندن ویاساوکتێب وئەدەب ودام ودەزگاکانی ولاّت وڕاگەیاندنەکان ، لەقوتابخانەوزانکۆوڕادیۆوتەلەفزیۆن وشوێنەفەرمییەکان.

نەوجەوان : کەسێك دەگرێتەوەلەتەمەندابچووکدابێت ئەوکەسانەدەگرێتەوەکەلەخوارتەمەنی (١٨)ساڵیدان ، نەوجەوان دەناسرێت بەکەسێك تەمەنی (٧ — ١٨) ساڵ بێ ، ئەمەش بۆدووبەش پۆڵێنکراوە :

١ — الصبی : حەوت ساڵ تەمەنی هەبێ ونەگەیشتبێتەپانزەساڵی.

٢ — الفتی : پانزەساڵی تەواوکردبێ ونەگەیشتبێتەهەژدەساڵی.

جیهانبینی : بۆچوونی کەسێکەلەسەرکاروباری جیهان ، تێڕوانینی کەسێکەلەجیهان.

تیۆری زانین (ئەپستمۆلۆجیا) : بابەتێکی سەرەکی فەلسەفەیەهەوڵدەدات وەلاّمی ئەوپرسیارەبداتەوەمرۆڤ چۆن زانیاری بەدەستدەخات ؟

دیارەچەندرێگەیەك هەیەبۆدەستخستنی زانیاری ؛ ئەزموون ، هەستەکان ، واقیع.

ڕەها (موتلەق) : بەمانای ئەوەی کەخاڵی بێت لەڕێژەیی وسنورداربوون.

دیموکراسیەت : ئازادی ڕادەربڕین ، هەڵبژاردن ، جیاکردنەوەی سێ دەسەلاّتەکە ، پاراستنی مافی مرۆڤ.

مافی مرۆڤ : مافی ژیان ، دادگاییکردنی ئاشکرا ، هاوسەرێتی ، ئازادی هاتوچۆکردن ، پارێزگاریکردنی شوێنەپیرۆزەکان وپارێزگاریکردنی بریندارودیل لەجەنگدا.

دەوڵەت : ئامرازێکەبۆبەڕیوەبردنی کاروباری ولاّت ، بەرجەستەکردنی یاساوپاراستنی بەرژەوەندییەکانی تاك وکۆمەڵگەیە.

لیبڕاڵ : لەئایدیای هەندێك کەس لایەنگری ئازادی ویەکسانی مافەکانی مرۆڤ وئازادی ڕادەربڕین بەلاّم لەئایدیای هەندێك کەسی ترئازادی بێسنوور(بەڕەلاّیی)یە.

ئەتەکێت : لەفەرهەنگی لۆنگمانداهاتووە : (یاسایەکی شێوازبەندی ڕەفتاری بەڕێزانەیەلەکۆمەڵدا) وەلەفەرهەنگی ئۆکسفۆردداهاتووە : (یاسایەکەبۆڕێزگرتن ورەفتاری ڕاست وگونجاو).ئەتەکێت بریتییەلەیاساورێساله : قسەکردن ، جل وبەرگ ، نانخواردن ، ...هتد.بۆنموونەئەتەکێتی زمانی واتاشێوازی بەکارهێنانی وشەوڕستە.ئەتەکێتی نانخواردن بۆنموونەلەئایینی ئیسلامدا نانخواردن چەندئاداب ونەرریتێکی هەیەلەسەرەتادابەناوی خوادەست بەخواردن دەکرێت ، بەدەستی ڕاست دەخۆی ، لەکۆتاییداسوپاسی خوادەکەی ، لەپێش ولەپاش نانخواردن دەستت دەشۆی.یاخودئەتەکێتی جل وبەرگ بۆنموونە بۆینباغ بەشێکەلەئەتەکێت جدییەت نیشاندەدات وکەسایەتی ڕێك وپێك ورێزلێگیراودەکات

**یاخودجانتای ئافرەت شەخسییەتی ئافرەت ڕێك وپێك دەکات وسیمای جیاکردنەوەی پیاوەلەئافرەت٠ئەتەکێت خۆی وشەیەکی فەڕەنسییەبەمانای (پێناس) ، پێناس ئەوبلیتەیەکەڕێنمایی تایبەت بەوهەڵسوکەوتانەی تێداتۆماردەکرێت کەدەخوازرێت لەپەیوەندییەکۆمەڵایەتییەکان وناوەندەنێودەوڵەتییەکاندارەچاوبکرێت٠**

**لێبوردەیی : قبولکردنی تێڕوانینی خەڵکانی دیکەلەئاین وکلتوروفەراهەمکردنی ئازادی ڕادەربڕین وبەدیهێنانی مافی قسەی جیاوازوڕەخنەگرتن٠**

**کۆمەڵی مەدەنی : بریتییەلەهەبوونی یاساوفرەلایەنی وپاراستنی مافی کۆمەڵایەتی وبەرجەستەکردنی مافی میللەت٠**

**پرۆفیشناڵ : کارامە ، پیشەیی**

**تۆبۆگرافیا : بەرزونزمی ڕووی زەوی**

**تۆتالیتار : تاکڕەوی**

**تابۆ : قەدەغە**

**تێز : لێکۆڵینەوە**

**تیراژ : ژمارەی کتێب ی چاپکراو**

**جیۆلۆجی : زەوی ناسی**

**جوگرافیا : هێلکاری زەوی**

**جیۆپۆلەتیك : جوگرافیای سیاسی**

**جڤاتی : کۆمەڵایەتی**

**داتا : ژمارە ، زانیاری**

**داینەمۆ : بزوێنەر ، بەگەڕخەر**

**دیمۆگرافیا : زانستی دانیشتوان**

**دۆگماتیزم : واتا دەمارگرژی لەبۆچوون ، تەنیاخۆی بەحەق دەزانێ وئەوانی ترهەمووشتێکیان هەڵەیە٠**

**دیالێکت : شێوەزار ، لەهجە**

**دینامیکی : جولاو**

**دیسپلین : ڕێکخەر**

**دیماگۆجی : ساویلکە ، خۆشباوەڕ**

**ستاف : دەستەی بەڕێوەبردن**

**سۆسیۆلۆجیا : کۆمەڵناسی**

**سیمبۆلیزم : هێماگەری**

ستاندەر : پێوانەیی

سیناتۆر : ئەندامی ئەنجومەنی پیران

سیمینار : کۆڕ

سیکولاریزم : عەلمانی (لەعالەم هاتووە واتا دنیا ، جیهان)

ستراکتۆر : پێکهاتە ، بونیاد

ستایل : شێواز

فسیۆلۆجی : کارئەندامزانی

فۆبیا : ترس

فیلۆلۆجی : زمانناسی

فۆڕم : شێوە

فەنتازیا : خەیاڵ ، ئەندێشە

فۆڕمەڵە : گەڵاڵە

فاکتەر : هۆکار

فاشیزم : فەرمانڕەوای دیکتاتۆریانە

کۆمسیۆن : لێژنە

کۆنفیدڕاسیۆن : یەکگرتنی چەندهەرێمێك لەدەوڵەتێکدا

کۆسمۆلۆجی : گەردوونناسی

کەپیتالیزم : سەرمایەداری

گلۆباڵ : جیهان

لائیکی : عەلمانی

لۆگۆ : ئارم

لۆبی : فشاری سیاسی

میلۆدی : ئاواز

میکانیزم : ئالیەت

ماتریالیستی : ماددی

بەیاننامە(ڕاگەیەندراو):چەمکی بەیاننامەلەئایەتێکی قورئانی پیرۆز داهاتووە : (هذابيان للناس)ال عمران : ١٣٨ واتا : (ئائەمەی کەباسکرابەیاننامەوڕوونکردنەوەیەبۆخەڵکی بەگشتی)٠چەمکی بەیاننامەجیاوازەلەمانیڤێست ، مانیڤێست لەڕووی قەبارەوناوەڕۆك وشێوازی نووسینەوە بەجۆرێك مانیڤێست فراوانترەوهەڵگری فەلسەفەوئایدەلۆجیایەوگشتگیرە ، هەرچەندەبەیاننامەوەکومانیڤێست

پێناسەی بۆکروە٠هۆکاری دەرکردنی بەیاننامە ڕووداوەکانی رۆژ ، وەك ڕاگەیاندنی هەڵوێستێك لەمەڕبابەتێکی هەنوکەیی ڕۆژوڕاگەیاندنی هەڵوێستی پارتەکان٠بەڵام لەساڵیادی ڕاپەڕین وکیمیابارانی هەڵەبجەودەستپێکی ساڵی نوێی خوێندن وجەژنی ڕەمەزان وجەژنی قوربان و٠٠٠هتد پێیدەوترێ (پەیام) بەڵام بەیاننامەخستنەڕووی هەڵوێستەلەبارەی پێشهات وئەوڕووداوانەی کەبەیاننامەی لەبارەوەدەردەکرێ واتاهۆکاری دەرکردنی بەیاننامەڕوونکردنەوەی هەڵوێستەلەبارەی ڕووداوەهەنوکەیی وکێشەگەرماوگەرمەکان وڕووداووڕاستکردنەوەوبەدرۆخستنەوەوداکۆکیکردن٠

تەندروستی : تەندروستی ئەوەیەمرۆڤ لەش وعەقل وحالەتی کۆمەڵایەتی تەواوبێت ولەهەندێك خوی خراپ بەدووربێت٠

میتۆد : شێواز ، ڕێگە ، مەنهەج

مۆراڵ : ئەخلاق

ناسیۆنالیزم : نەتەوەیی

دەسەڵاتی چوارەم : ڕاگەیاندن ، بۆیەئەم ناوەی لێنراوە ، چونکە چاودێرەبەسەردەسەڵاتی ڕاپەڕاندن دا٠بۆیەکەمجارلەساڵی (١٨٢٨)ئەم زاراوەیەبۆڕۆژنامەبەکارهێنراوە٠

ئەحکامی عورفی : وتا هەڵپەساردنی یاسامەدەنییەکان بۆکاتێکی نادیار٠

نەفیرعام : بانگهێشتی سەربازی٠

شۆك : صەدمە

ڕەشۆك : عامی خەڵك

ئەدا : بەجێهێنان

ڕۆیتەرز : ئاژانسی دەنگ وباسی بەریتانیا

تاس : ئاژانسی دەنگ وباسی ڕوسیا

یونایتد پرێس : ئاژانسی دەنگ وباسی فەڕەنسا

ئاسیۆشێتس پرێس : ئاژانسی دەنگ وباسی ئەمریکا

شرۆڤە : شیکردنەوەورەخنەولێدوان لەسەرئاخاوتن وەیانوسینێك٠

ئاوەز : عەقل

ئەفراندن : داهێنان

دوالیزم : دوانەیی (ساردی وگەرمی ، چاکی وخراپی ، تاریکی وڕوناکی هتد٠

هستریا : بەوکەسانەدەوترێ کەزووتوڕەدەبن وبەشێوەیەکی سەیرهەڵدەچن٠

ناسیۆنالیزم : نەتەوایەتی

چەپ : مارکسی ، بۆیەپێیان وتراوەچەپ ، چونکەلەپەرلەمانی ئینگلیزی لای چەپ دادەنیشتن٠

**عەولەمە : جیهانگیری**

**مەترەپۆڵ : شارەگەورەکان**

**ماهییەت : لەما هی ؟ هاتووە ، واتا ئەوشتەچییە ؟ پرسیارە لەحەقیقەتی شت٠**

**فیمینیزم : لەوشەی فیمینیای لاتینی وەرگیراوە کەواتای ئافرەتە، وا**

**تابزوتنەوەلەپێناوی یەکسانی ئافرەتدا٠**

**مۆنۆپۆلی : پاوانکاری**

**نۆڕماڵ : ئاسایی**

**کۆلۆنیاڵی : داگیرکاری**

**چین : (ماکس ویبەر) ئەوهاپێناسەی (چین) دەکات : (چین کۆمەڵەخەڵکێکە ، تاکەکانی هەمان باری ئابووریيان هەیە)٠**

**دیپلۆماسی : وشەیەکی یۆنانییە بەمانای بڕوانامە (وەسیقە) قسەکردن وگفتوگۆکردن بەیەکێك لەبنەماگرینگەکانی دیپلۆماسی دادەنرێ، چونکەشێوازی قسەکردن کێشەکان بەئاقارێکی باش دەبات ، هەروەهاکەسی دیپلۆماسی دەبێ کەسێکی دڵگیروخۆشەویست بێت وشێوەی قبول بێت ونابێت مڕومۆچ بێت ، هەروەهاجۆری وەڵام دانەوەی دەبێ لەسەرخۆوزانایانەبێت ، هەروەهادەبێت کەسایەتییەکی گەورەوگرینگی هەبێت وزانیاری گشتی هەبێت وئاستی ڕۆشەنبیری بەرزبێت ، هەروەهاڕێزلەووڵاتانەبگرێت کەسەردانیان دەکات٠(بڕوانە: ڕەشیدئارازهەورامی ، دیپلۆماسی وپەیوەندییەنێودەوڵەتییەکان)**

**ئیمپریالیزم : واتاوڵاتێك لەدەرەوەی وڵاتی خۆی دەستدرێژی دەکاتەسەروڵاتێکی تروخەڵکی ئەووڵاتەدەخاتەژێرڕکێفی خۆی وسەرچاوەئابورییەکانی دەڕوتێنتەوە وئیمپریالیزم بەمانای ئیمپڕاتۆری٠**

**کونسول : بەوکەسەدەوترێت لەلایەن وڵاتێکەوەبۆبەجێ گەیاندنی هەندێك کاروباری وەك : فیزاوپاسەپۆرت وهاتوچۆوبازرگانی لەووڵاتەی کەتێیدامیوانە٠**

**خاچی سوور : ڕێکخراوێکی مرۆڤانەیە لەزۆربەی وڵاتانی دنیابوونی هەیە ، ئامانجی یارمەتیدانی مرۆڤایەتییە لەکاتی توشبوون بەکێشەوکارەسات٠ لەساڵی (١٨٣٨) لەجنێف دامەزرا ، دامەزرێنەری سولفرینۆوهنری درنانتە٠**

**مانگی سوور : ڕێکخراوێکی ناحکومییە ، بۆهاوکاری مرۆیی دامەزراوە ، لەزۆربەی وڵاتەعەرەبییەکان بوونی هەیە٠**

**پەیماننامەی ناتۆ : ناتۆلەساڵی (١٩٤٩) ناسناوی (پەیماننامەی باکوری ئەتڵەسی) لێنرا٠سەرجەم دەوڵەتەئەندامەکان لە(ناتۆ)دا هاوکاری سەربازی وهێزدەبن بۆدەوڵەتانی دیکەی ئەندام ئەگەرپێویستیان بوو ، بارەگای سەرەکی لەوڵاتی بەلجیکایە ، واتاشوێنی دانیشتنی کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوی ناتۆ ، ئەوزمانانەی لەکاتی کۆبوونەوەکان لەناتۆبەکاردێن : ئینگلیزی وفەڕەنسییە ، ئەرکی سەرەکی ناتۆبریتییە**

لەپاراستنی ئەندامەکانی ، ئەووڵاتانەی ئەندامن لە(ناتۆ) ، ژمارەیان (٢٨) بیست وهەشت دەوڵەتە : ئەمریکاکەلەڕووی سەربازییەوە گەورەترین دەسەلآتی هەیە لەناتۆدا ، لەساڵی (١٩٤٩) بۆتەئەندام ، هەریەکەلەنەرویج وهۆڵەنداولۆکسنبۆرگ وفەڕەنساوکەنەداودانیمارك وپورتوگال (لەیەکگرتنی هەرێمی پورتۆوغال پێکهاتووە)وبەلجیکاوئایسلەندوئیتاڵیاوبەریتانیاش لەساڵی (١٩٤٩) بوونەتەئەندام٠لەسەرەتاداتەنهائەم دوانزە دەوڵەتەبوونەئەندام لەناتۆ ، دواترژمارەی ئەندامەکانی زیادیکرد ، شانزە دەوڵەتی تربوونەئەندام ، ئەوانیش : ئیسپانیالەساڵی(١٩٨٢) ، ئیتوانیاوبولگاریاوڕۆمانیاوسلۆڤاکیاوسلۆڤینیاولاتیڤیاولیتوانیالەساڵی (٢٠٠٤) وپۆلەنداوچیك ومەجەڕلەساڵی (١٩٩٩) وتورکیاویۆنان لەساڵی (١٩٥٢) وئەڵمانیالەساڵی (١٩٥٥) وئەلبانیاوکرواتیالەساڵی (٢٠٠٤)٠ وشەی (ناتۆ)کورتکراوەی ڕێکخراوی پەیماننامەی باکوری ئەتلەنتیکە ، هەروەهاناتۆساڵێك دووجاریان سێ جارکۆدەبێتەوەئامانجی پارێزگاریکردنەلەجیهان٠

یەکێتی ئەوروپا :

بریتییەلەڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی بۆدەوڵەتانی ئەوروپا ، لە(٢٨)دەوڵەت پێکدێ : ئەڵمانیاوئیتاڵیاوبەلجیکاوفەڕەنساولۆکسنبۆرگ وهۆڵەندالەساڵی (١٩٥٧) بوونەتەئەندام ، دانیمارك وبەریتانیاوئیرلەندالەساڵی (١٩٧٣) ، یۆنان لەساڵی (١٩٨١) ، سویدلەساڵی (١٩٨٥) ، پورتوگال لەساڵی (١٩٨٦) ، ئیسپانیالەساڵی (١٩٨٨) ، نەمساوفنلەندالەساڵی (١٩٩٥) ، استوانیاوپۆڵەنداوچیك وسلۆڤاکیاو سلۆڤینیاولاتیڤیاولیتوانیاومالْتاومەجەڕلەسالی (٢٠٠٤)،بولغاریاوڕۆمانیالەساڵی (٢٠٠٧)کرواتیالەساڵی (٢٠١٣)بۆتەئەندام٠یەکێتی ئەوروپاخاوەن دراوێکی تایبەتییەکەبریتییەلە(یۆرۆ) ، ئەودەوڵەتانەی کەپالێوراون بۆیەکێتی ئەوروپا بریتین لە : مەکدۆنیاوتورکیا ، بەلآم تورکیالەبەرچەوساندنەوەی گەلی کورد ڕەفزی ئەوەدەکرێ ببێتەئەندام لەویەکێتییە٠

یەکێتی ئەفریقیا :

لە(٥٣) پەنجاوسێ دەوڵەت پێکدێ ، بارەگای سەرەکی ئەم ڕێکخراوە لەشاری (ئادیس ئابابا)ی پایتەختی ئەتیوپییایە ، ولآتانی ئەندام : جەزائیر ، کامیرۆن ، کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست ، کۆماری کۆنگۆ، جیبۆتی ، میسر ، ئیریتیریا ، کینیا ، لیبیریا ، لیبیا ، مالی ، مۆریتانیا ، موزامبیك ، ڕواندا ، سنیگال ، ئەفریقیای باشور ، سودان ، تونس ، ٠٠٠هتد ، ئامانجی ئەم ڕێکخراوە لەناوبردنی هەرجۆرە داگیرکارییەکە لەیەکێتی ئەفریقیاوبەرپاکردنی تەباییە لەنێوان ولآتانی ئەندام لەیەکێتی ئەفریقیا٠

نەتەوەیەکگرتووەکان :

ڕێکخراوێکی نێونەتەوەییە ، نزیکەی هەموووڵاتەسەربەخۆکانی جیهانی لەخۆگرتووە ، لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ لەشاری سانفرانسیسکۆلەویلایەتی کالیفۆڕنیای ئەمریکادامەزراوە ، ئەم ڕێکخراوەجێگای کۆمەڵەی نەتەوەکانی گرتەوە پاش سەرنەکەوتنی ڕێکخراوی کۆمەڵەی نەتەوەکان لەڕوونەدانی شەڕی دووەمی جیهانی لەبەرترسی ئەوەی مرۆڤ لەوانەیە شەڕێکی تری لەهەمان جۆردروست بکات (ئەم ڕێکخراوەش سەرناکەوێ) ، ئامانجی ئەم ڕێکخراوە ئاشتی وئاسایشەلەسەرئاستی جیهان وپەیوەندی هاوڕێیەتییانەی نێوانەتەوەکان وهاوکاری ویارمەتیدانی نەتەوەکان ، ئەم ڕێکخراوەخاوەنی شەش دەزگای سەرەکییە : کۆمەڵەی گشتی ، ئەنجومەنی سەرپەرشتیکردن ، ئەمینداریەتی گشتی ، دادگای دادی نێودەوڵەتی ، ئەنجومەنی ئابوری نێودەوڵەتی ، ئەنجومەنی ئاسایش.

ئەنجومەنی ئاسایش :

یەکێکەلەدەزگاگرینگەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان ، ئەرکی سەرەکی ئەم ئەنجومەنە پاراستنی ئاشتی وئاسایشی نێونەتەوەییە ، ئەم ئەنجومەنە(١٥)پانزە ئەندامی هەیە ، پێنج لەمانەوەك ئەندامی سەرەکی هەژماردەکرێن کەبریتین لە : ئەمریکاوبەریتانیاوفەڕەنساوڕوسیاوچین ، پاش دەرکردنی بڕیارەکان هەڵدەستێت بەجێبەجێ کردنی بڕیارەکان.

ڤیتۆ :

وشەیەکی لاتینییە بەواتای (من دژم) ، مافی ڤیتۆ مافی ئەندامی هەمیشەییە.

دادگای دادی نێودەوڵەتی :

دەزگایەکی دادوەری سەربەدەوڵەتەیەکگرتووەکانە ، بارەگای سەرەکی لەشاری (لاهای)یە لەولاتی هۆڵەندا ، کەلە(١٥) پانزە دادوەرپێکدێ.

ئیستعمار : زۆربەی جارولاتەموستەعمەرەکان بەرەوپێشدەبرێ ، قوتابخانەونەخۆشخانەی تێدادەکرێتەوە ، بەلام هەمیشەبۆبەدەستهێنانی دەستکەوتەبۆخۆیان.

کۆلۆنیالیزم : دەستبەسەرداگرتنی ناوچەیەکەهی میللەتێکی دیکەیە ، بەزۆری وزۆردارەکی دەسەلاتی سەربازی بەسەرئەوناوچەیەدەسەپێنێ.

سانسۆر :

واتاچاودێری کردنی بلاوکردنەوەی هەربیروباوەڕوبەرهەمێکی ئەدەبی وهونەری و...هتدکەوروژێنەروترسناك بێ ، وەکوچاودێری کردنی ئێزگەوتەلەفزیۆنەکان وچاودێری کردنی هەمووبەرهەمەهونەرییەکان وڕێکخستنی هاوینەهەوارەکان بەشێوەیەك کەدووربێ لەبەدڕەوشتی وداوێنپیسی وبێ ئابڕوویی.

ڕای گشتی :

واتاڕای زۆرینەی خەڵك ، ڕای جەماوەر٠

ڕۆژهەڵاتناسی :

بریتییەلەهەمووئەودیراسەوتوێژینەوانەی کەڕۆژئاوالەسەرڕۆژهەڵات ئەنجامی دەدات لەڕووی مێژوویی وکۆمەڵایەتی وزمان وئاین وکلتوروسامان وتوانای ئابوری بەمەبەستی دەست بەسەرداگرتن وداگیرکردنبەڵام ئەودیراسانەی ڕۆژهەڵاتی لەسەرکۆمەڵگای خۆی ئەنجامی دەدات پێی دەوترێ توێژینەوە پێی ناوترێ ڕۆژهەڵاتناسی٠

ئیتیك :

واتا(ئەخلاق) لەبواری ڕۆژنامەوانی بەکاردەهێنرێت٠بۆنموونە : پێویستەڕاگەیاندنکارلەکاتی بلاّوکردنەوەی هەواڵداڕێزلەژیانی تایبەتیکەسەکان بگرێت٠بۆنموونە ئەگەریەکێك کێشەیەکی خێزانی هەبێت کەوتبێتەدادگاچ بەرژەوەندییەکی گشتی لەوەدایە ئەوهەواڵەبلاّوبکرێتەوە ؟ یاخودیەکێك ژنی دووەم یان سێیەم دەهێنێت چ بەرژەوندییەکی گشتی لەوەدایە ئەوهەواڵەبلاّوبکرێتەوە ؟ بۆیە نابێت ڕاگەیاندنکارلەسەرژیانی خێزانی کەسەکان شت بنوسێت ، چونکەئەوبابەتانەپەیوەستن بەژیانی تایبەتی ، جگەلەبرینداركردنی هەستی ئەوکەسانەنەبێت هیچ بەرژەوەندییەکی گشتی لەبلاّوکردنەوەی ئەوهەوالأنەدانییە٠

تەشهیر :

تەشهیرواتاناوزڕاندن٠هەمووشێوازەکانی لەکەدارکردنی ناووناوبانگی کەسەکان دەگرێتەوە ، لەڕێگای بلاّوکردنەوەی قسەونوسین وکاریکاتێرەوە٠بۆنموونەکەسێك تۆمەتباربکرێت بەوەی بەرتیلی وەرگرتووە ، دەبێ ئەوزانیارییانەبسەلمێنێ زۆرجارلەڕاگەیاندنەکان دەوترێت سەرچاوەیەك کەنەیویست ناوی ئاشکرابکرێت٠تەشهیرئەگەرلەسەرچاوەیەکی ڕاگەیاندن بوو کەناڵەکەبەرپرسە ، چونکەئەگەرکەناڵەکەنەبوایە ناوزڕاندنەکەدروست نەدەبوو٠

دیالۆگ : زاراوەی دیالۆگ لەدووبڕگەپێکهاتووە ، بڕگەی یەکەم واتادووکەس ، بەلاّم بڕگەی دووەم بەواتای گفتوگۆواتاقسەکردنەلەنێوان دووکەس یان زیاترکەهەریەکەیان بۆچوونی خۆیان هەیەسەبارەت بەبابەتی قسەلەسەرکراودەریدەبڕن٠

مۆنۆلۆگ : گفتوگۆیەلەگەڵ خۆت وناخی خۆتداواتاخۆت پرسیاردەکەی وهەرخودی خۆشت وەلاّم دەدەیتەوە٠

ئیستعمار : زاراوەیەكی سیاسییەواتا(ئاوەدانكاری) دەوڵەتەزلهێزەكان دایانهێنا ، كاتێك وڵاتێكیان داگیردەكردبەناوی ئاوەدانكردنەوەدەچوونەناوی و وڵاتەكەیان ناودەنا موستەعمەرە واتا (نشینگەی ئاوەدان)خێروبێرەكەیان بۆخۆیان دەبرد٠

كاتژمێرسفر : ئەم جۆرەزمانەلەلایەن قسەكەری سیاسییەوەبەكاردێ مانای لەناكاوبەسەردادەدەین٠

مەدەنیەت : ئەم زاراوەیەبەكارهێنانی دەگەڕێتەوەبۆسەدەی هەژدەكەئەوكاتەبەمانای نیشتەجێبوون لەشاروهەڵگرتنی كلتوری شاربەكارهێنراوە٠بەشێكی زۆرلەسەرچاوەكان مەدەنیبوون بەهاوواتای ئەخلاق دادەنێن٠بەبڕوای (نۆربێرت ئیلیاس) مەدەنیبوون واتاڕێزگرتن لەكەسانی تر ، هەروەهاهەڵسوكەوتكردن لەگەڵ كەسانی تربەباشترین شێوە ، قوربانیدان لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی٠(ویل دیورانت) دەربارەی مەدەنییەت دەڵێ : (مەدەنییەت ڕویكەلەڕووەكانی نەرمی لەپەیوەندییكردن ، ئەوهەڵسوكەوتەڕێك وپێكەی لەبیروبۆچوونی دانیشتوانی شارداهەیە)٠هەروەها (كلایف بل) ئەوپێوەرانەی خستۆتەڕوو:-

١ – لێبوردەیی : بەهۆیەوەمرۆڤ كەسایەتی گەورەدەبێ لەبەرچاوی خەڵك ، هەروەهاتوانای كۆمەڵایەتیشی بەهێزدەبێ ، ئەوكەسەی توانای كۆمەڵایەتی بەهێزبێ هیچ پێی عەیب نییەئەگەرهاتووهەڵەیەكی بەرامبەربەیەكێك كردئەوابچێت داوای لێبوردنی لێبكات وئاشتیبكاتەوەوگەردنی خۆی پێئازادبكات٠بەڵام ئەگەرهاتوولەژیانی ڕۆژانەمان هەڵەمانكردوداوای لێبوردنمان نەكردئەوەلەوانەیەببێتەهۆی نەمانی پەیوەندی كۆمەڵایەتی نێوانمان ، لەوانەیەببێتەهۆی دروستبوونی كێشەوناخۆشی لەنێوانمان یان ڕوودانی شەڕوبەكارهێنانی توندوتیژی بەرامبەربەیەكتری٠لەژیانی ڕۆژانەمانداهەوومان هەڵەدەكەین بەرامبەربەیەكتری جابەئەنقەست بێ یان بێ مەبەست ، بەڵام كەهەڵەمانكرددەبێ بەخۆماندابچینەوەوداوای لێبوردن بكەین٠

٢ – گرینگیدان بەپاكوخاوێنی

٣ – ڕێزگرتن لەبەرامبەر

٤ – نەرمونیانی لەهەڵسوكەوتدا : كاتێك كەسێك لەبازاڕخۆی پیاتدەكێشێت یان شانت لەشانی دەدات لەوانەیەبێ مەبەست وئەنقەستبێ وبەهۆی قەرەبالغییەوەبێ ، یان لەسەرشەقام ڕاوەستاوی وچاوەڕێی پاس یان تەكسی دەكەی بۆئەوەی بچی بۆشوێنێك ، لەوكاتەداسەیارەیەك ڕەت دەبێت وچلكاوی شەقامەكەت پێدادەكات ، بۆكۆنترۆڵكرنی تورەیی هەندێك كەس شوێنەكەبەجێدێڵێ ، هەندێك كەس ئەگەرلەباری ڕاوەستاندابی دادەنیشێ ، هەندێك كەس ناوی خوای دێنێ وداوای هاوكاری لەخوای گەورەدەكات بۆئەوەی كەوائارامی بكاتەوە ، هەندێك كەسیش دەستنوێژدەشوات ، هەندێك كەس ئاودەخواتەوە ، هەندێك كەسیش هەناسەیەكی قوول هەڵدەمژێ ، ئەگەرجنێوی بەكەسەكەدا ئەوائەویش جنێوی پێدەداتەوە ، ئەگەرشەقێكی لەوكەسەدائەوالایەنی ئابوریش زەرەرمەنددەبێ ئەگەرهاتووكەسەكەشوێنێكی شكایان شوێنێكی بریندارބووتوشی بەندكردن وزیندانی كردن دەبێ كابرالەوانەیەپارەی لێبستێنێ تاكولێی خۆش بێ

ولەزیندان ئازادی بکات یاخودنەکەوێتەزیندان٠کەواتەئەوکەسەی قسەیەکی ناخۆش دەکات یاخودڕەفتارێکی ناشیرین دەکات نابێ خۆمان ببینەئەوئاستەی مەگەریەکێك تەعەددایەکی گەورەمان لێبکات٠

٥ – ئازادی ڕادەربڕین

٦ – گرینگیدان بەلایەنی تەندروستی وپەروەردەکردن

هەیمەنە : بەمانای بالآدەستی ودەستبەسەرداگرتن دێ وەك دەگوترێت هەیمەنەی ئەمریکابەمانای خاوەن گەورەترین هێزی سەربازییەلەجیهاندا٠

کارەدزێوەکان : کارەدزێوەکان ئەوکارانەن دەبنەهۆی ناشیرین کردنی کۆمەڵگاوتێکدان ولاوازبوونی پەیوەندییەکۆمەلآیەتییەکان وباوەڕنەمانی تاکەکانی کۆمەڵگابەیەکتری وەکو : درۆودزی وفێڵ و٠٠٠هتد٠

## لەبارەی ڕەنگ :

ڕەنگەکان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیەلەکارکردنیان لەسەرمیزاج وباری دەروونی مرۆڤ٠ڕەنگ جوانترین دیاردەی سروشتەلەڕێگەی هەستی بینینەوە یارمەتیماندەدات چێژلەجوانییەکانی ژیان وەرگرین ، ڕەنگ هەرئەوەنییەلەنیگارکێشاندادەبنرێت ، بەڵکوڕەنگی مرۆڤ بەپێی بەرزبوونەوەی تەمەن دەگۆڕێت٠هەندێ لەڕەنگەکان لەڕاگەیاندندابەکاردێت ، وەك : هێلی سوور ، پارتەسەوزەکانی ئەوروپا مەبەست پارتەکانی ژینگەیە٠ڕەنگی سپی ئاشتی وپاکی دەگەیەنێت ، ڕەنگی ڕەش دڵتەنگی وتاوان دەگەیەنێت ، ڕەنگی سوورمەترسی دەگەیەنێت٠

١ – ڕەنگی سوور :

ڕەنگی سوورواتای ترسناکی دەگەیەنێ بۆنموونە : ئەوشوێنانەی کە(مین)یان لێیەبەڕەنگی سوورنیشان دەکرێن٠ئەمەش لەوەوەهاتووەکەڕەنگی خوێنی مرۆڤ سوورە٠هەروەهاگلۆپی سووری هاتوچۆبەواتای مەترسی دێت ، بۆیەکەپێبوودەبێ شوفێرئۆتۆمبیلەکەی خۆی ڕابگرێ ، ئەگینالەمەترسیدادەبێت٠هەروەهاڕەنگی سووربەنیشانەی خۆشەویستی دانراوە ئەمەش لەوەوەهاتووەکەخوێن سەرچاوەی ژیانە٠ڕەنگی سووربەواتای پێشوازی وخۆشحالیش هاتووە ، بەڵگەش بۆئەمەڕاخستنی مافوری سوورە بۆپێشوازی لەسەرۆکی وڵآتان٠ئەم ئیدیەمانە :

١ – ڕووسوور :

بەواتای سەربەرزوبەشەڕەف دێ٠ئەم ئیدیەمەدەدرێتەپاڵ ئافرەت٠

٢ – چاوی سووربووە :

ئەم ئیدیەمەبەواتای دەیەوێ یەکێ بکوژێ٠

٣ – دەستی بەخوێن سوورە :

واتا تاوانباروپیاوکوژە٠

٤ – چاوسوورکردنەوە :

بەواتای خۆتوڕەکردن وترساندن دێ٠

٢ – ڕەنگی زەرد :

زەرد ڕنگی خۆروڕەنگی زێڕە٠ یەکەمیان سەرچاوەی ڕوناکی ودووە میان کانزایەکی بەنرخ وجوانە٠هەروەهائەم ڕەنگە واتای ئامادەگی وخۆتەیارکردن دەگەیەنێ ، بەلگەش بۆئەمە ڕەنگی زەردی گلۆپی هاتوچۆیە ، کەدادەگیرسێ شوفێرەکەئاگاداردەکاتەوە بۆخۆئامادەکردن٠لەلای چینییەکان ڕەنگێکی مەلیکانەبووە هەمووکەسێك بۆی نەبووە ئەم ڕەنگەلەبەربکات٠جگەلەم واتایانەڕەنگی زەردواتای نەخۆشی وبێتوانایی دەگەیەنێ ، ئەمەش لەڕەنگی زەردی گەلاڕێزان وەرگیراوە٠

٣ – ڕەنگی کەسك :

ڕەنگی کەسك بەواتای ژیانەوەهاتووە ، ئەمەش لەوەوەهاتووە کەڕەنگی گەلای دارودرەخت سەوزە٠ هەروەهائەم ڕەنگەبەڕەنگی ئارامی بەخشین ودلنیایی هاتووە ، بەلگەش بۆئەمەڕەنگی سەوزی گلۆپی هاتوچۆیە کەنیشانەی دلنیایی وسەلامەتییە لەتێپەڕبووندا ودوورکەوتنەوەیەلەکارەساتی دلتەزێن٠دەوترێ : (دەستی کەسك دەبێ) بەواتای پیرۆزدەبێ ، لەسەرپیرۆزی کارەکە وەك ئەوەی یەکێکی خراپ لەناودەبات٠

٤ – ڕەنگی سپی :

ئەم ڕەنگەبەواتای پاکی دێ ، هەروەهابەواتای ئاشتی هاتووە٠کۆتری سپیش بەهێمای ئاشتی دانراوە ، گۆڕەپانی کۆتری ئاشتیش لەزۆربەی پایتەختی ولاتانی جیهان هەیە٠لەناوەڕاستەکانی سەدەی بیستەم کاتێك نەتەوەیەکگرتووەکان داوایان لە (پیکاسۆ)کرد ، ڕەمزێك بۆئاشتی ڕەسم بکات ، پیکاسۆش کۆتری سپی چاپ کرد ، ئەوەبووکۆتری سپی بووە ڕەمزی ئاشتی لەجیهاندا٠هەولێریش وەك یەکێك لەشارەدێرینەکان لە (١٩٥٩ – ١٩٦٠) لەناوشاری هەولێرناوی گۆڕەپانێکیان نا(کۆتری سەلام) ، لەوگۆڕەپانەش پەیکەری کۆترێکی سپی بالکراوەیان دانا ، کەکاری هونەری (جابرپیرداود)بوو ، لەوسەردەمەی کە (بدرالدین علی) پارێزگاری هەولێربوو٠هەروەهاڕەنگی سپی بووەبەڕەنگی جلی بوك لەزۆربەی جیهاندا ؟ چەندبۆچونێك هەیەسەبارەت بەوەی بۆچی ڕەنگی سپی بۆتەڕەنگی جلی بووك ، یەکێك لەوبۆچوونانەدەلێ : تاپێش سەدەی نۆزدەم جلی بووك ڕەنگی سپی نەبوو ، هەرڕەنگێك بوایەبۆئەورۆژەدەپۆشرا ، تاسالی (١٨٤٠)م ئەورۆژەی ڤیکتۆریای شاژنی بەریتانیالەزەماوەندێکداکراسێی سپی بریقەداری لەبەرکرد ، لەورۆژەوەئیترکراسی سپی بوبەجلی بووك٠بۆچونێکی تردەلێ : لەسەردەمی زوودالەکاتی جەنگەکاندائەوخێلانەی ویستویانەخۆیان بەدەستەوەبدەن ئالای سپییان بەرزکردۆتەوە ، دواترئەم واتایەگوازراوەتەوەبۆهاوسەرگیری کاتێك خوازبینیکارچۆتەپێشەوەبۆداوای کچەکە لەمالی کەس وکاری ئەگەررازی بوونایەکچەکەجلێکی سپی لەبەردەکردبەمانای قایل بوونی خۆی وخانەوادەکەی٠بەلام هەندێك

گەل وولاّت ڕەنگی تریان دیاریکردووە بۆجلی بووك بۆنموونەچین ڕەنگی سوری داناوە بۆجلی بوك ، جل وبەرگی بوك دەبێ سووربێ ، ئەوشریتەی کەل وپەلەکانی بوکی پێ دەپێچرێتەوەدەبێ سووربێ٠ئەم ئیدیەمانە :

١ – دەست وپیێ سپییە :

واتاکەسێك ئیشوکارنەکات وهەوڵی خۆبەخێوکردن نەدات٠

٢ – ڕووسپی :

بۆئافرەت بەکاردێ ، بەواتای سەربەرز٠

٣ – بەختی سپییە :

بەواتای بەختی باش دێ ، واتاژیان بەگوێرەی دڵی ئەودەڕوات وئامانجەکان دێنەدی٠وشەی بەخت وەك بڵێی بۆهاتنێکەبەبێ ئەوەی پێوەماندووبوبی یان ڕووداوێکەبەسەرمرۆڤ دادێ بەبێ ئەوەی تواناودەسەلاّتی مرۆڤی تیابێ٠لەناوکلتوردازیاترچەمکی بەخت بەکاردەهێنرێت

٤ – پرچی سپی هۆنینەوە :

بەواتای پیربوون دێ بەبێ شووکردن٠

٥ – ڕیش سپی :

دەوترێ فلاّن کەس ڕیش سپی ئێمەیە٠واتا ئەوکەسەیان بەگەورەی خۆیان داناوەوهەموویان بەقسەی ئەودەکەن٠

٦ – سەری لەبەرهەتاوێ سپی نەکردووە :

ئەمەلەبواری بەتوانایی بەکاردێ ، واتاتەمەنێکی دووردرێژی پڕلەتاقیکردنەوەی بەسەربردووە٠

٧– سپی هەڵگەڕا : بەواتای تێکچوو٠لەبەرتەریقی یان نەخۆشی ، چو نکەمرۆڤ بەهۆی ئەوخوێنەی کەلەلەشی دایە جۆرە ڕەنگێك بەدەموچاوی دەبەخشی٠(تێبینی : ئەم بابەتە بەکورتکردنەوەوکەمێك دەسکارییەوەلەکتێبی (ڕەنگ لەزمانی کوردیدا) کەهی مستەفازەنگەنەیەوەرگیراوە٠)

٥ – ڕەنگی ڕەش :

ئەم ڕەنگە هەمیشە واتایەکی نەرێنی هەیە٠ بۆنموونە لەم ئیدیەمانە :

١ – ڕووڕەش :

بۆمەحکومکردنی ئەوکەسانەی خراپە دەکەن پێیان دەوترێ ڕووڕەش٠بۆنموونە : کورد دەڵێ : (ڕووڕەشی دنیاوقیامەت) بۆئەوکەسانەیەگوناه وخراپە دەکەن٠

٢ – هەناوی ڕەشە :

بەواتای کەسێکی دڵ پڕلەکینەوخراپە دێ٠هەناوم ڕەشبووە بەواتای خەفەتبار٠

**٣ – بەختی ڕەشە :**

**واتابەدبەختە٠بەواتای سەرکەوتن وشادومانی بەشی ئەوکەسەنییە وڕووبەڕووی زیانێکی گەورەبۆتەوە٠بەخت هەمووئەوڕووداووودەستکەو تانە یتەوەکەمرۆڤ دووچاریان دەبێت ، بەختیش دەکرێتەدووبەش : (بەختی ڕەش) و(بەختی سپی) ، واتابەدبەخت وبەبەخت٠دیارەبەختەوەریش وشەیەکی داڕێژراوە لەوشەی بەخت وپاشگرێك پێکهاتووە٠هەندێك دەڵێن بەخت قەدەرەخەڵك ناویان ناوەبەخت٠جائایامرۆڤ ژیان بەڕێوەدەبات یان ژیان مرۆڤ بەڕێوەدەبات ؟ بەواتایەکی ترمرۆڤ ژیان دەگوزەرێنێ یان ژیان مرۆڤ دەگوزەرێنێ ؟ بێ دەسەڵاتی مرۆڤ لەبەدەستهێنانی دەستکەوتەکان وئاڕاستەی ڕووداوەکان ، هەندێك جارئەوەی بەسەرمرۆڤدادێت لەخۆشی وناخۆشی لەدەرەوەی دەسەڵات وئیرادەوویستی مرۆڤەکان ڕوودەدات ، بێگومان ئێمەوەکومرۆڤ ڕۆژانەتوشی چەندین ڕووداووبەسەرهات دەبینەوەکەهەندێکی لەدەرەوەی ئیرادەوویستی ئێمەداڕوودەدات٠**

**٤ – ڕۆژی ڕەش :**

**بەواتای ڕۆژی ناخۆش کەپڕەلەکارەسات٠ دەوترێ : (دراوی سپی بۆڕۆژی ڕەش)٠**

**٥ – ڕەشبینی :**

**وەکودیارەگەشبینی وڕەشبینی دووچەمکی دژبەیەکن٠ئەفلاتوون وتوویەتی : (گەشبینی فوولەچرای بەختەوەری دەکات)٠**

**٦ – ڕەشبگیری :**

**ئەم ئیدیەمەلەبواری زەبروزەنگ وغەدرکردن بەکاردەهێنرێ ، واتاتاوانباروبێتاوان بەبێ جیاوازی بەردەکەون٠**

## بەشی دەیەم

**باسی بەتەمەنداچوون :**

**پیریەتی قۆناغی پایزی تەمەنی مرۆڤە٠ژیان ڕۆیشتنێکەبەرەوپیری لەم قۆناغەدازەین وهۆش وخانەکانی مێشك وهێزی جەستەکزدەبن٠ سەرەڕای ڕوخساری دەرەوەی مرۆڤ کەبەئاسانی هەست بەگۆڕانکار ییەکان دەکرێت لەکاتی بەسالآچوون دا ، وەك : سەرسپی بوون و پێست چرچ بوون ، گەلێك گۆڕانکاری دیکەش لەگەڵ بەتەمەندا چوون دا ڕوودەدات ، وەك : لەبیرچوونەوەوتێکچوونی یادەوەرییەکان ، هەروەهامرۆڤ هەتابەساڵدابچێت چالأکییەکانی کۆئەندامی بەرگری کەم دەبێتەوە ، بەپێی توێژینەوەکان هەندێك زانابۆیان دەرکەوتوو ە کەسێ ڤیتامین ڕۆڵێکی گەورەدەبینن لەدواخستنی پیربوون ، ئەوا نیش : ڤیتامین (ئەی) و(ئی) و (سی) ، زاناکان لەوبڕوایەدان کەئەو سێ ڤیتامینە بەرگری لەش زیاددەکەن٠ بێگومان هەموومرۆڤێك حە زدەکات دیمەن وڕوخساری لاوێتی پێوەدیاربێ ودیاردەی پیریەتی سە رهەڵنەدا ، لۆچی ڕوخساری دیارنەبێ وسەروڕیشی سپی نەبێ وسەر ی نەڕوتێتەوە٠ مرۆڤ کاتێك پیردەبێ کۆکەوناڵەناڵەوپشت ئێشان وئە ژنۆئێشان وهەمووئەمانەی لێ پەیدا دەبێ ، وەکووتراوە :(پیری وهەزارعەیب) ، بەلأم هەرگیزپیرلاونابێتەوە ، بەلأم ئاساییەدرەنگ پیربێت ، هەندێك کەس تەمەنێکی گەورە بەلأم سەروقژێکی جوان ، دەم وچا وێکی گەش ، بالأیەکی جوان ، (١٠) تا (١٥)ساڵ لەتەمەنی خۆی لاوتر دیارە ، جائایاچەرمەسەری ژیانیان نەدیوە ؟ خۆراکە؟ وەرزشە؟ هونەرمەند (عەلی مەردان) ، دەڵێت :**

**کەی دێتەوە؟ کەی دێتەوە؟**

**کاتی لاویم کەی دێتەوە؟**

**لەدەستم چوو ، بەخواهەرگیزنایەتەوە**

**وەیەکێ ئەگەربیەوێ پیرنەبێت دەبێت زووتربمرێت ، ڕاستەپیرنا بێتەوەگەنج ، بەلأم پیری دوادەکەوێ ئەگەرژیان بەدروستی وگونجاو ی پەیڕەوبکرێت ، ئەگەربزانی چی بخۆی ؟ چۆن بخۆی ؟ چ وەرز شێك ئەنجام بدەی ؟ زۆرپیرهەیە بەیانی زوولەخەوهەڵدەستێ ، دەم وچاوی دەشوات ، تراش دەکات وددانەکانی دەشوات ، بەپێی وەرزوتە مەن جل وبەرگی گونجاولەبەردەکات وپێلأوەکانی بۆیاغ دەکات ، بەو دیمەنەدەچێتەناوخەڵکی دەروونی شاددەبێت ودەبێتەجێی سەرنجی خۆی وخەڵکی٠ خۆراکی گونجاوبەتایبەتی بۆپیران بایەخدانە بەتەند روستی ، فەیلەسوفی یۆنانی (ئەبیقرات) ، وتوویەتی : (خۆراك دەرد ەودەرمانیشە)بێگومان هاوڕێیەتی پیربۆپیرکارێکی دروست وبەسوودە کەچاویان بەیەك دەکەوێ بیرەوەرییەخۆش وناخۆشەکانی ڕابردوویا ن دەکەوێتەوەیادوخۆزگەبەوکاتانەدەخوازن٠**

**دیاردەکانی پیری :**

**یەکەم - دیاردەی پێست : پەیدابوونی چرچ ولۆچ لەدەم وچاودا.**

**دووەم — دیاردەی قژ : قژڕەنگە سروشتییەکەی خۆی نامینێ ، خۆڵەمێش دەبێ ، پاشانیش سپی دەبێ.(ئەبوداودئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە : مووی سپی هەڵمەکەنن ، هەرموسوڵمانێك لەئیسلامدا موێکی سەری سپی بکات ، ئەوەلەڕۆژی قیامەت دا بۆی دەبێت بەڕووناکی).**

**سێیەم — دیاردەی بالاٌ : بالاٌبەقیتی نامینێتەوە ، بڕبڕەی پشت بەرەوچەمینەوەدەچێت.**

**چوارەم — دیاردەی بینین وبیستن : چاوەکان کەم بینادەبن وگوێیەکانیش گران دەبن.**

**پێنجەم — دیاردەی سییەکان : توانای سییەکان لاوازدەبێ وتوانای هەناسەدانیش کەم دەبێتەوە.**

**شەشەم — دیاردەی کۆئەندامی هەرس : کرداری هەرس ئاڵۆزدەبێ وجولەی ڕیخۆڵەکان سست دەبێ.**

**حەوتەم — دیاردەدەرونییەکان**

**ڕێگاکانی دورخستنەوەی پیری :**

**یەکەم — کەمکردنەوەی خواردنی چەور :**

**لەئەنجامی ئەوتاقیکردنەوانەی لەتاقیگەکان کراوە دەرکەوتووە ، کەخواردنی زۆری چەوری کاریگەری زۆرخێرای بەرەوپیربوون هەیە. بەشی هەرەزۆری چەوری لەخواردنی ڕۆن وبەروبوومە چەورەکانی وەك : کەرە(زبدە)وقەیماغ و...هتد بەلاٌم خۆراکە ڕوەکییەکان بڕی چەورییان کەم وزیانێکی زۆربەخانەکان ناگەیەنێت ، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ ناتوانێت بەتەواوی دەست بەرداری چەوری بێت ، چونکەبڕێکی زۆرئەووزەیەی کەڕۆژانەپێویستە بۆجولەی لە ش وبیرکردنەوە ، بەهۆی ئەوکالۆرییەوەپەیدادەبێت کەلەچەورییەوە دەست دەکەوێت. مرۆڤ لەئەنجامی گۆڕینی جۆری خۆراك ، یان شێوە ی خۆراکی دەتوانێت بڕێکی زۆری (کۆلیسترۆڵ)ی جەستەی دابەزێنێ ، چونکە تاقیکردنەوەکان ئەوەیان نیشانداوە زۆرخواردنی چەوری وبەرزکردنەوەی کۆلیسترۆڵ هەنگاوێکی خێرایە بەرەوپیری وپەککەو تن.**

**نۆرەی دڵ : ئەم نەخۆشییە توشی مرۆڤ دەبێت بەهۆی داخستنی خوێنبەرانی دڵەوە ، کەبەهۆی زۆربوونی چەوری (کۆلیسترۆڵ) لە خوێنبەرەکانی دڵ دا ، بۆچارەسەرکردنی نۆرەی دڵ ، نەخۆشەکە ڕەوانەی قاوشی تایبەتی دەکرێ کەبەبەشی بوژانەوەی دڵ (انعاش) ناسراوە. بەهۆی لێکۆڵینەوەیەکی نوژدارییەوەسەلمێندراوە کە (باینجان) کاردەکاتە سەرگەشەی بەکتریاوکەمکردنەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ لەناوخوێن دا.**

**دووەم — وەرزشکردن :**

**گومانی تێدانییە کەوەرزشکردن هۆکارێکی زۆربەسوودە لەهێشتنە وەی فسیۆلۆژی لەش بەباشی ودورخستنەوەی پیربوون ، تاقیکردنە وەکان دەریان خستووە کەتوانای جەستەیی کەسێکی وەرزشەوان لە تەمەنی حەفتاساڵیدا وەك کەسێکی چل ویەك ساڵی وایە کەوەرزش نەکات. ڕۆیشتن بەپێ ڕۆژانەبۆماوەی**

سەعاتێك یان دووسەعات ویاری تێنس ومەلەوپایسکل سواری ... هتد ، خانەکان لەکارەفسیۆلۆ ژییەکان بەباشی دەهێڵێتەوە ، بەهۆی وەرزشەوە گورچیلەکان هەموو ئەومادده ژەهرە کەلەکەبووانەی لەخانەکان دا کۆبوونەتەوە فرێیان دەدەنەدەرەوە ،سەرەڕای ئەوەی پارێزگاری لەجەستەیەکی ڕێك وپێك دەکات ولەکێشی زۆروقەلەوی دووردەکەوێتەوە.جولانەوەیەکێکەلەپێویستییەکانی لەش ، جگەلەوەی لەش بەهێزدەکات زۆرژەهرهەیەلەلەشدادروستدەبێ بەهۆی جولانەوەدەردەچێت ، کەم جولانەوەدەبێ بەهۆی کۆبوونەوەی هەندێ ژەهرلەلەشداکەلەئەنجامی خواردندادروستدەبێ وکاری خراپ دەکەنەسەرئەندامەکانی لەش ، ئەوانەی کەم دەجولێنەوەبەزۆری قەلەودەبن وتوشی ڕۆماتیزمی جومگەکان دەبن ، توشی نەخۆشی شەکروتەمەڵی جگەردەبن ، لەبەرئەوەجولانەوەبەپێی تەمەن وتوانای لەش پێویستەبۆهەمووکەسێك.وچاندنیش وەکوجولانەوەپێویستییەکی لەشەلەکاتی ئیشکردنداکەلەش ماندوودەبێ پێویستی بەوچان هەیە ، ئەووچانەش بەپێی تەمەن وتەندروستی ئەوکەسەیە.هەروەهاهەمووهەفتەیەك پێویستەرۆژێك وچان بدرێت یاخودلەمانگێك ئیشکردنداچەندرۆژێك وچان بدرێت.

وەرزش وقەڵەوی :

قەڵەوی زیانێکی زۆری هەیە بۆسەرتەندروستی مرۆڤ ، دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی جموجۆلی مرۆڤ وتوشبوون بەنەخۆشی لە ئاکامەکانی قەڵەوی : بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن ونەخۆشییەکانی دڵ و نەخۆشی شەکرە ، هەروەها پرخەلەمرۆڤی قەلەودازیاترە کە زیاتر لەکاتی نوستن لەسەرپشت بەدی دەکرێ ، بریتییە لەودەنگەی کەلە ئەنجامی تەگەرەکەوتنەسەررێی هەناسە وەرگرتن پەیدا دەبێت.

دووبرابەناوەکانی (بن وبیل مك کوبیز) خەڵکی شاری (هندرسون ویل) بوون لەکارۆلینیای ئەمریکا ، قورسایی هەریەکەیان (٣١٥) کیلۆ بوو هەرکەس ئەیانی بینی پێیان پێدەکەنی لەبەرقەلەوی نەیان دە توانی بەپێ برۆن ، ئەم دووبرایە ئیش وکاریان نەدەکرد خەڵکی بە پارە سەیریان دەکردن ، ئەوانیش نمایش وئاهەنگییان بۆبینینی خۆیان سازدەکردوخەڵکی بەبلیت سەیریان دەکردن ، هۆیەکانی هاتوچۆ سواریان نەدەکردن لەبەرئەوە ناچاربوون هەریەکەیان ماتۆڕسکیلێکی تایبەتبکڕێ وپێبگەڕێ ، ئەگەرلەسەرهەرقەرەوێلەیەك بنوستبان دە یانشکاند لەبەرئەوەلەزەوی دەخەوتن. ئەگەروادابنێین درێژی باڵا (١٧٠)سم بێت ، دەبێت کێش (٧٠ )کیلۆگرام بێت تاوەکولەگەڵ باڵادا بگونجێت ، واتا دەبێ ژمارە (١٠٠) لەدرێژییەکەدەربکرێت. هەروەها (ڕوبرت ابرل هیوز) لەساڵی (١٩٢٦) لەئەمریکالەدایکبووە کەکاتێك لەدایکبووکێشی (٥) کیلۆگرام بوو ، کەتەمەنی بووە (٣٠) ساڵ کێشی بووە (٤٧٥) کیلۆگرام ، پانی سینگی (٣)مەترزیاتربوو ، کاتێك لەساڵی (١٩٥٨)مرد بەهۆی سرینگەوەخراوەتەناوگۆڕەوە.پیاوی قەلەوئامادەیەبۆتووشبوون بەنەخۆشی : شەکر ، ڕۆماتیزمی جومگەکان ، نەخۆشی دڵ ، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن ، ئەم نەخۆشییانەزۆرنزیکەلەپیاوی قەلەوەوە ، وەقەلەوی ئینسان تەمەڵ وبێتوانادەکات

لەئیشوکاردادوای دەخات وشێوەشی تێکدەدا٠زۆری قەلەوی لەخواردنی چەوری وکەم بزوتن دەبێ ، وەرزشکردن بۆخۆپاراستن لەقەلەوی کەلکیزۆرە٠قەلەوی هۆی زۆرە ، هەیەلەزۆرخواردنەوەیە ، هەشەهۆیەکەیدەگەڕێتەوەبۆئامادەبوونێکی (استعداد)ی بۆماوەیی (وراسی)٠ چ کاتێك مرۆڤ بەقەلەودادەنرێت ؟ چەندئەندازەیەکی جێگیری بۆدانراوە ، کەئەگەریەکێك لەوڕادەیەدەرچووپێی بلێین قەلەو ، وەکوپێوانی دەوری سکی لەهی سینگی زیاتربێت ، یاخوودبەراوردکردنی قورسایی وبالأ٠

سێیەم — ئاوخواردنەوە :

ئاومایەی ژیانی هەمووزیندەوەرێك و شینایی ودارودرەختە ، وتراوە: (ئاووئاوەدانی) ، ئاویان کردۆتەبناغە بۆدانە (حەب) ودانەپێدەگات ، ئاومایەی ژیان وجوانی وزینەتی دارودرەخت وباخ وباخچەیە٠ ئەگەر لەیەکێك بپرسین ئاوچییە ؟ دەڵێ : ئاو ئاوە٠ بەلأم ئەگەرلەزانایەکی بواری کیمیا بپرسین ، دەڵێ : ئاولەهەردووگازی (هایرۆجین) و (ئۆکسجین) پێکهاتووە بەڕێژەی٢ : ١ ئاونزیکەی سەداحەفتای لەشی مرۆڤ پێکد ێنێت وچۆتەناوهەمووخانەکانی لەشەوە ، لەپێهاتەی هەمووئەنزیم وهۆڕمۆنەکاندا بەشی سەرەکییە ، سایتۆپلازمای خانەلەکاتی شلی تەواودا دەتوانێت کارە فسیۆلۆژییەکانی خۆی بکات ئەو کەسانەی ڕۆژانەئاوکەم دەخۆنەوە کاری خانەکانیان بەوشێوەیەنییە کەبتوانێت فەرمانەسەرەکییەکان جێبەجێ بکات بەباشی ، بەپێچەوا نەوەئەوکەسانەی ڕۆژانەئاوزۆردەخۆنەوەزۆرهەست بەچالاکی ولەش سووکی وتوانای بیرکردنەوەبەباشی دەکەن ، چونکە ئەنزیم وهۆرمۆ نەکان وسایتۆپلازمی خانەکانیان بەباشی کاردەکەن٠ئاوخواردنەوە بەیانییان زوو، پەرداخێك یان دووپەرداخ پێش نان خواردن بەچارە کە سەعاتێك یان نیوسەعات کارێکی زۆردەکاتە سەرلابردنی ژەهری ناوخانەکان ودەرکردنیان بۆدەرەوەوپاگژکردنەوەی جەستە بەشێوە یەکی باش٠

چوارەم — نوستن :

مرۆڤ ڕۆژانەبەهۆی کارەکانییەوە هەست بەماندووبوون دەکات ، نوستن لای مرۆڤ وگیاندارانیش لەئەنجامی ماندووبوونەوەدێت ، لەماوەی نووستندا مرۆڤ چالاکی وهێزی بۆدەگەڕێتەوە٠بۆیە نوستن بەسەرەکیترین هەنگاودادەنرێت بۆنوێ بوونەوەی توانای لەش٠ مرۆڤ یەك لەسەرسێی ژیانی لەنوستن سەرف دەکات ، ئێستادەرکەو تووە کەبەشێکی هەرەزۆری هۆرمۆنەکانی جەستە تەنها لەکا تی نوستن دادروست دەبێت مرۆڤی ئاسایی لەشەوورۆژێکدا پێویستی بەنزیکەی هەشت کاتژمێر خەوتن هەیە٠ ئەوڕوپییەکان زۆرجارحە زبەسەعاتێك نوستنی ڕۆژدەکەن ، زۆرجاربەنوستنی (جوانی) ناوی دەبەن ، چونکەلەوبڕوایەدان ئەم نوستنە کاریگەرییەکی زۆری لە سەرنوێ بوونەوەی لاوێتی داهەیە وڕووی دەم وچاوگەش دەکات ودرەوشانەوەدەبەخشێتەخانەکانی لەش٠ ئەوانەی کاردەکەن ماندو ێتی جەستەیان ڕێ خۆش دەکات بۆخەولێکەوتن وتەندروستییەکی باش ، لەلێکۆڵینەوەیەکدا دەرکەوتووە کەلەسەدا بیست ویەکی ڕود اوەکانی ئۆتۆمبیل دەگەڕێتەوەبۆکەمی نوستن٠شێوەکانی نوستنیش زۆرن ، باشترینیان نوستنەلەسەرلای

ڕاست ، چونكەنوستن لەسەرلای چەپ زیان بەگەدەودڵ دەگەیەنێ ، خراپترین نوستنیش لەسەرپشتنوستنە٠ ئەگەربەیانییان زوولەخەوهەڵسی وسەفەرت هەبێ ، ئەوابەفێنکایی سەفەرەکەدەکەی و زیاترچێژلەسەفەروگەشتەکە وەردەگری هەروەهابەیانییان جادەچۆلەوقەرەبالەغ نییە٠گۆرانی شاعیردەڵێ :

جادەچۆل وسێبەربووکاتی بەیانی ئەرۆیشتم خەیالاّوی ئەمڕوانی

بۆسەوزایی دەوروپشتم بۆئاسمان بۆشاخی بەرزخانوی تازەدنیای جوان

نوستن لەشەوداسودی زیاترەوەك لەڕۆژدا ، لەتوێژینەوەیەکی زانستیداکەتوێژەرانی زانکۆی ئەریزۆنائەنجامیانداوە دووپاتی دەکەنەوە کەنوستن لەتاریکی داسودێکی زۆربەتەندروستی دەگەیەنێ وتوانای بەرگری لەنەخۆشی دابەهێزدەکات٠هەرلەوتوێژینەوەیەداهاتووەکەجەستەلەتاریکی داهۆرمۆنی (میلاتۆنین)زیاتردەردەدات کەڕۆڵێکی کاریگەردەبینێ لەڕووبەڕووبوونەوە لەتووشبوون بەنەخۆشییەدرمەکانی وەك شێرپەنجەی میزڵدان وپڕۆستات٠

پێنجەم – دورکەوتنەوەلەماددەکهولییەکان :

یەکێك لەوکێشەسەرەکییانەی ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە ، کێشەی خوگرییەبەماددەکهولییەکان ، ئەم ماددانە وەك هەمووتاقیکردنەوە تەندروستییەکان پیشانیان داوە کاریگەرییەکی زۆریان هەیەلەسەر جەستە بەهۆکاریکی گەورەی زووپیربوون ومردنی مرۆڤ دادەنرێت ، لەزیانەکانی :

ورگ زل دەکات ، پێلوی چاوئەستووردەکات ، نوێژوخواپەرستی پێناکرێ،ئەگەرنهێنییەکی لابێ دەیدرکێنێ

شەشەم – خەم وخەفەت ودڵەڕاوکێ :

خەم وخەفەت وبیرکردنەوەی زۆرلەکێشەوگیروگرفتەکان ، کاریگەری زۆری لەسەرپیربوون داهەیە ، زۆربەی نەخۆشییەکانی وەك : بەرزی پەستانی خوێن وجەڵتەی دڵ وجەڵتەی دەماغ و٠٠٠هتد ، زۆربەیان دەگەڕێتەوەبۆخەفەت وبیرکردنەوەی زۆرئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) وتوویەتی:(الهم نصف الهرم) واتا : (خەم نیوەی پیرییە)٠وشەی خەمۆکی واتای خەفەت خواردنێکی هەمیشەیی دەگەیەنێ بەلاّم خەمباری واتای خەفەتێکی کاتی دەگەیەنێ٠(یومایجعل الولدان شیبا)الزمل : ١٧ واتا : (لەڕۆژێکداکەمنداڵ پیردەکات وسەری سپی دەکات)٠ئافرەتێکی بەلجیکی سزای ئیعدامی بۆدەرچووبەیەك شەوی هەمووسەری سپی بوو٠(وتولی عنهم وقال یأسفی علی یوسف وابیضت عیناه من الحزن فهوکظیم) یوسف : ٨٤ نابینابوونی چاوی حەزرەتی یەعقوب (سەلامی خوای لێبی) کاتێ یوسفیان لێ دوورخستەوەوچاوەکانی ئاوی سپی وبینینی نەمائەوەندەی خەم وپەژارەی خۆی بخواتەوە٠

حەوتەم – پێكەنین :

هەندێ كات پێكەنین بۆڕاكێشانی سەرنجی دەوروبەرە ، ئەگەرپێكە نینی نەبێت بەكەسێكی گۆشەگیردادەنرێت ، بەلاّم هەندێ جارپێكە نین بۆگاڵتەپێكردنەویەكێكەلەتاوانەكان ، ئایەتی (٢٩)ی سورەتی (المطففین) : (ان الذین أجرمواكانوامن الذین امنویضحكون)واتا : (تاوانباران بەئیمانداران پێدەكەنن)٠ لەئەنجامی ئەوتوێژینەوانەی لەسەرتەندروستی مرۆڤ كراوە ، دەر كەوتووە كەپێكەنین كاریگەرییەكی زۆری لە سەرباشكردنی باری فسیۆلۆژی مرۆڤ هەیە ، پێكەنین دەروون خۆش دەكات وماسولكەكان ئارام دەكاتەوە وئۆكسجین زۆربۆدەماغ دەنێرێ٠بەتایبەتی ئەگەرهاتووئافرەت لەماڵدادەم بەخەندەوپێكەنین بووئەوماڵەبەرەوخۆشی دەڕوات٠هەروەهائەگەمرۆڤ لەدڵیەوەپێبكەنێت دەبێتەهۆی بەهێزكردنی تواناكانی بەرگری لەش٠هەروەهائەوكەسانەی هەمیشەزەردەخەنەلەسەرلێویانەزیاتركاریگەرییان هەیەلەسەرخەڵك دەتوانن زووترقەناعەت بەخەڵك بێنن٠

هەشتەم – كاركردن :

تاقیكردنەوەكان دەریانخستووە كەكاركردن كاریگەرییەكی گەورەی لەسەرژیانی مرۆڤ هەیە ، ئەوهەستانەی بەیانییان وبوپەرۆشبوون بۆچوونەسەركار وتێكەڵ بوون بەكەسانی دیكە ، بۆیەزۆرلەئامارەكان ئەوەپیشان دەدەن كەگەلێك كەس هەن لەپاش ئەوەی لەتەمەنی(٦٥) ساڵی خانەنشین دەكرێن ، زۆربەیان تووشی خەمۆكی دەبن بۆیەلە زۆربەی ولاّتەپێشكەوتووەكان كارێكی زۆربۆئەم مەسەلەیەكراوە ، ئەوبەتەمەنانەدەخەنە هەندێك كاری واوە كەلەگەڵ تەمەنییان بگونجێت ڕۆژانە بۆچەندكاتژمێرێك لەفەرمانگەی خێرخوازی وشوێنی ڕوناكبیری و٠٠٠هتدكاتیان پێبەسەردەبەن وناهێڵن تووشی كێشەی تەنیایی وبیرلەخۆكردنەوەببن٠ لەهەندێك وڵات (٦٥)ساڵیان داناوەبۆتەمەنی خانەنشینی ورەنگەبەزۆردەست لەكارهەڵگرتنیان پێبكەن وخانەنشینیان بكەن بەبیانووی ئەوەی وزەوتوانایان نەماوەوهەندێك لاویش جێگایان بگرنەوە ، لەهەندێك ولاّت ئەمانە زۆرجاروەك ڕاوێژكارولەجێگەیەكی زۆربایەخداردەمێننەوە ، كەسانی پیرلەڕووی ئەزموونیان دەكرێ سوودیان لێ وەربگیرێ ، باشترین نموونە :(ئەنجومەنی پیرانی ئەمریكا)٠ناخۆشترین هەواڵ سەبارەت بەپیران ، هەواڵی خانەنشینییە ئەمانەهەندێكیان هێشتا گڕوتین وتەوژمی كاركردنیان پێوەدیارە ، دەكرێ بەشێوەی (شارەزا) ، یان (ڕاوێژكار) بمێننەوە تاسوودلەبەهرەوتوانایان وەربگیرێ٠ (تۆلستۆی) وتوویەتی :(بەختیاری مرۆڤ ژیانە ، ژیانیش ئیشكردنە) ، هەروەها(ولیەم بلاك)وتوویەتی:(بەختیاری لەجولانەوەوبەردەوام بوونە لەئیش وكار)٠

نۆیەم – گەرماو :

خۆشوشتن بەهۆکارێك دادەنرێت لەهۆکارەکانی پارێزگاری کردن لەتەندروستی ونوێکردنەوەی لاوێتی ، مەبەست لەخۆشوشتن تەنها پاکوخاوێنی نییە ، بەڵکوپارێزگاریشەلەتەندروستی ومانەوەبەدیمە نێکی جوان٠ (ئیبن خەلدون)لە(مقدمە) ، دەڵێ :(لەش سووکی وگو رج وگۆڵی وشادی هەمووکەسێك لەخۆشوشتن دابینیویەتی ، دیارەکەگەرماو(حەمام) هەواوهەڵم وڕتوبەت بلاٌودەکاتەوە ، والەمرۆڤ دەکات کەشادودڵخۆش بێت ، ئەوانەی کەدەچنەگەرماو(حەمام) کاتێك لەهەواکەی داهەناسەبدەن گەرمای هەوابچێتەناولەشیانەوە ، شادی وخۆشی ڕوویان تێدەکات ، هەندێکیشیان وایان لێدێت لەخۆ شی وشادی دادەست دەکەن بەگۆرانی وتن ، لەبەرئەوەی کەڕەشپێستە کان گەرما کاریگەرە لەسەرمیزاجیان عەشقی هەڵپەڕکێن ، هەروەها خەڵکی ئەوولاٌتانەی لەئاووهەوای دەریادا ژیان بەسەردەبەن کەمێك هەڵسوکەوتیان وەك ڕەشپێستەکانە ، چونکە هەوای ئەم ناوچانە بەهۆی تیشکدانەوەی ڕووناکی سەرڕووی دەریاوە گەرمایەکی زۆری هەیە ، ئەم چۆنییەکییەش لەناوخەڵکی میصردا دەبینرێت٠

دەیەم – خواردنی گۆشت :

ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) وتوویەتی :(والەسکتان مەکەن بۆئاژەڵ ببێتەگۆڕستان)،ڕاستەگۆشت سەرچاوەیەکی گرینگی پڕۆ تیناتە کەدەورێکی گرینگ دەبینێتلەپێگەیاندنی لەش دا ، بەلاٌم تاکەسەرچاوەنییە ، (هێلکەوپەنیرونیسك)یش سەرچاوەن وهەمان ئەرك دەبینن٠ ڕووەکییەکان کەبەدرێژایی تەمەنییان (گۆشت)نا خۆن تەمەنییان لەوانەی هەردەم گۆشت دەخۆن درێژترە ، ئەمە جگەلەوەی ئەگەرزیادلەپێویست گۆشتمان خوارد زیان بەگورچیلە وئەندامەکانی تری لەش دەگەیەنێت وپیربوونیش دەباتەپێشەوە٠ زانایانی تەندروستی لەوبروایەدان ئەگەرمرۆڤ لەجیاتی گۆشت و خواردەمەنی ترشیری مانگای بخواردبایە لەوانەیە تەمەنیان لەدووسەدساڵ تێپەڕی بکردبایە٠

## پەراوێز :

(١): ئیبن قیيم ئەلجوزی : ناوی محمدکوڕی ئەبی بەکرە ، لەساڵی (٦٩١)ك لەدیمەشق لەدایکبووە ، جەوزیە ، قوتابخانەیەك بووباوکی بەڕێوە بەری بوو، لەساڵی (٧٥١)ك وەفاتی کرد، لەسەرمەزهەبی حەنبەلی بووە٠

(٢): ئیمامی غەزالی : ناوی ئەبوحامید محەمەد کوڕی محەمەدە ، ساڵی (٤٥٠)ك لەشاری(طوس) نزیك مەشهەدی ئێستا لەدایکبووە٠

(٣): ئیبن جەوزی : ناوی جمال الدینی کوڕی عبدالرحمن کوڕی علی کوڕی محمد کوڕی علی قوڕەیشی تەمیمی بەکری بەغدادیە ، ناسناوی ئیبن جەوزی دەدرێتە پاڵ دارگوێزێك لەماڵی یەکێك لەباپیرانی بەناوی جەعفەرلەشاری واسیت (شاری کوتی ئێستا) لەساڵی (٥١٤)ك لەبەغدا لەدایکبووە ، لەسەرمەزهەبی حەنبەلی بووە٠

(٤): ناسڕی سوبحانی : لەساڵی (١٩٥١) لەگوندی (دوریسان)ی نزیك پاوەی هەورامانی سەربەپارێزگای کرماشان لەدایکبووە٠

**سەرچاوەکان :**

**نوسینەکانی ئەم بەرگەلەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە ، ئەوسەرچاوانەی بەکارم هێناوە بەژمارەپیشانم داوە ، هیوادارم بەم کتێبەیارمەتی خوێنەران بدەم.**

**یەکەم – کتێب :**


**١ – قورئانی پیرۆز.**

**٢ – ابن قیم الجوزیە** ، جلاء الافهام في الصلاة والسلام على خير الانام ، **و : عبدالكريم فتاح ، چ ٢ ، ٢٠١٦**

**٣ – ابن قيم الجوزيه ، الوابل الصيب ، و : عبدالكريم فتاح ، چ ٢ ، چاپخانەی نوری حەقیقەت ، ٢٠١٥**

**٤ – ئەبولفەرەج عیبری ، حیکمەت وحیکایەت ، و : سەیدیونس ڕاوی ، چ ١ ، هەولێر، ٢٠١١**

**٥ – ابن** تيمية ، الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان ، **و : نوری هەمەوەند، بەرگی یەکەم ، چ ١ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٦**

**٦** – ابن تيمية ، الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان ، **بەرگی دووەم.**

**٧ – ئیبن قەییمی جوزی ، پزیشکی دڵان ، و : خوبەیب هەورامی ، چ ٢ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٤**

**٨ – ئیبن تەیمیە ، نەخۆشییەکانی دڵ وچارەسەرکردنیان ، و : عباس محمدامین ، چ ١چاپخانەی نارین ، ٢٠١٣**

**٩ – ئیمامی غەزالی ، پوختەی ڕێبازی خواناسان بەرەوبەهەشتی پەروەردگاری جیهانیان ، چ ١ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٧**

**١٠ – ئیمامی غەزالی ، ئەی گەنج ، و : سەلام عەلی شێخانی ، چ٢ ، چاپخانەی ڕۆژهەلأت ، هەولێر ، ٢٠١٧**

**١١ – ئیمامی غەزالی ، ئیمامی غەزالی لەحەوت پەیامدا ، و : عبدالكريم فتاح ، چ١ ، چاپخانەی نوری حەقیقەت ، ٢٠١٦**

**١٢ – ئیمامی غەزالی ، ئافاتەکانی زمان ، و : عوسمان محمدرشید ، چ٤ ، ٢٠١٣**

**١٣ – ئیمامی غەزالی ، کورتەوپوختەی ئیحیاء علوم الدين ، سەعیدکەرەمی ، چ١ ، سنە.**

**١٤ – ئیمام ئەبوحامد محمد غەزالی ، کیمیای بەختەوەری ، و : فەخرەدین ئامێدیان (تورکی).**

**١٥ – ئیمامی غەزالی** ، المقصد الاسنى في شرح أسماء الله الحسنى ، **و : عبدالكريم فتاح ، چ١ ، چاپخانەی هێڤی ، هەولێر ، ٢٠١٦**

**١٦ – ئیمام عبدالفتاح ئیمام ، ئەخلاق وسیاسەت ، و : شەریف عوسمان ، چ١ ، چاپخانەی خانی ، دهۆك.**

**١٧ – ئیمامی غەزالی ، ژیاندنەوەی زانستە ئاینییەکان (احیاء علوم الدين) ، بەرگی یەکەم ، و : شێخ موحسین موفتی ، چ١ ، چاپخانەی ڕۆژهەلأت ، هەولێر ، ٢٠١٦**

**١٨ – ئیمامی غەزالی ، ژیانەوەی زانستە ئاینییەکان ، بەرگی دووەم.**

